محەممەد مەردۆخی کوردستانی

# مێژووی
# کورد و کوردستان




وەرگێڕانی
عەبدول کەریم محەممەد سەعید

میژوویی

---

# میژووی کوردو کوردستان

---

نوسینی: محەمەد مەردۆخی کوردستانی

وەرگێڕانی: عەبدولکەریم محەممەد سەعید

پێداچوونەوەی چاپی یەکەم: ئومێد ئاشنا

چاپی دووەم

٢٠٠٧

## بەناوی خوای گەورە


**پێناسی کتێب**

ناوی کتێب: مێژووی کوردو کوردستان

بابەت:مێژوویی

نوسینی:محەمەد مەردۆخی کوردستانی

وەرگێڕانی: عبدولکریم محمد سەعید

نۆبەتی چاپ : دووەم ٢٠٠٧

شوێنی چاپ : چاپەمەنی هێمن

تیراژ : ١٠٠٠ دانە

نرخ: ٥٠٠٠ دینار

ژمارەی سپاردنی ( ٦٥٦ ) ساڵی ( ٢٠٠٧) ی پێدراوە

پێشکەشە:

- بەوانەی هەرگیز پشت لەنەتەوەکەیان ناکەن

- ئەوانەی بەئازاری نەتەوەکەیانەوە ئەمرن

عەبدولکەریم

## (( پێشەکی چاپی دووەم ))

زۆر لەمێژ بوو دەمویست... کتێبی مێژووی کوردو کوردستان بۆ جاری دووەم چاپ بکەمەوە، چونکە ئەم بەرهەمە ((مێژووی کوردو کوردستان)) یەکێکە لەبەرهەمە دیارو ناوازەکانی (مەردۆخ) کەبەزمانی فارسی نووسی بووی هەرچەند ئەمە ناگاتە ئەوەی (مەردۆخ) نەیتوانی بێ بەکوردی بنوسێ بەڵام وەڵامێك بوو بۆ ئەو بیرە شۆفێنیانەی فارس کەوایان دەر دەخست کورد پاشکۆیەکی تەواوی فارسە... بەزمانێکی زۆر واقیع بینانە ئەو راستیە مێژوو نوسی سەلماند کەکورد وەك میللەت پاشکۆی هیچ میللەتێکی ترنیە و بگرە یەکێکە لەو گەلانەی کەبەدرێژایی مێژوو لەگەڵ گەلانی ناوچەکە بەتایبەتی ((عەرەب.. فارس... تورك)) وا ژیاوون خاوەنی کلتورو زمان و خاك و فەرهەنگی خۆی بووە... وەروونی دەکاتەوە کەزۆرێك لەسەرکردەکانی ئێران کورد بوون لە(ماد)ەکان بوون وەلا بەهۆی نەبوونیقەوارەیەکی سەر بەخۆی کوردی ئەم راستیانە شێواون(کەلێرەدا جێگەی ئەم باسە نابێتەوە و دەکرێ لەهەلێکی تردا زیاتری لەسەر بووترێ)... پاشان پێم خۆشە باس لەوەرگێرانی ئەم نووسینە بکەم بۆسەر زمانی کووردی کەکاتی خۆی خوالێخۆش بوو عبدولکەریم محەمەد سعید پێنجوێنی باوکم... کاتێك ئەم بەرهەمەی بەزمانی فارس خوێندبووەوە وەك بەرهەمێکی دەگمەن وێرای سەرقاڵ بوونی بەکاری سیاسی و خەباتی پێشمەرگانەوە لەساڵی(٩٧٦-٩٩١) توانی وەری بگێرێتە سەر زمانی کوردی و هەرچەندە وەك پرۆژەیەکی دوای ئەم وەرگێرانە لەهەوڵی وەرگێرانی بەرگی دووەمی هەمان بابەت دابوو... بەلام ئەم نووسەرە لەساڵی ١٩٩٢دا دەستێکی رەشی تیرۆر کۆتایی بەژیانی هێناو شەهید بوو... پرۆژەی بەرگی دووەمیش وەستا.

*کورتەیەك لەژیانی وەرگێر:

- عبدلکەریم محەمەد سعید پێنجوێنی ساڵی ١٩٥٣لەبنەماڵەیەکی شاری پێنجوێن لەدلیك بوو.

- خوێندنی ناوەندی تەواو كردووە و بەهۆی كاری سیاسیەوە خوێندنی تەواو نەكردووە.
- لەساڵی(١٩٧٦)ەوە پەیوەندی بەڕێك خستنەكانی (كۆمەڵەی ڕەنج دەرانی كوردستان)كردەوە لەشاری پێنجوێن تاساڵی(١٩٧٩) كاری ڕێك خستنی نهێنی كردووە، دوای ئاشكرا بوونی خەباتی گواستنەوەی لەشارەوە بۆ شاخ و بۆ لێپرسراوی ناوچەی شاربازێڕ.
- لەژیانی پێشمەرگایەتیدا چەندەها كاری دبلۆماسی، ئیداری، مالی، كۆمەلایەتی بەسەركەوتووی بەئەنجام گەیاندوە.
- وەك بەرهەمی تری ئەدەب خاوەنی نامیلكەیەكی دەستنووسە بەناوی (ڕێگا) و هێشتا بەچاپ نەگەیشتوە.
- لەدوای ڕاپەڕینی ١٩٩١چەند كارێكی تری دیبلۆماسی پێ سپێردرا.
- لە ١٩٩٢/٣/١٥ لەشاری سلێمانی شەهید بووە.

ماوەتەوە بڵێم هەمیشە ئەو ووتەیەی لەبیروو مێشكمدا زیندووە كەدەیووت (من ئازاری كەسم نەداوە... بێجگەلە قەڵەمەكەم كەبۆ نووسینەوەی مێژووی گەلەكەم لەنێو پەنجەكانمدا ئازاری زۆری چەشتوە).

درود بۆ گیانی ئەو كەڵە نووسەرە پڕ لەهیواو ئاواتەی نەگەیشتە تروپكی ئارەزووەكانی خۆی كەخزمەت كردن بوو بە(مێژووی كوردو كوردستان)

**توانا عبدالكەریم پێنجوێن.**

# پێشەکی

مێژوو ئەو ئاوێنەیە کەهەموو گەلێ خۆی تیادا دەبینێ و کەڵکوسود لەهەڵەکانی رابردوی وەردەگرێ میللەتە زیندووەکانی جیهان زۆر گرنگیان بەمێژووی خۆیان داوەو زۆر بەباشتی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی بەکەڵك و تێرو تەسەلیان لێ کردوەو پەندیان لەهەڵە گرنگەکانی وەرگرتوە نەبادا ئەو هەڵە کوشندانە دوبارە ببنەوەو زەرەدی مەزن لەگەلەکانیان بکەوێ...

بەڵام ئێمەی کورد نەباسی مێژوەکەمان نوسراوەتەوە و نەسودو پەندمان لێ وەرگرتوە چونکە زۆربەی هەرەزۆری گەلی کورد شارەزایی رابوردو مێژووی خۆی نیە..!

١- لەبەر ئەوەی هەتا ئێستەش مێژووە کەمان بەتەواوی نەنوسراوەتەوە...

٢- ئەوەش کەنوسراوە زۆر هەڵە و بیروڕای چەوتی تیادایە.

٣- هەندێ ناحەزو دوژمن بەدەستی ئەنقەست مێژوە کەمانیان شێواندوە..!

١- ئەگەر مێژووی کۆنمان سەیر بکەین ئەبێت لەنەخشە نوسراوەکانی ئاشور و بابل بگەڕێین و ساغیان بکەینەوە!... ئەوانیش باسی ئەوە دەکەن کەچۆن هاتونەتە کوردستان و ویلایەتی ئێمەیان تالآنێ کردوە! چۆن ژن مانیان چەپاو کردوین...

٢- ئەگەر مێژووی ناوەڕاست بگەڕێی ئەبێت مێژووی ئەو گەلانە بخوێنینەوە کەکوردستانیان دابەش و کۆڵۆن کردوە...

٣- ئەگەر مێژووی تازەو نوێ بگرین ئەبێت راپۆرتی زابتە جاسوسەکانی رۆژئاوا بخوێنینەوە کەهاتونەتە کوردستان.

لەبەر ئەم هۆیانە ئەڵێم مێژووەکەمان لێڵەو پێویستی بەلێکۆڵینەوەو زانستی زیاتر هەیە...!

جێگەی خۆیەتی لێرەدا سڵاو بنێرین بۆگیانی مێژوو نوسە مەزنەکانمان وەك و شەرەف خانی بەتلیسی و مەردۆخ و حوزنی و مەلا جەمیلی رۆژ بەیانی... کەبەرهەمە بەنرخەکانیان بۆتە سەرچاوەو زەخیرەی گەورەی مێژووی نەتەوەی کورد...

هەموو تاکێکی کورد یان زۆربەی خەڵکی کوردستان مێژووی عەرەب و تورك وفارس ئەزانێ لەناو مێژووەکەی ئەواندا هەندێ لاپەرەی شاراوەی مێژوو خۆمان ئەدۆزینەوە بۆیە پێویستە کەدام و دەزگاکانی کوردستان بەتایبەتی زانکۆکان بایەخێکی زیاتر بدەن بەمێژوو نوسینەوەی مێژووی کوردو دراسەکردنێکی زانستی نوێ و کردنەوەی لایەنە شاراوەی ئاینی...!

مێژوو نوسێکی ئینگلیزی ئەڵێت:

ئەگەر ویستت میللەتێ لەسەر نەخشە بسریتەوە مێژووەکەی بسوتێنەو زمانی زکماکی قەدەغە بکە...

هەر چەندە داگیرکەرانی کوردستان ئەمەیان لەگەڵ ئێمە بەکار هێنا بەڵام نەیان توانی بمان سرنەوە...!!

بۆیە من ١٢ساڵ سەرۆکی ئەنستیتوتی بوم لەبەرلین گرنگیم بەدومەسەلەی بنەرەتی دا مێژوو زمان...

وجێگە دەستمان دیارە لەباکوری کوردستان....!

لەکۆتایدا ئەڵێم لەسەر داوای توانای کوری رەحمەتی عبدولکەریم ئەم چەند دێرەم نوسی... هیوادارم چاپی دوهەمی مێژووی کوردوکوردستانی مەردۆخ کتێب خانەی کوردی ئاوەدان بکات!...

**محەمەد ئەمین پێنجوێنی**

# پێشەکی

مێژوو لەیەکێك لەگرنگترین و پڕ ئەزمون ترین بابەتەکانی ژیان. یەکێکیشە لەو بابەتانەی زانستە مرۆڤایەتیەکان کەڕۆڵێکی گەورەی لەتۆماری رووداو بەسەرهات و دیاردەو ململانێی  نێوان (مرۆڤ و دەورووبەرو ژیان) دا بینیوەو گۆڕاوە. هەر ئەوەش وای کرد مرۆڤ زۆر ترین عەشقی بۆی هەبێت، بەڵام عەشقێکی سۆزاوی نازانستیانە، چونکە مرۆڤەکانی سەر ڕوی زەوی حەزیان کردووە زیاتر مێژوو باسیان بکات و پیایاندا هەڵ بدات! مێژووش تائەو ئاستەی سۆزو خۆشەویستی بەسەردا زاڵ بووبێت لەباسکردن و پیاهەڵدا  درێغی نەکردووە، ئەگەر زانستیانەش نوسرابێتەوە، رەحمی بەکەس نەکردوەو رووداو و بەسەر هات و دیاردەکانی وەك خۆی تۆمار کردووە.

بەوەش کورد واتەنی "قسەی حەق رەقە" مێژووش بەزانستی نوسینی رەق بووە...بۆ تۆماری هەموو ئەو روداوو بەسەر هاتانەی مێژووش چەندین کەسایەتی و زاناو بیر مەندو نوسەرو سۆزو خۆشەویستی بەسەریاندا زاڵ بوە، بوونەتە نوسەری مێژوو هەوڵی نوسینەوەیان داوە، ئەوانەی زانستیانە کاریان کردوە، بونەتە ((مێژوو نووس))، ئەوانەش سۆزو خۆشەویستی بەسەریاندا زاڵ بوە، بونەتە ((نوسەری مێژوو)). بەمەش مێژوو لەبێکەسی رزگاری بوە، هەروەك خۆی نەیتوانیوە بێ مرۆڤ بژی.

لێرەوە لەنێو ئەوانەی خەمی رووداوەکانی مێژوو وەرابردوو نەتەوەکەیان خواردوە،((شێخ محەمەدی مەردۆخی کوردستانی))یە. ئەو کەسایەتیەی لەنێوان ساڵانی(١٨٧٨-١٩٧٥ز)ژیا، بەڵام بەبەرهەمەکانی، جیهانی نەمری بۆخۆی چڕی. یەکێکیش لەوبەرهەمانەی نەمری بۆ دروست کرد(مێژووی کوردو کوردستان)ە.

(مێژووی کوردو کوردستان)یەکێکە لەشاکارە بەرزەکانی ئەو زانایەی کورد. یەکێکیشە لەو(١٢٥) بەرهەمەی،. زۆر ترین ناوی بۆخۆی پێ پەیدا کردووە، چونکە سیمای کورد بوونی پێ نیشانداوە.

شێخ محەمەدی مەردۆخ... بەشێکی مێژووە گەورەکەی کوردو کوردستانی لەو بەرهەمەدا کۆ کردەوە واتا توانی (٥٪) رووداوەکانی مێژووی کورد بخاتە نێو

بەرهەمێکەوە کەهەموو کورد و کوردستان بگرێتەوە. بەمەبەستی گەیاندنی زانیاریەکانی نێو ئەم بەرهەمەش بەهاونەتەوەو هاونیشتمانیەکانی خوالێخۆش بوو ((عەبدولکەریم محەمەد سەعید)) ئەرکی وەرگێڕانی بۆ زمانی کوردی کێشاو چاپ و بلاوی کردەوەئەوەش دوای ئەوەی خوالێخۆش بوو ((ئومێد ئاشنا)) ئەرکی پێداچوونەوەی وەرگێڕدراوە کوردیەکەی گرتە ئەستۆ. بەو کارەش خزمەتێکی گەورەی بەکوردوو بەکتێبخانەی هەژاری کوردی کرا.

کاتێکیش کاکە ((توانا)) کوڕی خوالێخۆش بوو ((عەبدولکەریم محەمەد سەعید)) وەك وەفاداریەك بۆباوکی بۆ ئەو زانا ئاینیانەی کورد بڕیاری لەچاپدانەوەی ئەو بەرهەمەی دا، رووی ئەوەی لێنام پێشەکیەك بۆ چاپی دووەم بنوسم، منیش لەبەر دوو هۆ ناچر بووم بدەنگ داواکەوە بچم:

یەکەم/ بەهۆی خۆشەویستی بۆکاکە تواناو ئەندامانی بنەماڵەکەی و کارەکەی باوکی خوالێخۆش بووی.

دووەم/ خۆشەویستی بۆ ئەو زانا ئاینیەی کورد کە خەمی نەتەوەکەی و رابردووی خواردوە.

لەبەر رۆشنایی ئەو راستیانە بڕیاری نووسینی ئەم پێشەکیەم دا، بەهیوای ئەوەم، کاتێك چاپی دووەمی ئەن بەرهەمە دەگاتە بەر دەستی خوێنەواری کورد و ئەوانەی زمانی کوردی دەزانن، بەخۆشەویستیەوە لێی بڕوانن. بەوڕاستیەش ئاسنابن کە تۆمارە مێژووییەکانی ئەم کەسایەتیەی کورد زۆر وردو زانستی نین، بەلأم کەم بایەخیش نین.

بەهیوای سودگەیاندن بۆ ئەو نەتەوەیەی دەیەوێت"ئایندەی روون بێت، بەلأم لەمانای روونی...و.. ئاینده... نازانێت

لەگەڵ خۆشەویستیم بۆ خوێنەران.

کەیوان ئازاد ئەنوەر

مامۆستای مێژوو لە زانکۆی سلێمانی

٢٠٠٧ /١/١

## پێشەکی-

لە ناوەڕاستی ساڵی (١٩٧٥) مامۆستایەکی ئاشنام لە ناوچەی مەریوانەوە مێژووی کوردو کوردستانی شێخ محمەدی مەردۆخ-ی بە دیاری بۆ ناردم.

جارێك بەرگی یەکەمی کتێبەکەم خوێندەوە، جاری دووەم دەستم کردە وەرگێڕانی لە فارسیەوە بۆ کوردی. ئەو هۆیانەی دام بۆ ئەم کارە ئەمانە بوون:-

١. ئەدەبی کوردی زۆر دەوڵەمەند نییە لەو زانیارییە مێژووییانەی چ نووسەرانی خۆمان و چ بیانی لەسەری نووسیبن.

٢. نووسەری ئەم کتێبە مێژووییە ئەو درۆو دەلەسانەی بەرپەرچ داوەتەوەو چ لە روی نەزانی یا بە ئەنقەست دراونەتە پاڵ کورد،وە رووی راستیان ئاشکرا ئەکات.

٣. نووسەر مێژووی نووسیوە بە شان وباهوی کەسدا نەهاتۆتە خوارەوە هەر شتەی بە ترازووی خۆی کێشاوە.

٤.نووسەر خزمەتێکی گەورەی بە کوردو ئیسلام کردووە ،زیاتر لە (١١٥) بەرهەمی هەیە (جگە لە چەند

بڵاوکراوەی ئاینی ). دەربارەی مێژوو زمان و ئەدەبی کوردیو ئیسلام بە گشتی .

لە گەڵ ئەوەشدا زۆر ناسراو نییە بەتایبەتی لە کوردستانی عێراقدا.

بۆیە بە پێوستم زانی ئەم بەرهەمە بەنرخەی بکەمە کوردی کەلە توێی (٩٠٠) لاپەڕەو لە دوو بەرگدایە.

بەرگی یەکەمی کە بریتی‌یە لەم کتێبە، باسی مێژووی کوردو کوردستان ئەکات لەسەرەتای مێژوووەوە تا

سەردەمی هاتنی ئاینی ئیسلام.وەبەرگی دووەمی جارێ واز لێبێنم بۆ دەرفەتێکی تر.

ئەوەندەی توانیبێتم مەبەست و ناوەرۆکی باسەکەم وەك خۆی وەرگێڕاوە حەزم نەکردووە پێچ و پەنای تێ بخەم .

لەوانەیە لە هەندێ شوێندا درێژەم بە باسەکە نەدابێ بەڵام پوختەی باسەکەم نووسیوە.[1]
نووسەر باسەکانی لە چەندین سەرچاوەی گرنگ و دێرینەوە وەرگرتووە وەك خۆی پەنجەی بۆ راکێشاوە .
لە گەڵ نووسینەکەدا بیری تیژی بەکارهێناوە بۆ یەکالاّ کردنەوەی راستیو ناراستی .ئنجا بە کورتی با بزانین شێخ محمەد مەردۆخی کوردستانی کێیە؟
ئەمیر محمەد باپیرە گەورەی بنەماڵەی مەردۆخ کەلە هەوراماندا بە بابا مەردۆخ ناودار بووە لە وولاتی شامەوە روەو هەورامان لەگەڵ چەند کەس لە دوست و خزمانی ئەکەوێتە رێ بۆ پەرە پێدان و چەسپاندنی ئایینی ئیسلام، لە سەردەمی شێخ حەسەنی جەلائیری سالی (٧٧٥) ی کۆچی . وەلە جێگەیەکدا کە ئێستاش بە دەشتی- شامیان- بە ناوبانگە خێوەت هەڵ ئەدەن و ئەمێننەوە ،لە پاشدا ئاوایی –دگاشێخان- ئاوا ئەکەنەوەو بە تەواوی لێی نیشتەجێ ئەبن .شێخ محمەد کوری شێخ عبدالمؤمن ئیمام و خەتیبی شاری سنە بووە.سالی (١٨٧٨ )ی زاینی لەشاری سنە هاتۆتە دنیاوە .
کاتێ محمەد تەمەنی دوو ساڵ ئەبێت سالی (١٨٨٠) باوکی نامەیەك بۆ ناصرالدین ش بەم شێوەیە ئەنووسێ،
﴿لە دوا تەمەنی ژیانمدا خوا کورێکی پێ بەخشیوم بە پێی یاسای ئەستێرە ناسی تەمەنێکی درێژی ئەبێت و پلەو پایەی لە ناو کۆمەڵدا بەرز ئەبێت .هیوام وایە پاش خۆم محمەد ببێتە جێگاداری بنەماڵەی مەردۆخ.[2]

[1]-بەرێز مامۆستا محەمەدا فیدا سالی (١٩٥٨) ئەم کتێبەی بە کورتی لە دوو بەرگدا لە چاپخانەی سەرکەوتن لە بەغدا چاپ کردووە.
[2]-مەردۆخ لە بنەڕەتا ووشەیەکی ئاشوورییە .((مەر–دۆخ)). مەر بە واتای ئاوێنە یا کوڕ یا وێنە دێت . دۆخ بە واتای زات یا خودی خوا کە دروست کەری نییە . مەردۆخ کوڕی خوا یا خودی خوا یا وێنەی خوا یا –اية الله– یە–بڕوانە کتێبی– ئەشعیا –- ل ٣٩. کتێبی دووەم ملك ل ٢٠ . مروج الذهب ل ٦٥ بابلی و فارسەکان ووشەی مەردۆخیان بۆ بتەکانیان بەکارهێناوە . ووشەکە بوە بە باو تا وای لێ هات بە فەرمانڕەواو دەسەڵات دارو پیاوە ئاینیەکانیان ئەوت مەردۆخ . بە کورتی ئەتوانین بڵێین مەردۆخ یانی زانایەکی ئاینی خاوەن پلەو پایە لەناو کۆمەڵدا.

و کاروباری ئاینی شاری پێ بسپێرێ». ناصرالدین شا داواکەی پەسەند ئەکات و فەرمانی شاهانەی بۆ دەرئەچێت . بەڵێ ، قسەکەی باوکی هاتە دی و (٩٧) ساڵ ژیا . پلەو پایەی لە ناو کۆمەڵدا بەرز بوو . ئەم پیاوە مەزنە هەموو ژیانی بە خوێندنەوەو نووسین بەسەر بردوە. هەمیشە ویستویەتی خزمەت بە کوردو ئیسلام بکات (١١٥) کتێبی لە بەرهەم و دەست نووسی خۆی بەجێ هێشتووین . لەوانە ئەم مێژوومیە کە بۆ جاری دووەم لە ساڵی (١٩٧٥) لە شاری سنە لە چاپ درایەوە . وە بە نۆفسێت هەر لەوێ بۆ سێەمین جار چاپکرایەوە .

شێخ محمەد مەردۆخی کوردستانی (سنەیی) لە تەمەنی (٧) ساڵیدا لای باوکی سەرەتای خوێندنی دەست پێ کردو قواعد .صرف ونحو ،منطق ،حساب و هندسە-ی تەواو کردووە .لە پاشدا تصریفی زنجانی و نصاب و فرج و سونەت و کلیلە دمنەی لای مەلا شێخ عبدالرحمن ی مامەی تەواو کردوە ئەمجا چۆتە لای مودەریسی شاری سنە (شێخ محمودی لۆی)و درێژەی بە خوێندن داوە پاش ماوەیەك بە هۆی زیرەکیو شارەزاییەوە بەبێ ماموستا دەرسەکانی تەواو ئەکات و راپۆرتێك بۆ شێخ محمود ئەنووسێ و ئەویش بروانامەی مەلایەتی ئەداتێ.

نووسەر پیاوێکی زۆر زیرەك و شارەزاو ئازا بووە . گەلێ نهێنی لە سەراپای ژیانیدا هەیە . بە پێی توانا لە دەرفەتێکدا باسیان ئەکەین. لە (٢١)ی شەهریوەری (١٣٥٤) ی هەتاوی بەرامبەر بە ساڵی (١٩٧٥) ی زاینی لە شاری
سنە کۆچی ماڵئاوایی کرد لە دێی «ئەوەرە» بە خاك سپێردرا.

عەبدول کەریمی محمەدی سەعید

١٩٧٩/١٢/٢٧

پێنجوێن

## سـەرەتا

﴿بەناوی خوای گەورە﴾

پەیکەری ئادەمیزاد وەکو هەموو گیانلەبەرانی تر بریتی‌یە لە گیان و تەن ، گیان لە تەنی مرۆڤدا بێت ، هەر پێنج هەستەکە کاری خۆیان ئەکەن . (بینین ، بیستن ، چەش ، بۆن ، لێك خستن ) . بەهۆی ئەمانەیەوە هەموو شتێك لە دەورو بەرماندا بە شێوەیەکی فۆتۆگرافی لە دەماغدا وێنە ئەگیرێ و بە هۆیانەوە بیرکردنەوەو خەیاڵ دروست ئەبێت. هەر کاتێ گیان لە قەڵای لەش دەرباز بوو ، ئەو کاتەش مێشك وەکوو هەموو ئەندامەکانی تر ووشك ئەبێتەوەو ئەپوێ . هەرچی بوون و ئەبونێك بوو‌بێت لە گەڵیا نامێنێت . وا چاکترە تا گیان لە دەست ئەچووەو هەموو هەست و ئارەزوویەك لە خاکا ئەڕزێوە ، ئەوەی ئەبێتە هۆی بەختەوەری مرۆڤ بخرێتە سەر ڕووی کاغەزو بنووسرێت تا ئەوەکانی پاشەڕۆژ سوودی لێ وەرگرن.

مەبەستی مرۆڤ لەدۆزینەوەی نووسین و خوێندنەوە تەنها لەبەر ئەوە بووە کە کردارو هەڵس وکەوتیان بنووسرێت وبۆ هەمیشە بمێنێتەوە. تاوەکو کۆمەڵی ئادەمیزاد کەڵك لە چاکەو خراپەی وەرگرن لە هەر هونەرێك کتێب و نامیلکەیەکم نووسیوەو بڵاوەکردۆتەوە ویستم لە هونەری مێژوویشدا چەند شتێك لە ڕابردوو بێنمەوە یادتان بەهۆی ئەوەوە خۆم یەکێکم لە دانیشتوانی کوردستان و زۆر پەیوەندیم لە گەڵیا بەهێزە . هەرچەندە مێژووی کوردو کوردستان هێشتا هەر سەرەتایەکی وەك پێویست لەسەری ئەنووسراوە و بەتەواوی ڕوون ئەکراوەتەوە.

هیوادارم بەهۆی دڵسۆزان و ڕۆشنبیرانەوە وردە وردە پەرە بسێنێ وبگاتە ئە نجام.

( مەردۆخ )

## ناوچە کورد نشینەکان

-أ-

ئەبوو جسرە لە دەروو بەری شاری خانەقین -ە لە نێوان خالص وبەعقوبەدا

ئەدیابن ناوچەکانی دهۆك ، زاخۆ ، ئاکرێ

ئازەربایجان ژووروی رۆژهەلاتی کوردستان

ئارارات ئاگری داخ یا چیای جوودی

ئارباخا کەرکووك

ئارات ئالانی شیروان ودەربەند

ئەربیل هەولێر لەبەشی ولایەتی موسڵی جاران

ئەردەبیل ئەکەوێتە بەشی ئازەربایجانەوە

ئەردەهان لە تورکیا نزیك بە -قارس-

ئەرز رۆم ئەکەوێتە ژووروی رۆژهەلاتی کوردستانی تورکیا کە بەشێك لە فوراتی تیا هەڵئەقوڵێ. ئەکەوێتە خوارووی ریزە چیای کاردۆشی

ئەرزەنجان ئەکەوێتە ناوچەی ئەرزرۆم لە نزیك روباری فورات

ئەرمەنیە ئەرمەنستان لە کەناری ریزە چیاکانی ئارارات-دایە لە بەشی سۆڤیەت

ئورمیە ورمێ – رەزائیە – ئەکەوێتە بەشی ئازەربایجان رۆژئاواوە

ئاسپاهان ئەصفەهان ئەکەوێتە سەروی لورستانەوە بەلای رۆژهەلاتی باشوری تارانا

ئەسکەندەرونە ئەکەوێتە بەشی ژووروی رۆژ هەلاتی دەریای ناوەراستەوە

ئاشنۆ ئەشنەویە ، شنۆ ، ئەکەوێتە بەشی ئازەربایجان رۆژ ئاوا لە سەرووی شاری لاجان

ئاق شەهر ئەکەوێتە رۆژئاوای ئاسیای بچووك . شارێکی کوردستانی تورکیایە

ئاگری ئەکەوێتە ناوچەی رۆژئاوای رەواندوز . ئاکرێ – عەقرە لە بادینانە

ئاگین (ئاجین) لە سەرووی عەرەبگیرە لە بەشی (معمورە العزیز)

الیغور هێڵی سنوری کلیکیە

الجزیرە دیار مضر – رقە ، دیاربەکر – ئامود –دیار ربیعە – موسڵ

| | |
|---|---|
| ئالشگرد | سەربە دیاربەکر-ە لە تورکیا |
| ئالشتر | ئالیشتر ئەکەوێتە ناوچەی لوڕستان |
| ئامانۆس | نزیکە لە ڕوباری هالیسەوە - لە کوردستانی تورکیا- |
| ئامود | ئامێد - بریتی‌یە لە دیاربەکری ئێستا |
| ئەناتۆڵی | ئەنادۆڵ ، ئناچول لە کوردستانی تورکیایە بەشی ئاسیای بچوك |
| ئۆرامان | هەورامان دوو بەشە بەشی کوردستانی عێراق و کوردستانی ئێران |
| ئۆرفە | ئەکەوێتە نێوان هەردوو ڕوباری دیجلەو فورات لە خاکی تورکیا واتا- ڕەهای کۆن |

-ب-

| | |
|---|---|
| باب الاکراد | قەڵای بەرزعە لە رۆژهەڵاتی تەفلیس ( گورجستان ) |
| باتە | باگە ئەکەوێتە ناوچەی هەکاری |
| باڵەك | ڕەواندوز |
| باڵەکان | باڵەکایەتی ئەکەوێتە ناوچەی ڕەواندوز |
| بالیان | سەر بە ویلایەتی موسڵ-ە |
| بانە | شارێکی خنجیلانەیە لە بەشی سنەدا |
| بانی خێلآن | لە ناوچەی سلێمانی دایە لە نزیك دەربەندی خان |
| بایە زید | ئەکەوێتە ناوچەی ئەرز ڕۆم لە خوارووی ئارارات |
| بایلاکات | لە تورکیایە |
| بەتلیس | ئەکەوێتە بەشی خواروی ئەرمنستان لە کوردستانی تورکیایە |
| بنجنورد | بەشی خوراسانی فارسە لە ڕۆژئاوانی شیروان |
| برانیە | ناوچەی بەرانایەتیە |
| بەرزەعە | قەڵای بەرزەعە ئەکەوێتە رۆژهەڵاتی تەفلیسەوە( باب الاکراد ) |
| بروجەرد | وەریگرد ( وەروگرد ) پایتەختی لوڕستانە |
| بەسفاد | ئەکەوێتە بەشی ئازەربایجان |
| بەندەر عەباس | یەکێکە لە بەندەرە گرنگەکانی کەنداوی عەرەب لە بەشی فارس |

| | |
|---|---|
| بۆتان | بهتان . له بەشی کوردستانی تورکیا ولاتی جزیریان له سوریایه |
| بلوجستان.[٤] | خوارووی رۆژهه‌لاتی ئێران و سه‌رووی پاکستان و تا پێنج ئاوی سه‌روو هندستان |
| بۆی ئاباد | ئه‌که‌وێته به‌شی ئه‌رز رۆم |
| به‌هسنی | له به‌شی معموره العزیزیه‌دایه –ئاکمیل – |
| بیره‌جك | له به‌شه‌ی بتلیسه |
| بیلوار | ئه‌که‌وێته خوارووی شاری سنه‌وه |

-پ-

| | |
|---|---|
| پشتکوه | ئه‌که‌وێته به‌شی خواروی لورستان خۆرئاوای لورستان تا ولاتی فه‌یلی |
| پێشکۆه | ئه‌که‌وێته ژووروی خۆر هه‌لاتی لورستان تا ولاتی فارس |
| پشدەر | ئه‌که‌وێته به‌شی سلێمانی |

-ت-

| | |
|---|---|
| تارم | -گارم- سه‌ر به ئوستانی زەنگانه ( زه‌نجان –ئێران ) |
| تاوق | -گاوق- تاوغ. کفری بووه له نێوان که‌رکوك و دوز خورماتوو |
| ته‌به‌رستان | -گبرستان- مازه‌ندەران |
| ته‌رموك | ئه‌که‌وێته نێوان هه‌کاری و مکس |
| ته‌رهان | گرهان- ئه‌که‌وێته ناوچه‌ی پێشتکۆی لورستان |
| ته‌فلیس | ئه‌که‌وێته ژوروی ئه‌رمه‌نستان له ولاتی سۆڤیه‌ت پایته‌ختی- گورجستان- |
| تۆرعابدین | -گور بدین- سه‌ر به دیاربه‌کره |
| تۆرۆس | کۆمه‌له شاخێکه له نێوان ئاسیای بچوکدا. |

---

[٤] -ناوچه‌یه‌کی فراوانه له خواروی ڕۆژهه‌لاتی ئێران به‌شێکی سه‌ربه پاکستانه به‌شێکی سه‌ربه ئێرانه ئه‌که‌وێته نزیك ولاتی ئه‌فغانستان . گه‌لێ بلوجی تیا ئه‌ژی وسوونی مه‌زهه‌بن . ئه‌م گه‌له ماف زه‌وت کراون، ئه‌و کوردانه‌ی له‌وێ ئه‌ژین به(هۆزی براخۆ) ناو ئه‌برێن. –وه‌رگێڕ–

-ج-

| | |
|---|---|
| جبال | جبال الاكراد -شاخەكانی نێوان كوردستانی رۆژهەلآت و رۆژ ئاوایە تا سنوری تەكفور |
| جبل جنجرين | ڕیزە چیایەكە بەسەر شنۆدا ئەڕوانێ |
| جزيره | جزیرەی ابن عومەر-ە |
| جوانرۆ | ئەكەوێتە ناوچەی سنە |
| جۆلە مەرگ | مەركەزی ناوچەی هەگاری یەو ئەكەوێتە بەشی وان. چۆلە مێرگ |
| جلولاء | قەرەخان |

-چ-

| | |
|---|---|
| چەمچەماڵ | دوو چەمچەماڵ هەیە . یەكێكیان لە نێوان كەركوك وسلێمانی وئەوی تریان لە نێوان كرماشان و هەمەداندایە -وەرگێر- |
| چەمشگزگ | ولآتی دەرسیم لە كوردستانی توركیا |

-ح-

| | |
|---|---|
| حارم | ئەكەوێتە ڕۆژهەلآتی دەریای سپی ناوەندەوە |
| حەران | ئەكەوێتە بەشی حەلەب |
| حەرير | دەشتی حەریر لە نێوان هەولێر و ڕەواندوز |
| حسن الأكراد | لە ولآتی سوریادا . جێگەیەكە لە شاری دیمەشقی شام |
| حەكاری | هەكاری . ناوچەیەكی فراوانە لە كوردستانی توركیا |
| حەلەب | ئەكەوێتە ولآتی سوریا |
| حەلوان | لە نێوان قەسری شیرین و كرندایە یانی سەر پێلی زەهاوی ئێستا پێرینا لە كتێبی ئێرانی قەدیم لاپەڕە ( ٢ ) ئەڵێ حەلوان قەلآیەك بوە لە نزیك شاری كەركوك |

حوێزە | لە بەشی خوزستانە – عەرەبستان –خوارووی ڕووباری کەرخە
---|---

-خ-

| | |
|---|---|
| خاپور | ڕووباری خاپوور یا فیشخابور لە نزیك شاری زاخۆ |
| خەلەکان | ئەکەوێتە ناوچەی پشدەر |
| خانەقین | یەکێکە لە ناوچە دەوڵەمەندەکانی کوردستان لە سەر سنوری ئێران |
| خاوە | ئەکەوێتە بەشی پیشکۆ لە نێوان ئەهاوەندو ئالیشتردا |
| خاو | لە بەشی لوڕستاندایە |
| خراسان | خۆراسان ، خۆرستان خاوەرستان . شارو ناوچەیەکی فراوانی ئێرانە |
| خەرپوت | ئەکەوێتە بەشی معموره العزیزیەوە |
| خوڕەم ئاباد | مەرکەزی لوڕستانە |
| خەفتیان | ئەکەوێتە ناوچەی ڕەواندوز (( هەودیان )) |
| خەنس | سەربە دیار بەکر-ە |
| خۆشاب | شارو قەلایەکی کوردستانی تورکیایە |
| خۆی | ئەکەوێتە بەشی ئازەربایجانی ڕۆژهەلات |
| خێلاَن | خەلاَ سەر بە بتلیسە لە کوردستانی تورکیە نزیك دەریاچەی وان |

-د-

| | |
|---|---|
| دارا ئاباد | سەربە شیرازە –شوانکارە – |
| دار بگرد | سەر بە شیرازە-شوانکارە- |
| دانترگ | لە نزیك شاری ئەهاوەند بووە . دەڵێن تەك نێوانی کرندو کرماشان |
| دەربەندی قەراتر | ئەکەوێتە ناوچەی ئازەربایجان دەربەند قەرەبۆلی ناوی دەربەندیخان بووە لە سەردەمی سەلجوق و مەغۆل دا |
| دەرە تەنگ | نێوانی کرماشان و حەلوان –زەهاو- |
| دەرگەزێن | در جزێن ئەکەوێتە ناوچەی هەمەدان |
| دزفول | ئەکەوێتە سەر ڕووباری ( ئابدیز ) لە خوزستان –دزپل – پردی قەلاَ |

| | |
|---|---|
| دقوق الناقە | شاری داقوق –داوق- |
| دلفان | دلۆڤان ئەکەوێتە بەشی پێشکۆی لوڕستان |
| دهۆك | پارێزگایەکی ناوچەی کوردستانی عێراقە |
| دیار بەکر | شارێکی گەورەی کورستانی تورکیایە |
| دیاوشت | ناوی چیایەکە لە ڕیزە چیاکانی –جبال الاکراد - |
| دێرسیم | یەکێکە لە هەرێمەکانی کوردستانی تورکیا |
| دیلمان | لای ڕەواندز بوو |
| دیلەستان | وڵاتی دەیلەم –گەیلان- |
| دنیار | لای کرماشان |
| دینەوەر | ئەکەوێتە سەروی رۆژهەلاتی کرماشان |

-ر-

| | |
|---|---|
| رامان | رامان فارس – ئەمانە پێنج شار بوون لە وڵاتی فارس پێنج هەرێمی عێلەکانی شوانکارە بوون کە فەرمانڕەواییان تیا هەبوو |
| رانیە | ئەکەوێتە ناوچەی پشدەر |
| رستاق | ئەکەوێتە خواروی شەمدینان |
| ڕەواندوز | ئەکەوێتە ناوچەی هەولێرو پیتەختی میرنشینی سۆران |
| ڕەوانسەر | لە ناوچەی سنەدایە |
| ڕوبار | ڕوباری قەزوین |
| ڕوو کەشکان | لە پێشکوی لوڕستانە |

-ز-

| | |
|---|---|
| زێی گەورە | زاب الأعلی – ئەڕژێتە دجلەوە لە چیاکانی کوردستانی تورکیاوە دێتە خوارێ |
| زێی بچوك | زاب الصغیر ئەڕژێتە دجلەوە لە چیاکانی کوردستانی تورکیاوە دێتە |

خواریْ

زازا ولاتی دونبولیەکان لە تورکیا

زاخو ئەکەوێتە بەشی ویلایەتی موسڵ ئێستا سەربە دهۆك-ە

زمردەلاَن یەکێکە لە چیاکانی سەربە شاهۆ -زاگرۆس-

زمردکۆ یانی کێوی زمرد ئەکەوێتە ناوچەی بەختیاریەوە

زەنگەزور لە بەشی کۆماری ئەرمەنستانی سۆڤیەتە

زۆزان لە نێوان موسڵ و خێلات وسەلمس دایە بە واتە هاوینە هەوارو لە
کوردستانی تورکیەشدایە

زەهاب زەهاو لە ناوچەی کرماشاندایە

زیمری ناوی کۆنی هەرێمی ئەزیری سلێمانیە

-س-

ساوجبلاغ سابلاغ – مهاباد –مەه ئاباد ئەکەوێتە بەشی ئازەربایجانی ڕۆژئاوا
– صاو جوبلاغ-

سەجستان سیستان . ئەکەوێتە ڕۆژهەلاَتی ئێران لە نزیك ولاَتی ئەفغانەوە
هەندیْ لە هۆزە کوردەکان لەو
ناوچانەدا ئەژین هەوارگەی بلوچەکانە
-وەرگێر-

سەخمە لە ئەنسکلوپیدیادا – ئەجما نوسراوە

سراب مراد ئەکەوێتە ڕۆژئاوای موش لە بەشی بەتلیس لە دمراوی – مراد – ی
بەشێکی فورات

سەردەشت ئەکەوێتە ڕۆژئاوای سابلاَغ-

سەعرد لە ناوچەی دیار بەکر -دایە

سەلماس ئەکەوێتە ناوچەی ئازەربایجانی ڕۆژ ئاوا

سولێمانی ئەکەوێتە بەشی ویلایەتی موسلی جاران . پایتەختی بابانەکان بووە
کە خۆیان دروستیان
کردوە ئێستا ناوچەی نوستانە

سەمنان	ئەکەوێتە ناوچەی خۆراسان

سنجار	ئەکەوێتە ویلایەتی موسڵ

سند	ئەکەوێتە ولاّتی هیندوستان

سونگور	سونقر و کولیایی لە ناوچەی کرماشاندایە

سنە	سنەدژیا کوردستان شەش سەد ساڵ پایتەختی میرنشینەکانی ئەردەلاّن بووە

سورداش	نزیک شاری سلێمانییەو ئەکەوێتە بناری پیرەمەگرون

سورە بەرد	سوهرەوەرد لە دێ هاتەکان ناوچەی زنجانە

سووریا	ئەکەوێتە رۆژهەلاّتی دەریای ناوەڕاست . هەرێمێکی مەزنی چەندین شارو شارۆچکەیە

سیرتی	بەمانای کوردی ئێران دێت چونکە -کورتی - بە مانای کوردی میدیا دێت

-ش-

شاتان	شارۆچکەیەکە لە نزیک دیار بەکر

شارباژێڕ	ئەکەوێتە ناوچەی شارەزوور و سیومیلەوە

شام	بریتی یە لە سوریا ،لوبنان ، فەلەستین

شەرەفخانە	ئەکەوێتە ژوروی گۆمی ورمێ وە

شەرناق	یەکێکە لەشارەکانی سەربە دیار بەکر

شوعلاباد	گوایە- شەقلاّوا بێت- لە صبح الأعشى دا نووسراوە

شەقلاّوا	شەقڵ ئاوا ، شوعلاوا ، ئەکەوێتە ناوچەی خۆشناوەتی

شوشتر	ئەکەوێتە ناوچەی خوزستان . عەرەب ناویان ناوە شوش ، تستر

شارەبان	ئەکەوێتە ناوچەی بەعقوبە

شەرزور	شارەزور دەشتێکی بە پیت و بەرەکەتە لە سەرەتادا ولایەت بوو

شێخان	ئەکەوێتە ناوچەی قۆرەتو نزیک هۆزێن جگە لە شێخان ی یەزیدیەکانی هەرێمی موسڵ

شیراز	ولاّتی فارسە لە خواروی رۆژهەلاّتی ئێران

-گ-

| | |
|---|---|
| گبرستان | تەبەرستان -مازندەران - |
| گورعابدین | تۆرعابدین ی تورکیا |

-ع-

| | |
|---|---|
| عیراق | بین النهرین -عیراقی عەرەب • میسوپوتامیا |
| عەقرە | جاران سەربە ویلایەتی موسڵ بووە لە هەرێمی بادینانە . ئاکرێ |
| عەمادیە | جاران سەربە ویلایەتی موسڵ بوە لە هەرێمی بادینانە |

-ف-

| | |
|---|---|
| فارس | پارس ولاتی فارس یا ولاتی عەجەم |
| فراهان | ئەکەوێتە بەشی سوڵتان ئاوا -چەمچەماڵی کۆنی سەر بە کرماشان |

-ق-

| | |
|---|---|
| قارس | یەکێکە لە ولاتەکانی کوردو ئەرمەنی -بەشی باکوری تورکیا |
| قازانیە | ئەکەوێتە ناوچەی مەندەلیەوە |
| قراچەداغ | لە بەشی ئازەربایجاندایە |
| قەرەشار | لە نزیك روباری هالیسە قزل ئیرماق |
| قەرەتەپە | یەکێکە لە ناوچەکانی سەربە قەزای کفری |
| قەرەحەسەن | سەربە پارێزگای کەرکوکە |
| قەرەحەسار | ئەکەوێتە ناوچەی گرابزۆن |
| قزل ئیرماق | روباری هالیس لە تورکیایە |
| قزل رباگ | خوسرەو ئاباد . سەعدیە |
| قەسری شیرین | ئەکەوێتە بەشی زەهاوی سەربە کرماشان |
| قەلا شاینی | ئەکەوێتە رۆژئاوای پاتاق لە ناوچەی کرند . قلعە شاهین |
| قەلای هارون | ئەکەوێتە نزیك جولە مەرگ - چۆلە مێرگ |
| قەمەرانیە | لە تورکیایە |
| قۆچ حەسار | لە تورکیایە |

| | |
|---|---|
| قۆرمتو | ناوی ناوچەیەکە سەربە خانەقین |
| قەهرار | لە ناوچەی فراهان –دایە |
| قەیسەری | قیصریە ئەکەوێتە کەناری ڕوباری قزل ئیرماق لە تورکیا . قەڵاو شارو ناوچەیە |

-ك-

| | |
|---|---|
| کارتادیە | نزیکە لە زێ ی بچوکەوە لە تورکیا |
| کاریان | لە نزیکی کرمانەوە بووە |
| کالینی | لە ناوچەی ئازەربایجاندایە |
| کردوین | شارێك بوە لە سەر ڕوباری ئاراس – کتاب مقدس ل ٢٢٧٤ |
| کرکار | شارو قەڵاو ناوچەیەکە لە کوردستانی تورکیا –گەرگەری |
| کرمانشاە | کرماشان |
| کەرکوك | ئارباخان ی کۆن ئەمڕۆ گەورەترین شاری هەرێمی کوردستانە |
| کرمان | ئەکەوێتە خواروی بیابانی لوت |
| کرند | ئەکەوێتە ڕۆژئاوای شاری کرماشان |
| کری | ڕوباری فورات لە بەشی تەفلیس |
| کفری | سەربە پارێزگای کەرکوکە لە ڕۆژهەڵاتی دشتی گەرمیان |
| کەلات | مەڵبەندی بلوجستانە |
| کولیایی | لە سەروی ڕۆژهەڵاتی کرماشاندایە |
| کورتی | بەمانای کوردی میدیا دێت |
| کودی | جودی شاخێکە لە ڕیزە شاخەکانی ئارارات |
| کێوی زاگرۆس | ڕیزە شاخێکە لە نێوان کوردستانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لە ئاراراتەوە دست پێ ئەکات و لە وڵاتی فارس کۆتایی دێت هیرۆدس بە زاگری کوردی ناوی بردوە |
| کۆیە | کۆیسنجاق نزیکە لە شاری هەولێرەوە |
| کهف داود | ئەشکەوتی داود لە هەورامان –ە |

-گ-

| | |
|---|---|
| گورجستان | ولأتی جۆرجیای سۆڤیەتی |
| گردیان | ئەکەوێتە ڕۆژئاوای سەلماس |
| گوڵپایگان | ئەکەوێتە بەشی ئەسفەهان |
| گیلان | پایتەختی ولأتی دمیلەمە گیلانی لوڕستان سەربە ولأتی دمیلەمە |

-ل-

| | |
|---|---|
| لاوئیلجان | ئەکەوێتە نێوان شیرازو کەنداوی عەرەبەوە |
| لایجان | یا لاجان ئەکەوێتە خواروی شاری شنۆ لە ئازەربایجانی ڕۆژئاوا |
| لاجانی گێلان | لە ناوچەی گیلانی سەربە بەحری خەزەر لە نێوانی دمیلەمان وسفیدرودایە |

-م-

| | |
|---|---|
| مادین | ئەکەوێتە کوردستانی بەشی تورکیا |
| مازگرد | لە نزیك شاری شنۆیە |
| مازنجان | لە تورکیایە |
| ماسا بازان | پشت کۆ |
| ماکۆ | ئەکەوێتە بەشی ئازەربایجان |
| ماە بەسرە | نەهاوەند |
| ماە کوفە | دینەوەر |
| ماهی دەشت | لە ناوچەی کرماشاندایە |
| مەخمور | لە ناوچەی هەولێردایە |
| مەراغە | لە نزیك شاری ئەردەبیلە لە ئازەربایجانی ڕۆژهەلأت لە نزیك شاری شنۆیە |
| مەرعش | ئەکەوێتە نزیك شاری حەلەب لە کوردستان بەشی سووریا |
| مەرگەوەر | لە نزیك جولە مەرگە و دراوسێ ی شاری ورمێ یە |

| | |
|---|---|
| مەریوان | ئەکەوێتە ڕۆژئاوای شاری سنە |
| مەشهەد | مەڵبەندی خۆراسانە |
| موکری | موکریان |
| مەکس | بەستراوە بە هەکاری یەوە |
| مەلازگەرد | سەربە شاری بەتلیسە |
| مەلاگیە | ئەکەوێتە ناوچەی المعمورە العزیزیە —مەعمورەت ئەلعەزیز |
| مەندەلی | ئەکەوێتە نزیک شاری بەغداوە . خۆر هەلاتی بەغدا سەر سنوری عێراق ، ئێران بە دووری ( ١٩٥ ) کم |
| موش | ئەکەوێتە ناوچەی بەتلیس |
| موسڵ | ئەیئەوا یەکێکە لە شارە گەورەکانی عێراق |
| میافارقین | لە تورکیایە |

-ن-

| | |
|---|---|
| نەسیبین | نصیبین ئەکەوێتە بەشی دیاربەکر |
| ئەمیج | ئەکەوێتە سەر ڕوباری فورات لە ناوچەی حەلەب |
| نیفات | تۆر عابدین |
| نیفاتس | بریتی یە لە دیار بەکر خەرپوت —دەرسیم |

-و-

| | |
|---|---|
| وان | بەشێکی ئاوی فورات لەم ناوچەیە هەڵئەقوڵێ و ئەکەوێتە بەشی بەتلیسەوە |
| ومروگرد | بروجەرد |

-ه-

| | |
|---|---|
| هارون ئاباد | لە ناوچەی کرماشان دایە |
| هالیس | قزل ئیرماق —تورکیا- |
| هەرۆ | لە ناوچەی پشتکۆی لوڕستانە |

| | |
|---|---|
| هەفتیان | یا حەفتیان -خەفتیان- دەربەندی خان |
| هەکاری | حەکاری دەکەوێتە بەشی کوردستانی تورکیا |
| هەولێر | ئەربیل - ئەربانیلۆ |
| هەلیلان | لە ناوچەی پشتکۆی لوڕستانە |
| هەنگران | هەمەدانی ئێستایە |
| هۆرێن | لە نزیك شێخانە لە ناوچەی قۆرەتو |
| هویزە | حوێزە |
| هیزل | لە ناوچەی موسڵە |

-ی-

| | |
|---|---|
| یعقوبیە | یەعقوبە -ڕاستە . ئەو ناوچە کورد نشینانەی نووسەر باسی کردوون |

زۆربەیان خاکی کوردانە بەلام هەندێکیان خاکی کورد نی یە لەگەڵ ئەوشدا گەلێ شوێنی گرنگن چ لە کوردستان و چ لە دەرەوەی باس نەکراوە کە بەزۆری کوردی تیا ئەژی . ئەو شوێنانەی کە وڵاتی کورد نی یە بەلام کوردی زۆری تیایە وەك بەغدا ، تاران ،ئەنقەرە ، دیمەشق ، لوبنان ، ئەستەنبول ، قاهیرە.

﴿وەرگێڕ﴾

میژوو بریتی یە لە گێرانەوەی بەسەر هات ، لەبەر ئەوە
پێویستە ئەو گێرانەوە لە واقیع دەرنەچێت و عەقڵ بڕوای
پێ بکات و بیسەلمێنێ .

ئەو کەسانەی کە شارەزای میژووی گەلانن و دەربارەی نەتەوەو پیاوە هەڵکەوتوەکانی نووسیویانە وەك سالی لە دایك بوون ، شوێن وشوێنەوارو تەمەن و شێوەی هەڵسوکەوت ، هەندێ جار ئەوەندە پشێوی تیایە مرۆڤ سەری لێ ئەشێوێ وسەری لێ دەرناکات . کەسێ نەتوانێ ڕاستی لە درۆ جیابکاتەوە لێرەدا عەقڵ خۆی پێ ناگیرێ و دەست ئەخاتە مەسەلەکەوە تاوەکو ڕاستی و ناڕاستی لەیەك جیا بکاتەوەو ڕوە ڕاستیەکەی ئاشکرا بکات بۆ وێنە هەندێ لە میژوو نووسان ئەڵێن (کەیقوباد ) لە فیسارە هۆزە مانای یەکێکە لە هۆزە کوردەکان .

هەندێکی تر ئەڵێن (کەیقوباد ) لە ( پێش دادیەکانە ) لێرەدا ئەبێ هۆش بخرێتە کار بۆ ڕاستی و ناڕاستی ئەم مەسەلەیە . بەڕای زۆر لە میژوو نووسەکان لە پێش هاتنی کەیقوبادا پێش دادیەکان لە ناوچوون کەوابوو لێرەدا ئەقڵ ئەم واتایە ناسەلمێنێ کە کەیقوباد پێش دادی بووبێت.

میژوو نووسێك ئەڵێت ئەسفەندیار کوڕی کشتاسپە ، یەکێکی تر ئەڵێت کوڕی دارایە ، دارایش کوڕی بەهمەنە . هەندێکی تر بە کوڕی کشتاسپی ناو ئەبەن . هەندێ دروست بوونی دنیا بە (( ٤٠٠٤ )) سالْ پێش زایین ، هەندێکی تر بە (( ٥٥٨٤ )) سالْ و بڕێکی تر بە زیاتر لە (( ٧٠٠٠ )) سالْ پێش زایین ناو ئەبەن . هەندێ پەیدا بوونی زەردەشت سالی ( ٢٥٨٢ ) دوای هاتنی ئادەم ناو ئەبەن بڕێکی تر لە وەختێکی تردا.

لە سەردەکانی یەکەمدا پێش پەیدا بوونی نووسین و خوێندنەوە ، هەر ڕوداوێکی میژوویی بووبێت دەماودەم هاتووە تا گەیشتۆتە دەست نووسەر لەبەر ئەوە جیاوازیەکی زۆر بەدی ئەکرێ لە سالەکاندا .

ئەوکەسانەی میژوو ئەنووسن بۆ ئەوەی دوو دلی و ڕاڕایی لە نووسینەکانیاندا بەدی ئەکرێ پێویستە بایەخێکی زۆر بدەن بە پاشماوەی دێرین و بەردو شاخی هەڵکەندراو

کۆشك و تەلارە جێماوەکان . لەمانەوە شارستانیەت و پێش کەوتن لەو سەردەمەدا بە دەست دێت . بۆ وێنە لەم پەرتوکەدا ، مەبەستمان ڕەگەزی کوردو چۆنیەتی ژیانیانە ، کۆمەڵێك لە مێژوو نووسان کە پەیوەندیەکی زۆریان بە نەتەوەی عەرەبەوە هەیەو ڕەگەز پەرستانە هەموو شارستانیەتێك و هەموو کەسێك بنەڕەتەکەی ئەگێڕنەوە بۆ سەر عەرەب. نەتەوەی کوردیش بە ( سامی ) ناو ئەبەن

( کەلەمەو دوا باسی ئەکەین ) – پێویستە لێرەدا مرۆڤ هەست و هۆشی بخاتە گەڕو بزانێت لە زمان و نەریت و شێوەی هەڵسوکەوتی وورد بێتەوە ئایا کورد لە عەرەبە؟ یا لە ئاری یە ؟ زۆربەی مێژوو نووسەکان سەلماندویانە کورد ئارییەو بەڵگەی زۆرو زەبەندیان هەیە . ئەگەر مێژوو نووسێك کەوتە گومانەوە لە باسەکەی با سەرنجێکی کتێبەکانی سەردەمی کۆن بدات کە نزیکەی ( ٣٧ ) سەدە لەمەوبەر نووسراوە تا ئێستاش جێگای بڕوای زۆربەی نووسەرانن – ئەگەر هات و پاشماوەی کۆنی دەست نەکەوت . ڕووداوەکانی ئەو سەردەمانەی بەڕوونی تیا تۆمارکراوە ، زۆربەی مێژووی میسرو ئێران لەو سەرچاوانە وەرگیران .

مێژوو نووس پێویستە پشت بە دوو سەرچاوە ببەستێ:-

١- پاش ماوە دێرینەکان ٢- نووسراوە کۆنەکان .

هەرکاتێ لەمانە هیچی دەست نەکەوت ئەبێت بگەڕێتەوە دەورووبەری

لە ساڵی ( ١٢٢٨ ) ی قەمەری بەرامبەری ( ١٢٩٨ ) هەتاوی، عەلی محەمەدینی ئادەم ( شەریف الدولة ) فەرمانداری کوردستانی ( سنە ) بوو. بە فەرمانی حکومەتی مەرکەزی سەرگەرمی کوژانەوی ڕاپەڕینی گەڵباخیەکان بوو دژی دەوڵەت فەرمانبەرێکی بێگانە لە کوردستان هاوکاری ئەکرد، پێی وت : - دوێنێ سواری فڕۆکە بووم بەسەر ناوچەی گەڵباخی دا تێپەڕیم، کۆمەڵێ سوارم لە نزیک دێی ( نازانم ) بینی وا ئەزانم لە چەکدارانی گەڵباخی بوون.

- شەرریف الدولە - لێ ی پرسیم دێ ی نازانم لێرەوە چەند فرسەخ ئەبێت منیش تۆزێک بیرم کردەوە. سەرم سوڕما، هەر چەندە بیرم پێدا دێی وا لە ناوچەی سنەدا

نییه. کابرای بێگانه بەرامبەرم دانیشتبوو هەر سەیری ئەکردم له پڕ نەخشەکەی دەرهێناو کەدیم ڕاست ئەکات منیش ناردمه ماڵەوە نەخشەی ناوچەکەیان بۆ هێنام کە له لایەن خەڵکی خۆمانەوە کێشرابوو، له ئەنجامی بەراورد کرنێکدا بۆم دەرکەوت ئەو کەسەی لەگەڵ کابرای بێگانەدا بووە لێی پرسیوە ئەم دێیە ناوی چییە ئەویش وتویەتی ( نازانم ) کابرای بێکانیش نووسیویاتی - نازانم - جگە لەوش چەندناوێکی تر بەهەڵە نووسرابوو، ئەویش لەبەر نەخشەکەی ئێمە ڕاستی کردنەوە.

کە سەیری زۆر کتێب و نامیلکە مێژووییەکان ئەکەین له بڕیی ناوی کەیقوباد. کەیکاوس، توس، فەریبەرز، ئازیدەیاک. بەهمەن، ئەسفەندیار.

ئەم ناوانه نووسراون، ئاریاس. کامبوز، دژرس، فەراهورت ئاینمتویکۆ ئاحشو، یورس، گزرش " کە بە هیچ جۆرێک له ناوە ڕاستی یەکانی خۆیان ناچن. زۆربەی هەڵەو سەر لێ شێوای گەڕۆکەکان لەم جۆرە شتانەوەیه کە لەمەسەلەکە دوور ئەکەوێتەوە. جگە لەوەی یونانیەکان و یستویانه هەر ناوێک بەهەر زمانێک بوو بێت لەگەڵ زمانەکەی خۆیاندا بگونجێن و له ڕاستیەکەی کایانداوە. بە تایبەت ناوی فەرمانڕەوایاتی ( کورد وپارس ) کە له ناوەڕاستەکەی لایانداومو شێوەو ناوەڕۆکی جیاوازیان داوەتێ کە دووره له ڕاستیەکەی ڕۆژ هەڵات ناسەکان له نووسینەکانیاندا به تایبەت له سەر مێژووی کورد یەک ڕایان نی یه و هەر کەسه بە پێ ی بۆچونی خۆی و به ئارەزووی خۆی نووسیویەتی. ڕۆژهەڵات ناس ( سیرکێتگ ئەڵی کۆمەڵی - میتانی - تیرەیەکن له هۆزی - کاسی - هەروها پرۆفیسۆر سپایزار نوسیویەتی تیرەیەکن له هۆزی سۆباری. بەم شێوه هەڵەو لادانەدا بۆمان دەر ئەکەوێ کە ڕۆژ هەڵات ناس و گەڕۆک و بێگانەکان ئەبێت بنەڕەتی نووسینەکان له ڕاستی و زانیاری خەڵکی ناوچەکە وەربگرن. پێویسته بڵێن نووسەرە بێگانەکان نووسینەکانیان ڕاست بکەنەوە له بڕیتی ( گزرس و ئاخسویورس ) بنوس (ئەسفەندیار و بەهمەن). نەک ئێمه ئەسفەندیاره بەهمەن بکەینه ناوێک کە دوور بێت له ڕاستیەکەی لێرەدا ئەگەینه ئەم ڕاستیەو ئەڵێین : - پاش پەیدا بوونی نووسین و خوێندن سەرچاوه میللیەکان زۆر جێگای بڕواترە تا وەکو سەرچاوه بێگانەکان. تۆمار کردنی ئەو ڕوداوانەی پێش نووسین و خوێندن ڕویان داوه پێویسته پشت بە پاشماوه دێرینەکان و داستانه دەماو دەمیەکانی خەڵکی ناوچەکە ببەسرێت.

## بەندی دووەم دووهەم

### پەیدا بوونی ئادمیزاد

مرۆڤ لەکوێ پەیدا بووە ؟ !

بەبێ دوو دڵی ئەبێ بڵێین، مرۆڤ و هەموو گیان لەبەرانی تر لە خودی زەویەوە پەیدا بوون، لە هیچ جێگایەکی ترەوە نەهاتوون. زەوی لەپێشدا پارچە ئاگرێک بووە. خێرایی سووڕانەوەی زۆر بووە، وردە وردە سارد بۆتەوە.. ئاژەل وگیانداری گەورەی لێ پەیدا بووە وەک، مامون، فیل، حوشتر، ئەسپ، گا، کەرکەدەن، نەعامە،مێشەسی باز... هتد، پاش ئەوەی زیاتر سارد بۆتەوەو پلەی گەرمایی کەمی کردوە، خێراییەکەشی کەمی کردوە، زیندەوەری بچوکتر پەیدا بووە وەک، شێر، پڵنگ، ورچ، مەیمون، ئادەمیزاد، مەڕوبزن، قەل و مریشک، کۆتر، شەهێن، هەتا زەوی ساردتر بۆتەوە سوڕانەوەی ئاسایی تر بووە وردە وردە گیانلەبەری بچوکتر پەیدا بووە وەک، مار، مشک مارمیلک، بۆق، بزن مژە، کیسەڵ، دووپشك جاڵجاڵۆکە. بەپێی باوەڕی خواناسەکان وەک لەتەورات و قورئانی پیرۆزدا هاتووە ڕەگەزی هەموو مرۆڤ لەئادەمە کە لەیەک شۆێن و کاتدا خوا لەگڵ یانی لە زەوی دروستی کرد یاخود لە چەند جێگایەک " ڕای گەردوون ناس و ڕەگەزناسەکان " بەهەرحاڵ ئەوەمان بۆ دەرئەکەوی ئادەمیزاد لەم زەوی یە پەیدابومو لە شوێنێکی ترەوە نەهاتووە. پارس ئادەمیزاد نازانرێ، سەرەتای دیاری کراوی نی یە ؟

ئایا هێلکە لە مریشکە یاخود مریشک لە هێلکە یە ؟

ئایا ناوک لە ڕوەکە یاڕوەک لە ناوکە ؟

گومان لەوەدا نییە کە مریشک لە هێلکەو ڕوەک لە ناووکە. ئەبێ ئەوەش بزانین کە هەموو گیانلەبەرو ڕووەک لەم زەوی یە پەیدا بووە. جا دوبارە ئەبێ ئەوەش بڵێین کە گرنگ نی یە کە هەر کامیان لە هەر کامیان بێت. گرنگ ئەوەیە بنەڕەتی هەمووی لە زەوی یە. بۆ سەلماندنی ئەم وتەیەمان کە هەموو گیانلەبەرو ڕوەک لە زەوی پەیدا ئەبێ. پارچە زەویەک لە هەموو جرو جانەوەر و گژوگیایەک پاک ئەکەوینەوەو

ئامادەی ئەکەین. لە پاشدا زەویەکە ئاو ئەدەین. پاش ماوەیەک ئەبینین کە چەندەها گژ گیاو جانەوەری لێ پەیدا بووە بێ ئەوەی ئێمە هیچ دەسکاریمان کردبێ، جگە لە ئاودان. ئەمەش چەند هۆیەکی سەرەکی هەیە وەک ڕۆشنایی، گەرما، هەوا، شێ. ئەگەر هات و کارێزێکان لێ داو ئاوی لێ پەیدا بوو پاش ماوەیەک ئەبینین کە بۆق و قرژانگ و چەند مێرویەک و گژو گیای وردەی لێ پەیدا بووە. بەبێ ئەوەی ئێمە هیچ کارێکامان تیا کردبێت ئەمەش چەند هۆیەکی سروشتی کاری تێ کردووە. هەر بەو شێوە لەسەر زەوی و باو دەریاکان چەند جۆرێک مێژوو ئاژەڵ و گژو گیا پەیدا بووە. کە ئەمانەش چەند هۆیەکی سەرەکی سروشتی کاری تێ کردوون وەک ئاو، هەوا ڕۆژ، گەرمی، لەم جۆرە شتانە زۆرن بۆ ئەوەی لەباسەکە دەر ئەچین بەم دوو وێنە کۆتایی ئەهێنین. لەو دوو وێنەدا بۆمان دەر ئەکەوێ کە زەوی بریتی یە لە ( گیان و توخوم ) یانی بریتی یە لە چەندەها هەستی جۆراو جۆر. کەرەسەی ژیان لە حاڵەتی وەستان و نەجوڵاندایە هەر بەو جۆرە تیشک و گەرماو شێ و هەوا بەهەر خاڵێکی ئەو شوێنەدا بگەن بەزوویی ئەبێتە هۆی دروست بوونی گیانلەبەرو بە شێوەیەکی ئاسایی گەشە ئەکەن. ناووک چییە ؟ ناوک بریتی یە لە کۆمەڵێ گەردیلەی بەیەکەوە نووساو ( متجانس، متجاذب ) کە گیان بەشێوەیەکی تایبەتی بۆ خۆی دروست ئەکات. هەر کاتێ هۆکانی ژیان پەیوەندی لەگەڵدا بەست ئەم بێ دەنگ خۆی ئەگەیەنێتێ و دەست بەگەشە کردنی سروشتی خۆی ئەکات. بە کورتی بڵێین گیان هەرچییەک پێویستی بێت بۆ خۆی دروستی ئەکات. بۆ وێنە ناوکە بادەم کە یەکێکە لە مادە گیاندارەکان تا لە هۆکانی ژیانەوە دووربێ وەستاو بێ جوڵەیە. بۆ ئەوەی بگاتە هۆکانی ژیان بخرێتە چاڵ و تیشک و گەرماو شێ و هەموو هۆکانی تری بۆ ئامادە بکرێ لە شێوەی وەستانەوە ئەچێتە شێوەی گەشە کردن، ئەبینین ڕەگ ڕیشەو قەدو گەڵاو تونکڵ پەیدا ئەکات و پاش ماوەیەک بەر ئەگرێت. بەو شێوەیە جارێکی تر لە ئەنجامی هۆکانی ژیانەوە چەندین هەزار ناوکە بادەمی دیکەی لێ پەیدا ئەبێ ناوک لە شێوەی وەستان ( جمود ) ەوە ئەچێتە شێوەی گەورە بوون پێ گەیشتن بە هۆی تیشک و گەرماو هەواو شێ وە هەرچییەک پێویست بێ بۆ خۆی دروستی ئەکات وەک، پێست، پەڕ،شاخ تا ئەبێتە زیندەوەرێکی تەواو. هۆکانی دروست بوونی ژیان لەگیانلەبەرو گژو گیا ئەمانەن : - ١- مادەی زیندوو ( نوک ) ٢- خاک – گل – یا

منداڵدان — ڕەحم — ٢- شێ — رطوبە ٤ — گەرما ٥- هەوا، ٦- تیشک ئەو هۆیانە لە هەر کوێ دا هەبێت ژیانی تیا ئامادەیە. پاش ئەم دوو کورتە باسە لە دروست بوونی گیانلەبەرو گژو گیا دوو پرسیاری تر دێتە پێشەوە : -

١- زەوی چەند هەزار ساڵ بەر لە ئێستا خەریکی دروست کردنی مرۆڤ بووە ؟

٢- ئایا ئەم شێوە لە هەموو ڕووی زەوی دا بووە، یاخود لە چەند جێگایەکی تایبەتی مرۆڤ دروست بووە ؟ وەڵامی پرسیاری یەکەم تا ڕادەیەک ڕوون و ئاشکرا نی یە. لە نووسراوە کۆنەکاندا هاتووە کە شەش هەزار ساڵ پێش ئێستا زەوی دروست بووە. بەپێ ی ئەم وتەیە ئەبێت کاری دروست بوونی مرۆڤ لەوە کەمتر بێت. بەڵام پاشماوە دێرینەکان و چینەکانی زەوی ئەوە دەرئەخەن تەمەنی زەوی گەلێک لەوە زیاترە. بەپێ ی ئەو سەرچاوەو پاشماوانەی بۆ زیاتر لە ( ٥٠٠ ) هەزار ساڵ پێش ئێستا[1] بەم

شێوەیە ناتوانین سەردەمی ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی دیاری بکەین بەڵام ئەتوانین ئەوەندە بڵێین کە سەردەمی مرۆڤ و مەیمون چەندین هەزار ساڵ پێش سەردەمی " ماموت و فیل و حوشتر و ئەسپ و گا " یە یانی چەندەها هەزار ساڵ پێش ئێستا کە بە سەردەمی مشک بۆێ ناو ئەبرێ.

بەم شێوەیە تاوەکو ئێستا نەزانراوە تەمەنی پەیا بوونی مرۆڤ بە تەواوی چەندە! کە پاشماوەی ئێسقانی ئادەمیزادو سەرچاوە مێژووییەکانەوە بۆمان دەرئەکەوێ کە ئادەمیزادی پێشو لەش و لاریان گەورە ترو بەهێزو توانا تر بوون لە ئادەمیزادی ئەمرۆ. بەڵام لە وەڵامی پرسیاری دوەمدا ئەڵێین وەک چۆن ڕوەک و گژ و گیا لە سەرتا سەری زەوی دا هەیە دروست بوە بەو شێوەیە ئادەمیزاد لە هەموو شوێنێکی زەوی دروست نەبووە !. لە هەر شوێنێک ئەو هۆ سەرەکیانە بوویێت بە ئەندازەیەک گیانلەبەرو ئادەمیزاد بووە. ئەو شۆێنانەش بریتین لە کەناری دەریاو دورگە نزیک ئاوەکان کە زیاتر ئەو هۆیانەیان تیا ڕەخساوە وەک ئەڵێن ئادەم لە دورگەی —

---

[1] بەگوێرەی زانستی زەمیناسی تەمەنی زەوی لە سەدان ملیون ساڵ زیاترە.

سرانديب – له خواروی هيندوستان كه سيلان ی ئێستايه دابەزيوه[*]. له ڕەگەزەكانی ئادەميزاديشدا بۆمان دەرئەكەوێ كه له يەک شوێن لەم زەويەدا مرۆڤ دروست نەبووه بەڵكو له چەندين شويندايه وەک له شێوەی ڕوخسارو هەڵس و كەوتدا جياوازی هەيه. ئەم وتەيەی ئێمە پێچەوانەی هيچ ديانەت و ئاينێک نييه هيچ دوو دڵی ناوێ كه مرۆڤ له چەند ڕەگەزو نەژادێكه وەک له قورئان و تەوراتدا هاتووه كه ئادەميزاد لەگەڵ دروست كراوه. جگه لەوەش ئەگەر بڵێين ئادەميزاد له چەند ڕەگەزێک نيەو بڕوامان پێ ی نەبێت. باشه ئەگەر ئادەميزادی پێشوو سپی پێست بوون ئەی ئەم ڕەش پێستانه له كوێوه هاتوون، يا ئەگەر ڕەش پێست بوون ئەی ئەم سپی پێستانه له كوێ وه هاتوون. لێرەدا ئەبێت باسەكان بدەينەوه به ڕۆشنايی ئەقڵ، واز له ڕای كۆنرانه بهێنين هەرچيەک هۆش نەيسەلمێنێ بڕوای پێ نەكەين و دووری بخەينەوه چونكه پايەی هەموو دين و بڕوايەک لەسەر بنەڕەتی هۆش دامەزراوه. خۆ هەر كەسێک بڕوای به هۆش و لێكدانەوه نەبێ دينەكەيشی بێ پايەو بنەڕەته.

[*] تاريخی كامل ل ١٢ بەرگی يەكەم هەروەها مروج الذهب بەرگی يەک له حاشيەی ل ٤٠ دا وه زۆربەی مێژوه گشتيەكان – بەلام له تەوراتدا ئادەم له عەدەن دروست بووه.

## بەندی سێ یەم

### نەژادی ئادەمیزادو بردنی گەل و هۆزەکانی

لە باسەکەی پێشووماندا بۆمان دەرکەوت کە مرۆڤ لە تەنها ڕەگەزێک نییە بەڵکو لە چەند ڕەگەزێکی جیا جیانە. زانا ڕەگەز ناسەکان بە شێوەیەکی زانستی ڕەگەزی ئادەمیزاد ئەکەن بەچوار بەشەوە، ڕەگەزی سپی، ڕەگەزی ڕەش ڕەگەزی سوور، ڕەگەزی زەرد. وا دەرئەکەوێ کە ڕەگەزی سێ یەم و چوارەم لە هەردوو ڕەگەزکەی تر پەیدا بووبن. یانی ڕەش و سپی بە بنەڕەت ئەزانرێ، کە پەروەردگار لەیەک ئادەمیزاد کە ئەویش ( ئادەم )ە پەیدای کردوە بەڵام مێژو نووسە ئاینیەکان ئەڵێن یان لە دوو ئادەمیزاد پەیدا بوە یان زیاتر لە بەشی نۆهەم ئایەتی ( ٢٢) لە تەوراتدا ئەڵێ :
- ئەوەی حام بە هۆی کردنی چەند گوناهێکەوە کە سەرپێچی بووە لە فەرمانی خوای مەزن ڕەش بوون و ئەوەی سام هەر بە سپی یەتی ماونەتەوە. لە " سبائک الذهب " و زۆربەی کتێبە مێژوییەکان بەو جۆرە هاتوە یانی ئەوەی حام لەبەر سەرپێچی لە فەمانی خوای مەزن ڕەش بوون. وە یاخود بە هۆی هەندێ کارتێ کردنی کیمیاییەوە ڕەش بوون کە ئێستا پێ یان ئەوترێ ڕەش پێست. مێژوو نووسەکانی ئیسلام و جولەکە ڕەگەزی مرۆڤ ئەکەنە دوو بەشەوە ڕەش و سپی.یان کۆمەڵی ڕەشەکان لە سپیەکانن وە بە هۆی گوناهەوە ڕەشی کردون یاخود لە کۆمەڵی جیاوازن و هۆی کیمیاوی کاری تێ کردون. هەر چۆنێ بێ لێرەدا باسمان لە سپی پێستانەو کارمان بە ڕەگەزەکانی ترەوە نی یە.

زۆر لەمێژوو ناسەکانی ئیسلام و جولەکە کۆمەڵی سپی ئەکەنە دوو بەش یانی دوو ڕەگەز، ڕەگەزی ١- سامی ٢- یا فتی – یافث – وە هەندێکی تریان کۆمەڵی سپی بە ئاری و سامی یا شامی ناو ئەبەن. مەبەست لە سامی یا شامی کوڕی نوحە کە - س – و – ش – لە عیبری و عەرەبیدا بە واتایەک دێن وەک – ( ڕووس -، ڕووش )، مەسیح، مەشیح – سۆمۆئێل – شۆمۆئێل وڵاتی شام کە بەناوی سامی کوڕی نوحەوە هاتووە هەر بە ناوی سامەوە ناو نراو، هەر وەها ڕەگەزی ئاری لە بەرەی یافث یا

یافث – کوڕی نووحە یا نەوەی هەر کامی تریانە نەک ( سام و حام ). زۆربەی مێژوو نووسان بەرەی ئادەمیزاد تەنها لە بەرەی نوح ئەزانن کە لە سام و حام و یافث بن.

هەندێکی تر لەسەر ئەو ڕایەنین کە بەرەی ئادەمیزاد بگەڕێتەوە سەر کوڕەکانی نوح. ئەڵێن تۆفانەکە هەموو دنیای نەگرتۆتەوە بەڵگەش دۆزینەوەی کیشوەری ئەمەریکایە لەم دواییەدا. سامی یەکان ئەکرێنە دانیشتوانی شام، ئارامیەکان، فینیقیەکان ".

فینیقیەکان لە ڕۆژهەڵاتی دەریای ( سپی ) ن و تەرابلسی ئێستا پایتەختیانە. لە تەوراتدا بە نەتەوەی حام ناسراون، یاتی هاو خێزانی – قبطی و بەربەرو حەبەش و سۆدانیەکانن، بەڵام زانا ڕەگەز ناسەکان ئەمانیش بە نەوەی حام دائەنێن لێرەدا جیاوازیەکی گەورە بەدی ئەکرێت. هاتنە خوارەوەو بڵاوبەنەوەی سامیەکان لە شاخەکانی ئارارت بەرەو ئەم باسە نووسراوە. لەبەر ئەوەی باسی ئێمە نی یە وازی لێ ئەهێنین و ئارەزوومەندانی ئەم باسە سەیری تەورات و کتێبە مێژووییەکان بکەن.

ئاری : - ئاریەکان ئەکرێن بەسێ بەشەوە ١- هیندیەکان ٢- ئەوروپییەکان ( لاتینەکان، ئەڵمانی، ئۆسلاوی، ( سەڵت )ەکان ٣- ئێرانیەکان ( پارس – کورد ) جگە لە مادەکان و ئاراراتیەکان. لە پاشماوە سەرچاوە دێرینەکانەوە بۆمان دەرئەکەوێ کە ئەو سێ هۆزەی باسمان کرد ( هیندۆ، ئەوروپی، ئێرانی ) کە نەتەوەی ئاری پێک ئەهێنن چوار هەزار ساڵ پێش لە دایک بوونی مەسیح بە شێوەی خێڵایەتی و بیابان گەڕی بەیەکەوە ژیاون.

هەندێک ئەڵێن لە ئاسیای ناوەڕاست هەندێکی تر ئەڵێن لە سەروی کەناری دەریای بەڵتیک بوون کە بریتیە( ئەسکەندەنافیا ) برێکی تر ئەڵێن لە خواروی کەناری دەریای ( بەڵتیک ) بوون کە بریتی یە لە سەرووی ( ڕوسیای بەشی ئەوروپا ) هەرچەندە ڕای یەکەم نزیکە لە ڕاستی یەوە.

لەبەر ئەوەی باسەکەمان دەربارەی یطران و شوێنی کوردو پارسە ئەوانەی لە بەشی ئێران و ڕۆژ ئاوای ئێراندا ژیاون،واز لە بەشی هیندۆوو ئەوروپییەکان ئەهێنین.

## بەندی چوارەم

### دەربارەی رەگەزی ئاری و تییرەو هۆزەکانی

**وشەی ئاری لەچی یەوە هاتووە ؟**

وشەی ئاری لە دوو بەش پێک هاتووە ( ئار ) و ( ی ) کە لە زمانی کوردی و پارسی کۆندا یەک سەرچاوەن بە مانای ئاگر دێت. هەروەها وشەکانی ( ئایر، ئاور، ئاهر، ئاهێر ئاتر، ئاگر ) هەمووی لە شێوە زمانە کوردیەکاندا بە مانای ئاگر دێت کە ئێستاش هەر بەم مانایە دێت، لە زمانی فارسی کۆندا ئاگر بە مانای ( هێر، ئاذر. ئاتر، ئاگر ) هاتووە.

( هارا، هورید، هیدبر، ئازمریر، ئەوزەر، ئەوئازەر، ئازەرئاباد، ئازەر ئابادیان ئازار ئابادەگان، ئاگردار، ئاتراب، ئاتروپاتین، ئاترەباتەکیین، ئەوروپا ). هەروەها لە دواییدا ( ئاخگر، ئەستێر، ئاستارە، ئاهور ) هەمووی ئەم وشانە لە ( ئار ) ە وەهاتووە کە ماناکەی ( ئاگر ) ە[1]. وشەی ئاری بە واتای ئاگری یا ئاگر پەرست دێت کە کۆی ئەبێتە ( ئاریانی ) یا ( ئاگرپەرستان ) چونکە ئەم کۆمەڵە ئاگر پەرست بوون پەیوەندیەکی بەتینیان لەگەڵ ئاگردا هەبووە. وەک چۆن ( حامی ) یەکان بت پەرست و سامیەکان زوا پەرست بوون. لە کۆندا بە ئەفغانستانیان ئەوت ئاریا چونکەزۆربەی دانیشتوانی ئەو وڵاتە ئاگر پەرست بوون. وشەی ( هەرا، هەرات کە لە دوو هێزەوە وەرگیراوە بە مانای ئاگر دێت. وشەی ( ئەهریمەن ) کە لە دوو بەشی پێک هاتووە ( ئاهر ) و ( مەن ) یانی — شەریکی یەزدان کە هەموو کارەچاکەکان ( ئاهۆرا ) و کارە خراپەکان ( ئەهریمەن ) ئەیکات. وشەی ( هاگریان ) کە لە کتێبی — اول تواریخ الایام — فەسڵی پێنجەم دێری دەهەم وا هاتووە. بریتییە لەکۆمەڵی ئاگر پەرستان کە جیاوازن لە سامی یەکان. هاگر کە مانا عەرەبییەکەی — هاجر — ە لەوەوە وەرگیراوە. لێرەدا ئەوەمان بۆ دەر ئەکەوێ وشەی ئاری بەو کەسانە ئەوتراوە کە سامی و حامی نین مەگەر تەنها لەبەر ئەوە بووبێ کە

---

[1] (١) لەکتێبی ئاوێستا — هارا — ناوی کێوی دەماوەندی ئێستایە کە لەو سەردەمەدا گرکان بووە.

ئاگر پەرست بوون ڕۆژو ئاگریان خۆش ویستوە ڕای ئەو کەسانەی کە بڕوایان بە تۆفانەکەی نوح هیە وایە کە نەوەی ئادەمیزاد سەرجەمی لە سێ کوڕەکەی نوحەوە پەیدا بوونەتەوە. ڕەگەزی ئاری لە نەوەی یافث – ە بەم ڕایە سپی پێستەکان لە بەرەی سامی و یافثین. ئەتوانین بڵێین سامی و ئاری هەر بە مانایەک دێت چونکە وشەی ئاری زیاتر باو بووە بە ئاگر پەرستەکانیان وتوە. زۆربەی مێژوو نووسەکان لە بڕیتی یافثی ( ئاری )یان ناو بردوە. هەندێک ئەڵێن بەهۆی ئەوە کە لە ڕۆژهەلات دائەنیشن پێ یان ئەڵێن ئاریان یانی ڕۆژ هەلاتی. لە زمانی فەرەنسایی بە ڕۆژهەلات ئەڵێن ( ئارین ) ئەمە ئەقڵ گیر نییە و بڕوای پێ ناکرێ. لەوە ئەچێ ئەمە بە تەنها بە خەڵکی ئێران بو ترێ بەلام ئەو ئاریانەی کە کۆچیان بەرەو هیندو ڕوسیاو ژاپۆن کردوە ئاگرتتەوە، چونکە ئەمانە لە ڕۆژهەلاتەوە کۆچیان نەکردۆتە ئەو شوێنانە، یا ئەبێت ئەوانە ئاری نەبن، ئەمەش پێچەوانەی ڕاستی یە لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی مێژوو ناس و زانا ڕەگەز ناسەکان بە ئاری ناویان ئەبەن، هەندێ نووسیویانە لە زمانی سانکریت و ئاوێستا وشەی ئاری بە مانای نەجیب و خو ڕەوشت جوان دێت، هەروەها لە کتێبی ( منوشاستر ) کە کتێبی دینی هیندەکانە ( ئاریاوەرت ) بە مانای هیندوستان هاتووە یانی ولاتی ئاری ولاتی نەجیب بەشەرفەکان. هەرچەندە ئەمەش بەهەڵە ئەزانرێ چونکە ئەگەر هیندوستان ولاتی ئاریەکانەو ئاریاوەرتیان پێ وتوە یانی ئاگر پەرستەکان لەم جێگایەدا نیشتە جێ بوون، کەوابوو دانیشتوانی دەرەوەی هیندوستان ئەبێ نانەجیب و وەک ئەوان نەبن، ئەمەش دیسانەوە هەڵەیەو جێ ی بڕوا نی یە. نەتەوەی ئاری کە ئەمڕۆ گەورە ترین میللەتی جیهانن. پێش بلاو بوونەوە و کۆچ کردنیان لە ئاسیای ناوەڕاست بووبێ کە زاناکانی ئاسەوار نووسیویانە. ئەم نەتەوەیە ( ٢٤٠٠ ) پ ز کە بە ڕای تۆفانیەکان لەسەردەمی نوحدا لە ئەنجامی ڕوداوێک کە بۆمان ڕوون نی یە دوو چاری بلاوبونەوەو کۆچ کردن بوون. پاشماوە دێرینەکان وا نیشان ئەدەن کە بەشێک بەرەو ( دۆڵی پێنج ئاو )ی هیندستان سەرەو خوار بوونەتەوەو بلاو بوونەتەوە کە ڕەگەزی هیندیەکان لەم کۆمەڵەن. بەشێکی تریان بەرەو لای یونان و ڕۆم مەقدۆنیا ڕۆیشتوون و لەوێ جێ گیر بوون کە هۆزەکانی ( گورگ، لاتین، ئارناوت ) لەم کۆمەڵەن. بەشێکی

بەرەو ڕۆژ ئاوا ملیان ناوە [٧] ئەمانە بوون بە دوو دەستە دەستەیەکیان لە ڕێگەی ( مەرو ) (خۆراسان ) ەوە بەرەو لای ( مازەندەران ) و کەناری دەریای خەزەرو ناوچەی ئازەربایجان و لوڕستان و ئەرمەنستان [٨] کوردستانی ئەمڕۆ تا ناوچەی شامان ( سوریە وکەناری دەریای سۆی و ڕۆژئاوایی بڵاوبوونەتەوە ). هۆزەکانی ڕۆژ ئاواو مادەکان کە بریتین لە ( خەزەر، گیل، دێلم، کورد، لوڕ، چەرکەس، ئەرمەن، ئابازە، ئەلبان ) لەم کۆمەڵەن. دەستیەیەکی تر لەم کۆمەڵە ڕەوە ئەفغانستان و گورجستان و وڵاتی پارس کە لە کۆندا بەپێ ی نووسراوەکانی هێرۆدۆت ( سفن )ی [٩] پێ ئەوەترێ. هاتوون تا کەناری، دەریای عومان بڵاو بوونەتەوە م هۆزەکانی ( ئەفغان، بلوچ، گورجی، کرمان، پارس ) لەم کۆمەڵەن.

بەشێکی تریان هەر لەو جێگایەداو لە دەورو بەری ئاسیای ناوەڕاستدا ماونەتەوە کە بریتیە لە ( سیستی و ئۆسلاوی ) یانی ( سەقالیبی وسەگری، سیک ( سکای ) — تورانی.

ئەم کۆمەڵە ماوەیەکی زۆر گەڕۆک و کۆچەر بوون. ئەیان توانیوە شوێنێکی تایبەتی بۆ خۆیان هەڵبژێرن و دەوڵەتێک بهێنن تا لە ئەنجامدا بەرەو وڵاتی ئێرانی ئێستا کشاون، ئاریە ئێرانیەکان کە جێگای باوو باپیریان بووە لەم شوێنانە دەریان کردون و شەڕو شۆڕێکی گەورە لە نێوانیاندا ڕووی داوە.

---

[٧] لێرەدا ڕۆژ ئاوا بە مانای ڕۆژ ئاوای ئاسیای ناوەڕاست دێت کە بریتی یە لە ( بەڵخ ) بەڵام ئەم ناوچەیە بەنیسبەت دانیشتوانی ئێرانەوە دەبێتە ڕۆژ هەڵات.

[٨] هەندێک ڕایان وایە کە دانیشتوانی ئەرمەنستان و کوردستان ئەمڕۆ لە لای کەناری دەریای بەڵتیکەوە بەرەو قەفقاس هاتوون لە چیای ( جودی ) یانی ئارارات هاتوونە خوارەوە لە ڕۆژ هەڵاتەوە تا کەنداوی عەرەب لە ڕۆژ ئاوا تا کەناری دەریای سپی بڵاو بونەتەوە.

[٩] لەوە ئەچێ وشەی — سفن — لە - یفن — ەوە هاتبێ کە لە ئەوەی دەورو بەری دەریای عومان. ئەم کۆمەڵە لێرەدا ژیابن لە پاشدا بەسەریاندا سەرکەوتوون و دەریای کردون.

# بەندی پێنجەم

## دەربارەی نەتەوەو هۆزەکانی ئاری

نەتەوەو هۆزەکانی ڕەگەزی گەورەی ئاری بە شێوەیەکی گشتی بریتی بە لە ( ئەنردان، لاتین، جەرمەن، ئۆسلاو، سلت، های، بلاج چەغزی، ئابادیان، ئەرتادیان، ئاجای، ماد، پارس ).

١- ئەنردان – بریتین لە هیندەکان و دانیشتوانی ناوچەی سەندو پێنج ئاو سیک و لشمیر.

٢- لاتین – پێک هاتوون لە فەرەنسی، ئەسپانی و پرتغالی و ئیتالی و ڕۆمانی.

٣- جەرمەن : لە هۆزەکانی ئەڵمان و ئینگلیز سایکس و ئەسکندنافیا و گورگ پێک هاتوون[10].

٤- ئۆسلاو – بریتین لە ڕوسەکانی پۆڵەندا – لەهستان و سرب و چیکی.

٥- سلت – پێک هاتوون لە بۆمیەکانی ئەوروپای ڕۆژ ئاوا.

٦- هایی – ئەمانە ئەرمەنەکانن کە - ئارارات – یشیان پێ ئەڵێن.

٧- بلاج – لە دانیشتوانی بەلچیکا و بولغاریا پێک دێن.

٨- چەغزی – بەشێکن لە ڕووسەکان و سەقالیبەکان [11] کە لە سەمەرقەندەوە بۆ ئەو ئاوە کۆچیان کردووە[12]. کە سەگلاوی یا ( سوغدی ) شیان پێ ئەڵێن.

---

[10] جەرمەن بە مانای ئازاو دلێر دێت.

[11] ( ٢ ) سەقالبینیەکان بە مانای موو زەردەکان دێت کە بە هۆزی ( سیت ) بەناو بانگن یانی ڕوسەکانی ڕۆژ ئاوا. ئەمانە کورد پێ یان ئەڵێن ( سەگلاوی ).

[12] سەمەرقەند- عەرەب پێدەڵێ جامورکەند - ناوێکی تورکیە یانی قی‌لای گلێن بە پێچەوانەی تاشقەند کە بەمانای قەلای بەردین دێت.

٩- ئابادیان : كه (( ئابادانیشیان ) پێ و تون ئه‌مانه بریتین له‌و ئاریایانه‌ی كه به ناوی ئابادی گه‌وره ناو یه‌برێ واتا مه‌هاباد.

مه‌هاباد " ئاباد " یه‌كه‌م په‌یامبه‌ری ئاسیای ناوه‌ڕاست بووه كه پایته‌خته‌كه‌ی له ده‌ورو به‌ری – به‌ڵخ – دابوه. كتێبی – ده‌ساتیر – به كتێبی پیرۆز ئه‌زانن وره‌فتاری پێ ئه‌كه‌ن. له‌م كۆمه‌ڵه ته‌نها چه‌ركه‌سیه‌كانی قه‌فقاس ماونه‌ته‌وه. له زمانی كلدی – ئابادیان – ئابه‌تیانه - له دوایدا بوه به ئابه‌تین و یافث بوه به - ئابت – مه‌به‌ست له وشه‌ی – ئابتین – باوكی فه‌رمیدونه كه ناوی ڕاستی خۆی – ئاتوش – ه كه كلدانیه‌كان پێ یان وتون.

دوا پاشای ئه‌م زنجیرمیه - ئاباد – ئازاد بووه كه به ده‌ستی – ئه‌مارده‌كان – یاتی ئه‌وه‌كانی – بنی كوش – كوژراوه[١٣].

١٠ – ئادیان : - كه ئازادیانیان پێ وتوون. ئه‌مانه له‌و ئاریانه‌و كه ڕه‌چه‌ڵه‌كیان ئه‌چێته‌وه سه‌ر ئازاد ئابادان – واتا – مه‌هاباد – وه‌ك وتمان به ده‌ستی ئه‌مارد كوژراوه.

١١- ئاجامی – ئامانه بریتین له ئاریه‌كانی بنه‌ماڵه‌ی " یاسان جام " كه ده‌گه‌ڕێته‌وه سه‌ر " شاری مه‌هبول " له زنجیره‌ی یاسانیه‌كان[١٤]. عه‌ره‌ب وشه‌ی ئاجامان كردووه به " عه‌جه‌م ". ئه‌م هۆزه " گوڵ شاییه "

---

[١٣] له‌ته‌وراتدا به‌شی نۆهه‌م ئایه‌تی ( ٨ ) نووسراوه ئه‌مرود كوڕی كورش كوڕی حام كوڕی نوح ئه‌مرودیه‌كان له خاكی شه‌نعار – یانی بابل و جزیره‌ی عه‌ره‌ب بوون تاولاتی ئه‌فریقاش بڵاو بوونه‌ته‌وه. ئه‌مردودیه‌كان به‌یاخی بوون و وه‌حشی گه‌ری و كوشتار به‌ناوبانگ بوون. هه‌ر به‌م بۆنه‌یه‌وه پێ یان وتون – جبار – ئه‌مانه ڕه‌فتاریان له ڕه‌فتاری وه‌حشی چوه. له‌بریتی كڵاو كه‌للە سه‌ری گایان له‌سه‌ر ناوه. له بریتی پالتۆ پێستی پڵنگیان له‌به‌ر كردوه، ئه‌مه شێوه‌یه‌كی ترسناكی وه‌رگرتوه بۆیه پێ یان وتوون " دێو " و به پاشاكه‌یان وتراوه " خدێو " یانی خوای دێو.

[١٤] مێژوو نوسه ئێرانیه‌كان زنجیره‌ی پادشاكانی ئێران تا یه‌زید گوردی كوڕی شه‌هریار به‌م شێوه‌یه باس ئه‌كه‌ن : -

١- ئابادیه‌كان : - له ئابادی گه‌وره‌وه ده‌ست پێ ئه‌كات " ئه‌ماباد "

٢- جیته‌كان : - ئه جێ ئافرامه‌وه ده‌ست پێ ئه‌كات

٣- لوڵ شاییه‌كان : - یا " شایی یه‌كان " سه‌رتایان له - گلیوشاده - ه وه ده‌ست پێ ئه‌كات.

کانیشیان پێ وتون، چونکە بە ڕەگەز دەچنەوە سەر " گلیوشا " کە بابە گەورە یانە " شاها " لە پارسی کۆندا بە مانای ( سەروەر ) یا ( خواوەند ) یا ( دروست کاری جیهان ) دێت.

پێش دادیەکان کە لە ( کەیومەرس ) وەدەست پێ ئەکەن و لە ئەوەی یاسان ئەجەمن " ئەجەمی " شیان پێ ئەوتری.

پاش ئەوی یاسان ئەجەم ئەمرێت کەسێکی وا نەبووە جێگای بکرێتەوە و شیاوی فەرمانڕەوایی بێت، بۆیە ماوەیەکی زۆر وڵاتی پێش دادیەکان تووشی گێرو گرفت و ئاڵۆزی بووە. زۆری خەڵکەکەی بە کۆمەڵ چوونەتە نزیک شاخ و پێکەوە ژیاون لێرەدا " ملوک الطوائف " دروست بووە.

ساڵی - ٢٢١٨ - ( پس از هبوط ) (١) پاش هاتنە سەر زەوی ئادەم هەر لە نەوەی خۆی کەیومەرس فەرمانڕەوایی گرتە دەست بە هۆی زیرەکی و ئازایی و هوشیاری خۆیەوە توانی وردە وردە خەڵکی بگەڕێنێتەوەو لە دەوری خۆی کۆیان بکاتەوە. سەرەتای فەرمانڕەوایی کیان، هاخامەنشینیەکان، پارس، سلۆکید، ئاشکاننی، ساسانی ". بە پێ ی نووسین ئەم ڕێک خستنە وا دەرئەکەوێ کە شێوەی نووسینی مێژوو نووسە ئێرانیەکان دروست تر بێ.

---

٤- یاسانیەکان : - لە " یاسانەوە دەست پێ ئەکات.

٥- پێش دادیەکان :- لە کیومەرسەوە دەست پێدەکات.

٦- کێێ - لەکەیقوبادەوە دەست پێدەکات.

٧- ئاشانیەکان :- لەئەسکەندەری ڕۆمەوە دەست پێدەکات.

٨- ساسانیەکان :- لەئەردەشێرەوە دەست پێدەکات.

بەلام مێژوو نوسە یۆنانی و فەرەنساییەکان، بەم شێوەیە نوسیویانە :

"ئابادیەکان، پێشدادیەکان، ماردۆشیەکان، ئاپاتیەکان، فترت" ملوك الطوائف" کیان، هاخامەنشینیەکان، پارس، سلۆکید، ئاشکانی، ساسانی" بە پێی نوسینی ئەم ڕێکخستنە وا دەردەکەوێ نووسینی مێژوونوسە ئێرانیەکان دروست بێ

کەیومەرس لە ساڵی ( ٣٢٤١ ) ی پ ز دەستی پێ کردووەو[15] ئەو یاساو دادوەریانەی کە لە پێشدا مانایادا لە کتێبی دەساتیردا نووسیویەتی ئەم هات گرنگی پێ داو تازەی کردەوە. بەم شێوەیە سەردەمی کەیومەرس بە سەردەمی، پێش دادیەکان ناسراوە. فیردەوسی ئەڵێت : -

تحسین خدیوی کە کشور کشود سرتا جدارار کەیومرس بود

چو بنشت برتخن بنها دتاج بیندا خت از مرد دهقه خراج

پایتەختی کەیومەرس دەماوەندبووە، لە سەردەمی خۆیدا دروستی کردوە. پاش ئەوەی گەیشتۆتە تورکستان شاری _ بەڵخ ) ی دروست کردوە. ( قاضی ناصر الدین بیضاوی ) ئەڵێت شاری ( ئەستەخەر ) یشی دروست کردوە. نووسەری کتێبی – غنیە - ئەڵێ کەیونەرس – گومری کوڕی یاخت کوڕی نوحە کە عەرەبەکان بە عامر – ناوی ئەبەن،. ( ابن خلدون ) لە بەرگی دوو لاپەڕە ( ١٥٥ ) هەمان ڕای هەیە. مێژوو نووسان لەسەر ئەو ڕایەن کە کەیومەرس ساڵی ( ٢٢١٨ ) پس از هبوط لەدایک بووە گومر و کەیومەرس هەردوو ناوەکە لەیەکەوە نزیکن تەنها پیتی ( س) لە کۆتاییدا زیاد کراوە ئەوەش لە لایەن یونانیەکانەوەیە ئەبێ ئەوەش بزانین کە - کەیومەرس – کوڕی یاخت جۆی نیە بەڵکو یاخت بە بابا گەورەی ئەزانرێ کە چەند ئەوەیەک لە نێوانیاندا هەیە.

١٣ – مادایان – بریتین لەو ئاریانەی کە لە ئەوەی ( ماد ) ی کوڕی یاخت کوڕی نوح – ن، هۆزەکانی ( کورد، ئەلوار، گیلان، دەیلم، خەزران، لەم بەرەیەن، وشەی مادا لە سەدەی نۆهەمی پ ز بلاویوەوە بەلام وشەی کورد زۆر لەو کۆنترە هێرۆدۆت ئەڵێ مادەکان لە بنەڕەتا لە ئەوەی – ئاری – ن. مێژوی پیرنیا لاپەرە ٤٩ وەنووسەری نخبە الازهریە ل ١٣٦ ئەڵێت مادەکان بریتین لە پارس ی کۆن کە عەرەب پێ یان ئەڵێن عەجەم – ئاجام -. ئەگەر ئەم وتەیە ڕاست بێت ئەبێت

---

[15] ئەمە مێژوویەکی گەلێ کۆنە کە زۆر پێشتر بەکار هاتووە. پس اس هبوط – لێرەدا ڕوون نیە مەبەستی نووسە پاش دروست بوونی ئادەمە یا پاش نیشتەوەی لافاوەکەی نوح – ە. " وەرگێڕ "

مادایان لە بەرەی کەیومەرس بەڵام وشەی ماد خۆی هاوار نەکات کە لە خەزەر، تەبەت، دەیلم، جەرامقە[16] لە ناوەی ئاشری کوڕی سام ن کە ئەمانەی هەمووی بە سامی داناوە لە کاتێکدا ئاری بوونی جێگای گومان نی یە.

١٢ – پارسەکان بریتین لەو ئاریانەی کە لە وڵاتی – سفن – یانی پارس نێساتو کەناری دەریای عومان و ڕوباری ئەهواز جێگیر بوون. ڕای مێژوو نوسانی پارس وایە کەپارسەکان لە نەوەی مادی کوڕی یاخت کوڕی نوح ن.لێرەدا ( بەی هەقی ) و ( ابن خلدون ) یەک ئەگرنەوە لەوەی کورد و فارس هەموو هۆزەکانی تری ماد بران[17]. بەڵام لێرەدا بۆمان دەر ئەکەوێ ( بەی هەقی ) لە نووسینەکانیدا هیچ بەڵگەیەکی نی یە کە مادەکان نەوەی ئاشورن چونکە ئەمڕۆ جێ ی گۆمان نیە کە کورد و فارس هەموو هۆزە مادەکان لە ڕەگەزی ئاری – ن

هەندێک وتویانە وشەی ۆارس لە پارسی کوڕی عامروی کوڕی یاختی کوڕی نوح مەوە هاتوە ( عامور – کەیومەرس ) بە عاموری کوڕی بێت جێ ی گومان نی یە کە پارسەکان لە ڕەگەزی ئارین[18]

---

[16] جەرامقە - بریتین لە دانیشتوانی موسڵ کە لە دێر زەمانەوە لەوێ بوون.

[17] ابن خلدون ل ١٥٥

[18] برهان قاطع بەرگی یەک ل ٤ دیباجە

## بەندی یەکەم

### پەیدابوونی کورد

وەك باسمان کرد بە پێی سەرچاوە مێژوویی و پاشماوە دێرینەکان بۆمان دەرکەوت کە کورد لەنە ژادی ئارییە و لە ڕەگەزی( هیندو ئەوروپی ) یە.

لە سەردەمێکی نەزانراوا یانی چەند هزار سالێك پێش زاین بەرەو کوردستانی ئێستا کۆچیان کردوە کەئەکەوێتە خواروی ئەویەستانەوە و بە کوردستان ناو ئەبرێ. هۆزەکانی کورد لە ڕۆژهەلاتە وە بە درێژایی ڕوباری دیجلە لەڕیزە چیاکانی زاگرۆس تا کە نداوی عەرب و کەناری دەریای عومان ڕۆیشتون لەڕۆژ ئاواوە بە درێژایی ڕوباری فورات و کۆمەلە شاخی – تۆرسب – تا سوریاو شام و کەناری دەریای سپی بلاو بوونە تەوە.

وەك بۆمان ڕوون بۆتەوە ئەم هاتنە شەپۆلە یەك لە دوای یەك بوەو یانی بە قۆناغ ولە چەند کاتێکدا نەك بەسەر یەکەوەو لە یەك کاتدا. لێرەدا بە تەواوی بۆمان ڕوون نییە کە لە کوێ وە هاتوون. برێك لە مێژوو نووسان ئەڵێن کورد لە خواروو یا لە سەرووی دەورو بەری دەریای بەلتیکە وە یەکسەر بەرەو قەفقازو ئەرمەنستان هاتوون و لە شاخەکانی( جودی )( ئارارات ) ە وەسەرەو خوار بوونەتەوە. لە ڕۆژ هەلاتەوە تا کەناری دەریای عومان و لە ڕۆژ ئاواوە تاکەناری دەریای سپی بلاو بوونەتەوە. هەندێکی ترلە مێژوو نوسان ئەڵێن کورد لە ڕۆژهەلاتەوە یانی ئاسیای ناوەڕاست بەرەو خواروی دەریای خەزەر هاتوون[١٩] وردە وردە بەدرێژایی زنجیرە شاخی زاگرۆس و دەورو بەری دیجلە بلاو بوونەتەوەو تا نزیك دەریای سپی ڕۆیشتوون. هەروەها بەشێك لەناوچەی ( وان ) یش جێگیر بوون کە پاشماوەی دێرین و مێژینەیان لەم ناوچەدا جێ هێشتوە کەنیشانەی دەسەلاتداری و فەرمانڕەواییانە. پرۆفیسۆر مینۆرسکی ئەڵێت : – لەوانە یەکورد لەڕۆژهەلاتەوە یانی ئێرانی ئیستاوە هاتبن بەرەو ڕۆژ ئاوا تا لە کوردستانی ئیستادا جێگر بوون. لەونەیە لەگەڵ خۆیاندا یا لەکاتی هاتنیاندا تووشی کۆمەڵێك بووبن

---

[١٩] دەریای خە زەر یانی دەریای مازەندەرانی ئیستا

بەناوی – کاردۆ – کەئەم کۆمەڵە لە پاشدا تێکەڵاوی کوردە تازەکان بوون. وا دەر ئەکەوێ ڕۆیشتن و بڵاو بوونەوەی کورد لەسنووری ئێستایان تێپەڕیان نەکردوە، چەند هۆیەکی سروشتی و ڕامیاری ڕێی لێ گرتبێ کەئەمانەن.

١- لەسەرەوە دەریای مازەندران( خەزەر ) و چیاکانی ئارارات.

٢- لەخوارەوە دەریای عومان و دەوڵەتی عیلام.

٣- لە ڕۆژ ئاواوە دەوڵەتی( سۆمەرو ئەکەد ) و لەم لایشەوە دەریای سپی هۆیەی کی تر گل خواردنەوەیان بووە.

وتمان دەوڵەتی( سۆمەرو ئەکەد ) لەبەرئەوی مێژووی کورد بە پێی پاشماوە دێرینەکان لەمێژووی( کلدان، ئاشور، پێش داد )ی کۆنترە. ئەو پاشماوە بەڵگانە نیشانمان ئەدەن کەچەند هۆزێك لەهۆزە بنچینەییەکانی کوردکەبریتین لەهۆزکانی( لۆلۆ، گوتی، کاسی، هۆری ) کەلە ڕیزە شاخەکانی زاگرۆسدا نیشتەجێ بوون لەگەڵ هۆزەکانی( سۆمەر، ئەکەد، عیلام ) هاوسێ و هاوپەیمان بوون. تا ئەم کاتەش ناوی( کلدەو ئاشور ) لەئارادا نی یەو کەیومەرس یەکەم فەرمانڕەوای پێش دادیەکان

کەزەردەشتیەکان بە( ابو البشر ) ناویان ئەبرد هێشتا لەدایك نەبووە. هەر بە پێی ئەم ڕایەئە توانین بڵێین هاتنی کوردەکان و بڵاو بونەویان بۆ ئەم جێگای ئێستا زۆر پێشترە لە هاتنی پێش دادیەکان بۆ وڵاتی پارسی ئیستا. هەرچەندە ڕاو بۆچوونی زۆر هەیە دەربارەی کورد لە ڕۆژهەڵاتە وە یالای ژووروەوەهاتبێ، لەهەر لایەکیانەوە هاتبێ جێی گومان نیەڕاستە. لای ژوورووە بەرەو شاخەکانی ئارارات و لەوێشە وە بەرەو خوار بوونەتەوە بە دوویەش. بەشێکیان لەدەورو بەری فورات وبەدرێژایی شاخەکانی تۆرس تا کەناری دەریای سپی ی سوریا شام بڵاو بونەتەوە. بەشەکەی تر بەدرێژایی ڕیزە چیاکانی زاگرۆس دەوری دیجلە و تا کە نداوی عەرەب و کەناری دەریای عومان ڕۆیشتوون، یاخود لەبەشی ڕۆژهەڵات یان ئاسیای ناوەڕاست بە رەو ڕۆژئاواو خواروی دەریای مازەندەران وناوچەی ئازەربایجان و ناوچەی ئەسفەهان هەمەدان و کرماشان و لوڕستان جێ گیر بوون بەشی یەکەمیان یاخود ئەوانەی لای سەرەوە هاتوون پێ یان وتون – گودی – یا –

گوتی – یانی خەڵکی شاخی جودی – ئارارات – کەعەرەب پێ یان ئەڵێن – جودی – بەشی دوەم پێ یان ئەوتن( کورتی – کوردی ) لە پاشدا پارسەکان پێ یان وتون – سیرتی

[20] وەك هیرۆدۆت ئەڵێت لەسەدەی نۆھەمی پێش زاین خۆیان ناو ناوە( ماد)( مادی گەورە)( مادی پچووك – سەردەمی کەیقوباد. لەسەدەی نۆھەمی پێش زاین فەرمانڕەوای ئاشورەکان( سە لمانانزاری دووم ) لە گەڵیاندا کە وتۆتە ئاکۆکی.

زۆربە ی مێژوو نووسە کان بە شی یەکەمی کورد ناو ئە نێن( کوردی ڕۆژ ئاوا ) یا( ئاراراتی ) بە شی دووم ناو ئە نێن( کوردی ڕۆژ ھە ڵاتی یا( مادایان ).

پروفیسۆر مینورسکی – ھە ر ئەو ڕایەی سە روەی ھەیە ئێمەش بەھەمان شێوە ئەڵێین بەشی یەکەم یانی( کوردی ڕۆژ ئاوایی ) یا ئارارتی و بەبەشی دووم ئەڵێن (کوردە ڕۆژھەڵاتیەکان یا( مادایان ).

تا ئێستا ڕوون نی یەئەم دوو کۆمەڵە کامیان زووتر ھاتوون بەڵام لەمێژووی( سۆمەرو ئەکەد ) بەشی یەکەمیان زیاتر باس ئەکرێت.

برێك لە ڕۆژھەڵات ئاسەکان ھاتنی دووم لەسەدەی دەیەمی پێش زایین ناو ئەبەن.

ئەگەر ئەم ڕایەڕاست بێت ئەوا جیٚ ی گومان نی یەکە( گوتیەکان ) یانی ئاراراتیەکان لە پێش( کورتیەکان ) یانی ڕۆژ ھەڵاتیەکاندا ھاتوون.

---

[20] سیرتی بەھۆی ئازایەیی و درندەیی و ئازاردانی خەڵك و بە دەستەڵاتیانەوە پیٚ یان وتوون سیرتی کە( سرت ) لەھەورامانی دا بەمانای( درك ) دێت.

## بەندی دووەم

### دەربارەی رابووردوی کورد- بەشێوەیەی گشتی

بەڵگە مێژوویی و پاشماوە دێرینەکان وا دەری ئەخەن کەکورد بە پێنج سەردەم دابش ئەبێت.

١- سەردەمی پێش مێژوو : لەچەند هەزار ساڵی پێش زاینەوە تا ساڵی( ٣٦٠٠ ) پ ز کە فەرمانڕەوایی " ئەرامسێن کوری سارگۆن " ی یەکەم بەدەستی( گوتی ) ئاراراتی لەناوچووە لێرەوە زنجیرەی فەرمانڕەوایی( گوتی ) دەست پێ ئەکات کەزیاتر لەدوو سەدە پێش( سۆمەرونەکەد ) فەرمانڕەواییان کردوە. تا ئێستا بەڵگە ی روون و ئاشکرامان نی یە.

٢- ساڵی( ٣٦٠٠ تا ٨٥٣ ) پ ز یانی سەردەمی کورد لەگەڵ( سۆمەر، ئەکەد، کلدی، ئاشور، عێلام ) لەکاتی فەرمانڕوایی( ئەرامسێن ) تا پەیدا بوونی کەیقوبادی کورد( سەردەمی دروست کردنی دەولەتی ماد ) کە پارسەکان لەم کاتە دا بەشێك بوون لەماد.

٣- ساڵی( ٨٥٣-٥٥٠ ) پز سەردەمی فەرمانڕەوایی مادەکان تا پەیدا بوونی کەیخوسرەوی گەورە( سیروس الاعظم ) دەولەتی ئێران لەسیروسەوە دەست پێ ئەکات کەمادەکان لەم کاتەدا بەشێك بوون لە دەوڵەتی ئێران.

٤- لەساڵی( ٥٥٠ ) پ ز تا سەردەمی ئیسلام — لەسەردەمی کەیخسرەوی گەورە تا پچرانی کوردەکانی رۆژ ئاوا لەئێران. لەم کاتەدا کورد جار جارە فەرمانڕەوایی گرتۆتە دەست بەڵام زیاتر ژێر دەستەبووە.

٥- کورد لەسەردەمی ئیسلام بەدواوە( لێرەدا باسەکەمان تەنها لەسێ دەورەدا درێژە پێ ئەدەین کەدەورەی دومە، سێ یەم ، چوارمە .

# کورد لە( ٣٦٠٠ – ٨٥٣ ) پ ز

لەسەردەمی فەرمانڕەوایی( سارگۆنی یەکەم )ی ئەکەد هیچ باسێك دەربارەی هۆزە کوردەکان نەبوە بەلام کاتێ( ئەرامسین )ی کوڕی فەرمانڕەوایی گرتە دەست پەیوەندی پەیدا بوو لەنێوان ئەکەدو کوردەکاندا. لەسەرەتای سەدەی( ٣٦ ) پ ز ئەرامسین شەر بەهۆزی( لۆلۆ ) ئەگێرێ و بەسەریاندا زاڵ ئەبێت. پاش ماوەیەکی کەم( ئەرامسین ) بەدەستی( گوتی ) یەکان کەهاوڕەگەزی لۆلۆکانن تیا ئەچێ و فەرمانڕەوایی بابل( سۆمەر و ئەکەد ) ئەکەوێتە دەست( گۆتی ). لەسەردەمی فەرمانڕەوایی( گۆتا ) پێنجەم فەرمانڕەوایان( عیلامە ) کانیش ئەکەونە ژێردەستیانەوەو دەبنەباج دەر. لێرەدا بۆمان دەرئەوێ لە سەردەمی سارگونی( یەکەم دا و پێش ئەویش کورد هەبووە بەلام لەبەرئەوەی ناکۆکی و بەربەرەکانی نەبووە لەنێوانیدا لەمێژووی( سۆمەر و ئەکەد ) داباسی نەکراوە. پێش ئەرامسین لۆلۆکان لەسەردەمی سارگۆنی یەکەمدا فەرمانڕەوا بوون، کە( لاسیراب ) فەرمانڕەوا بوە لەو کاتەدا. پرۆفیسۆر- سپایزاریش - هەمان ڕای هەیە[٢١]. لەکاتی هاتنی سارگۆنی دوەم( ٢٨٠٠ )پ ز کۆتایی هاتووە بەفەرمانڕەوایی گوتی و لەولاتی بابل دەری کردون هەتا گێراونیەتەوە بۆ بناری زاگرۆس، شوێنی پێشوی خۆیان. ولاتی مادەکانی داگیر کردوەو هەموو( مادستان و کوردستان )ی خستۆتە سەر بابل و ماوەی سێ سەدە – مادو کوردیانی ( ڕۆژهەلاتی و ئاراراتی ) باج دەری بابل بوون { لێرەدا دەرئەکەوێ کەمادەکان لەسەدەی( ٢٨ )ی پ ز لەناوچەی مادستان بوون } /. سالی( ٢٥٠٠ )پ ز لە کاتی وەرگرتنی فەرمانڕەوایی – چعاك – پێش دادیەکان یانی( ماد + کورد ) باجیان بە کلدانیەکان داوە تا لەئەنجامدا – چعاك – دەستی بەسەرا گرتوون.( دونگی ) فەرمانڕەوای سۆمەر لەسالی( ٢٤٥٠ )پ ز هێرشی کردۆتە سەر عیلام و لۆلۆکانی خستۆتە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە. لەسالی( ٢٢٥٨ )پ ز کە دەولەتی ئاشورییێك هات تا سالی( ٢١٩٢ ) پ ز بەهیچ جۆرێك باسی کورد نەکراوە. ئەرۆژهەلاتی و ئەئاراراتی بەلام کەیومەرس سالی( ٢٢٤١ )پ ز دەولەتی پێش دادی پێکك هێناو شاری دەماوەندی کردۆتە

---

[٢١] مێژوی کۆنی ڕۆژهەلاتی نزیکك ل ١٨٦ وە هوەکانی مێسوپۆتامی ل ٩٩.

پایتەختی خۆی دەورو بەری ساڵی( ٢٦٠٠)پ ز زوحاك لەبابلەوە سوپای بۆسەر پیشدادیەکان هیناوەو لەدەو روبەری شاری( ئەستەخەر)ی پارس لەگەڵ جەمشیدی فەرمانڕەوای پێش دادی بەیەکدا هاتون لەئەنجامدا بەسەریای کەوت وفەرمانڕەوایی جەمشیدی پێش دادی کۆتایی هات. لەسەردەمی فەرمانڕەوایی "کۆدۆ ناخونتا "ی یەکەم فەرمانڕەوایی عیلامەکان کەبەسەر زوحاکدا سەرکەوتن. توانیان کۆتی دیلیەتی بپچڕن بەیارمەتی فەرمیدونی پێش دادی و کاوەی مادی ساڵی( ٢١٩٢)پ ز ساڵی( ٢٠١٨)پ ز فەرمانڕەوایی ئاشوروکلدەکان - نینە - لەشکرێکی گەورەی هێنایەسەر وڵاتی مادو فەرمانڕەواکەی گرت و لەسێدارەی داو هەتا دەوروبەری شاری -بەلخ -ی گرت. بەڵام نەیتوانی قەڵای شارەکەبگرێ تا لەپاشدا شمارەی( سەمیرامیس) گرتی. لەنێوان هۆزەکانی ئاسیای ناوەڕاست لەکەناری رۆژهەڵاتی دەریای ڕەش چەند بەگژدا چونێك رویدا لەنێوانیاندا لەسەدەکانی( ١٨، ١٩)ی پ ز لەم کاتەدا هێزێکی بچووك لەڕەگەزی ناری( هیندو ئیرانی)، لەلای سەرەوە پەیدا بوو تا رۆژ ئاوای کوردستانی ئێستا هاتن و جێ گیر بوون. خاوەن دەسەڵاتێك بەناوی( میتانی) یەوە دەوڵەتێکی پێك هێنا کە پایتە ختەکەی لەنزیك ڕوباری خاپورەوە بوو، رۆژ هەڵات ناسەکان ئەلێن وئەم کۆمەڵەش کوردن. لەدەورو بەری ساڵی( ١٧٦٠)پ ز کوردەکانی( کاسی) لەگەڵ هۆزە هاورەگەزەکانی خۆیان( گوتی - لۆلۆ) لەژێر فەرماندەی( خاندیژ)ی کاسی لەشکرێکی گەورەیان بۆ سەر وڵاتی کلدانەکان هێناوداگیریان کردو دەوڵەتێکی بە دەسەڵاتیان لە( لاگاش) دامەزراندا کەبە دەوڵەتی( کاردۆینا) بەناوبانگ بووە یانی دەوڵەتی کوردەکان. کەشەش سەدە بەردەوام فەرمانڕەوا بوون لەو کاتەدا وڵاتی ماد لەژێر سایەی دەوڵاتی ئاشوردا وئەژیاو باج دەریان بوون بەڵام لەنزیك شاری( بەلخ) دەوڵەتێکی بچووکك لەژێر دەسەڵاتی( تووسە) ناوێکدا کەیونانیەکان - دیوکس - یان پێ وتوە باجی نەداوەو سەربەخۆ بوون. ئەو تووسەیەنە( تووسەی کوڕی فەرییەرزی مادی )یەکە کەیقوباد فەرمانڕەو بوە نە( تۆش کوڕی نەوزەر)ە. لەسەدەی( ١٦)پ ز میتانی یەکان فەرمانڕەوایی هەموو کوردستانیان کردوە لە ڕۆژ هەڵاتەوە تا( ئاریاخا) یانی کەرکوکی ئێستا و سنووری وڵاتی ئاشوورو دەشتی هەولێر. ئەو پاشماوە دێرینەی کە لە ساری کەرکوك دۆزراوەتەوە مێژووی فەرمانڕەوایی میتانی ئەگێڕنەوە سەدەی( ١٥- ١٦) پ ز وا دەرئەکەوێ دانیشتوانی

کوردستانی رۆژھەڵات باج دەری دەوڵەتی کلدانی و ئاشوور بوون. لەم سەردەمەدا ئاژاوەو دوویەرەکی و ناکۆکیەکی بەتین لەکوردستاندا بووە بەڵام لە ڕووژی ئاین و خوو ڕەوشتی کۆمەلایەتیەوە یەك بوون. سەرەتای سەدەی( ١٤ ) پ ز میتانیەکان هێرش دەکەنە سەر( هیتی ) یەکان لە سوریا بەھۆی شەڕۆشۆڕی ئەمانەوە وردە وردە دەسەڵاتی ئاشوورریەکان پەرە ئەسێنی.( ئادادنێراری ) فەرمانڕەوای ئاشور سالی( ١٢١٠ – ١٢٨١ ) پ ز ئەنووسێ سوپای( کاس – گوتی – لۆلۆ سۆباری ) م شکاند.( پاشماوەیەکی دێرین )( سەلماتازاری یەکەم ) فەرمانڕەوای ئاشورەکان سالی( ١٢٨٠ ) پ ز لەگەڵ گوتیەکان بەیەکدا هاتووە. هەروەك خۆی ئەلێ دەری سەریەکی زۆری بە سەردا هێناون. بەهۆی هێرشی یەك لەدوای یەکی عێلامەکانەوە بۆسەر خاکی بابل و پەل بلاو کردنەوەی ئاشور وردە وردە دەوڵەتی گاردۆنیای کوردی لاواز بووھە. لە سەردەمی فەرمانڕەوایی " تەگلاس نین "ی ئاشوردا سالی( ١١٧١ ) پ ز دەوڵەتی چەند سەد سالەی – کاردۆنیا- لە ناو ئەچێ بەھۆی چەند ڕوداوێکەوە کەلامان ڕوون نی یە. کوردەکانی کاسی ئەگەڕێنەوە بۆ شاخەکانی( زاگرۆس ) یانی لوڕستانی ئەمڕۆ مادو لۆلۆکان ئەکەونەوە ژێر دەستەلاتی بابل ەوە. لە سالی( ١١٠٠ )پ ز تەگلات پالازاری یەکەم. فەرمانڕەوای بەدەسەلاتی ئاشور چەند جارێك لەگەڵ پارس و مادو ھۆزەکانی لۆلۆدا کەلە ژێر دەسەلاتی بابل بوون بەیەکدا هاتوون و گەلێ جار باجی لەمادو پارسەکان سەندوە. لە خوارەوەش تا کەنداوی عەرەبی باجی لێ سەندون لە نێوان سالەکانی( ١٠٦٨ ) پ ز ئەم ئاشوریە مل هوڕانە شەڕیشیان بە کوردەکانی شاخی( ئازۆ )[٢٢] فرۆشتوە. تا لە ئەنجامدا شکاون و سەریان شۆڕ کردوە سەدەی( ٩ ) پ ز( ئاشور ئازیرپال )ی فەرمانڕەوای ئاشوور گەلێك زوڵم و زۆر ئەکات لەکوردەکانی زاگرۆس و ئەیان چەوسێنێتەوە. بۆیە ئەوانیش لێ ی هەلئەگەڕێنەوەو هانا ئەبەنە بەر بابلیەکان ئەیا نخەنە ژێر دەسەلاتیانەوە.

ئەم کابرایەچوار جار لەگەڵ کوردەکانی زاگرۆس بەیەکدا هاتووە جاری یەکەم سالی( ٨٨٤ ) پ ز بووە. کە لەشکری بۆ سەرخاکی لۆلۆ هێناوە بێ ئەنجام گەڕاوەتەوە.

---

[٢٢] درایڤواری ڕۆژھەلات ناس ئەلێ: شاخی ئازۆ بریتیە لە هازۆ یانی چیای ساسۆنی ئێستا.

جارێکی تر لەژێر سەرکردەیی( سەلمانازار)ی کوڕی دا لەشکر ئەنێرێتە سەر خاکی لۆلۆە چەند شارێك داگیر ئەکات.

سوپای لۆلۆکان بە سەرکردەیی(ئامێخا ) ڕوو ئەکەنە شاخ و دوور ئەکەونەوەناشوریەکان بەهیلاك ئەچن و سەرئە نجام ڕێکەوتن نامەیەك مۆر ئەکەن. هەر ئەم سەلمانازارە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی خۆیدا یانی لە کۆتایی سەدەی( ٩ ) دا جارێك بەرەو کوردستان ئەکەوێتە ڕێ. بەنیازی شەڕکردن لەگەڵ پارس ومادا.

دیسانەوە ساڵی( ٨٥٩ )پ ز هێرشێکی هێناوەتە سەر ویلایەتی(زاموا ) وتاوەکو تاسلوجە و گلەزمردەی گرتوە. هەروەها ساڵی( ٨٨٤ )پ ز سوپایەکی تری ناردۆتە سەر ویلایەتی( نامری ) یانی ناوچەی پشدەرو سەردەشت. فەرمانڕەوای نامری ڕای کردۆتە شاخ و ناوچەکەی بەجێ هێشتوە.

## کورد لە سالی ٨٣٥ – ٥٥٠ پ ز

سالی( ٨٥٣ )پ ز کەیقوبادی کورد کە یونانیەکان( ئارباس )ی پی ئەلێن فەرمانڕەوایی گرتە دەست و سەر لە نوێ دەولەتی مادی زیندوو کردەوە. لەڕووی سوپایی و ئیدارییەوە پەرەی پێ داوە. ئەم سەرکردەمەزنە( پارس و کورد )ی لە دیلیەتی و چەوسانەوە رزگار کردوە. شاری( هەنگمادان ) –هەمەدانی ئێستا – ی کردۆتە پایتەختی خۆی. یونانیەکان بەداگیر کاری ئەینەواو لەناو بەری دەولەتی ئاشوری ناو ئەبەن[23].

تەکلات پالازاری دوەم فەرمانڕەوای ئاشورەکان لە سالی( ٧٤٢ )پ زتووشی شەڕێکی سەخت و دژوار دێت لەگەلٚ مادەکانداو( ٦٠ )هەزار دیل بەچەك و هەموو دەسکەوتێنەوە دەباتەوە پایتەختی خۆی. هەروەها بەربەرە کانی و شەڕو شۆڕ دەرگا بەم گەلە بەرنەداو هەمیشە سەرگەرمی شەڕبوون. سارگۆنی سێ یەم فەرمانڕەوایی ئاشور دوو جاری تر لەگەلیانا جەنگیوە جاری یەکەم سالی( ٧١٥ )پ ز – دخۆ – کە یونانیەکان – دیاکۆ –ی پێ ئەلێن[24] سەر کردەی سوپای ماد بووە بە دەستی سارگۆن بەدیل ئەگیرێ و دوور ئەخرێتەوە بۆ شام لە ئە نجامدا( ٤٨٢ ) کەس لە ناودارانی کورد لەگەلیا دوور ئەخرێنەوە.

جاری دەوم کەهێرشی هێنایە سەر کوردستان ناچاری کردن و خستینە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە( ٤٥ ) کەس لە سەرکردە خێلەکانی کورد برەوایان بە سارگۆن هێنا کە خواوەندیانەو بڕیاریاندا کەباج دەری بن.

سالی( ٨٠٠ )پ ز یانی سەدەی هەوتەم یەکێك لە فەرمانڕەوا ناودارەکانی ماد بەناوی – کاردۆنیا – تووشی شەڕێکی دژوار ئە بێت لەگەلٚ کلدانیەکاندا کە سەنهاریبی کوڕی سارگۆن فەرمانڕەوایان بووە، بەسەر کلدانەکاندا سەر ئەکەوێت و شاری بابل داگیر ئەکات و زۆربەی خەکەی بەدیل ئەبات.

---

[23] ملل قدیمە مشرق ل ١٥٩ تا ١٦٢ وایینە سکندری ل ١٤٥

[24] لە سەرچاوە کۆنەکان و پاشماوە دێرینەکانەوە وا دەر ئەکەوێ کە( کواکسار باکیاکسار )کە ناوی راستی( هواکستال )ە هوفشتر بۆتە هۆی لەناو بردنی و کۆتایی هێنان بە دەولەتی ئاشور. پیرینال٥٢ وتەئریخی عمومی رضا ئەخری ل( ٨٣ )وملل قدیمە مشرق ل( ١٥٨– ١٦٤ ) وئەحمەد رەفیق بەرگی یەکەم ل ٢٦٦– ٢٦٩ و مێژووی ئەمین زەکی بەگ و...هتد

جاریکی تر ئەگبەتی و شەڕو شۆڕو ماڵ وێران کردن دەست پێ ئەکاتەوە سەردەمی( ئاسارهادۆن )ی کوڕی سەنهاریب ناوداری ئاشور ساڵی( ٦٨١ )پ ز لو هەرەتی دەسەڵاتدا مادو پارس ئەخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی بەم شێوە سەردەمی( ئاشور پانیپال )ی کوڕی و( ساراکۆس )ی کوڕەزایشی هەروا بەدیلی و ژێر دەستەیی مانەوە. هەل بۆ کۆمەڵێك لە( سکا ) یا( سیت )ەکان ڕێك کەوت و لای ژووروی وڵاتی ئاشوورەوە هێرش ئەهێنن و ئاسیای بچوك داگیر ئەکەن و چەند ساڵێك بە تاڵان و بڕۆوە خەریك ئەبن. تابە شێوەیەکی دیار دەسەڵاتی ئاشوریەکان کەم ئەبێتەوە.( پیرنیا ) لە لاپەڕە( ٥٢ )دا ئەڵێت : لەو کاتەدا فەرمانڕەوای ماد( توس ) لە دنیا دەرئەچێ وفەرییەرزی کوڕی ساڵی( ٦٥٥ )پ ز دەبێتە فەرمانڕەوا کە پارسەکانیش لەم کاتەدا سەربە دەوڵەتی ژێر دەستەیی ماد بوون. ساڵی — ٦٢٥ —پ ز فەرییەرز خولیای ئازادی و ڕزگاری ئەکەوێتە سەری و ئەکەوێتەوە شەڕ لەگەڵ ئاشوریەکان. لەئەنجامدا لەشکرەکەی ئەشکێ وخۆیشی ئەکوژرێ.(کواکساری) کوڕی سەرلەنوێ دەست ئەکات بەکۆکردنەوەی لەشکرو بەهێز کردنی بەنیازی سەندنی تۆڵەی خوێنی باوکی و هێرش دەباسەرئاشوریەکان و تا شاری ئەینەوا ڕاویان ئەنێن و ئابلۆقەی شارەکە ئەدات. لەم لایشەوە سیتەکان هێرش دەهێننە سەر وڵاتی ماد بۆیە کواکسار دەست لە ئابلۆقە شار هەڵئەگرێت ودەگەڕێتەوە سەرئەمان. بەهۆی ئەبوونی دەرامەت وهیلاکی سوپاکەیەوە بە دەستی ستیەکان ئەشکێ وماوەی( ٢٨ ) ساڵ لەوڵاتی — ماد — دا ئەمێنێتەوە. کواکسار پیاوێکی ژیرو دنیا دیدە بووە. هەمیشە کارەکانی بە ڕاوێژو پرس بووە. میوانداریەکی گەورە ساز ئەدات بۆ سەرکردەو پیاو ماقوڵانی ستیەکان لەو شەوەدا توانی هەمویان بگرێ و بیانکوژێ و لە پاشدا سوپاکەیانی زۆر بەئاسانی لە وڵاتی لادا دەرکرد.

ئەم پیاوە ژیرە سەر سەختە خولیای تۆڵەی خوێنی باوکی گیژی ئەدا بیری لێ ئەکردەوە هات پەیمانێکی دۆستانەی لەگەڵ( ئاپۆ پۆلاسار )ی فەرمانڕەوای بابل دا بەست و( ئامێشی ) کچیشی لە( بەخت ئەزەری ) کوڕی مارە کردبۆ زیاتر پتەوکردنی دۆستایەتی.سوپایەکی بەهێزی( مادو پارس و عیلام و بابل وعەرەب )

هێرشیان کردە سەروڵاتی ئاشوروشاری ئەینەوایان داگیر کرد. سارکۆسی تازە فەرمانڕەوای ئاشور کوڕی( ئاسور ئازیزپاڵ ) کەزانی بەتەنگ هاتومو هیچدەرفەتیکی نیە

فەرمانی دا قەڵاکە بەخاوو خێزان و دەست و پێوەندەوە بسووتێنن. ئابە و شێوەیە وڵاتی ئاشور ساڵی( ٦٠٦ ) پ ز لە نێوان دوو دەوڵەتی هاوپەیمانی مادو بابل بەش کراو کۆتایی بە دەستەڵاتداریەتی ئاشوور هات[٢٥]. میستر هۆل لە مێژوی کۆن و رۆژهەڵاتی نزیکدا ل ٥١١ ئەڵێت ئاشوربانیبال دوا فەرمانڕەوای ئاشوریەکان – مانی [٢٦]- یەکانی خستۆتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە بەلام توانای ئەوەی نەبووە لەگەڵ کوردە ئازاکاندا بجەنگێ. دەوڵەتی ماد بەئاسانی توانی ئەرمەنستان وکاپادۆکیە کە لە رۆژهەڵاتی ئاسیای بچووکدا بووە بیگرێ و بیخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە هێرشێکی بردە سەر( لیدە ) کان و ماوەی ٦ ساڵی ڕەبەقی خایاند فەرمانڕەوای لیدەکان( ئالیان )( ئارتی تسپی ) کچی دابە( ئازیدەهاکی کوڕی کواکسار. کواکسار ساڵی( ٥٨٤ ) پ ز کۆچی دوایی کردو بخت ئەزەری بابلی زاوای ساڵی( ٥٦١ ) پ ز لەدنیا دەر چووە.

---

[٢٥] پیرنیا ل ٥٣. تاریخی عمومی رضا ئەخوی ل ٨٢. هۆزە کۆنەکانی رۆژهەڵات ل ١٥٨، ١٦٤، تەئریخ عمومی ئەحمەد رەفیق ب ٣٦٦، ٣٦٩. مێژوی ئەمین زەکی.

[٢٦] مانی بریتین لە دانیشتوانی دەوروبەری دەریاچەی ورمێ و ئازەربایجان کە هاوڕەگەزی کوردە مادەکان.

## کورد لە ساڵی – ٥٥٠ – پ ز
## تا سەردەمی هاتنی ئیسلام

کە یخوسرەوی دووەم ( کورش ) ساڵی( ٥٥٨ ) پ ز فەرمانڕەوایی پارسەکانی گرتە دەست ولە پاشدا( ئانزان – عیلام ) یشی خستەژێر دەسەلاتی خۆیەوە، مادەکان نارەزاییەکی زۆریان دەربڕی لە فەرمانڕەوایەتی کورش و بەربەرەکانێ یان ئەکرد. کورش لەشکرێکی گەورەی هێنایە سەریان و شکاندیان و کورش گەڕایەوە. ئەمجارەیان بە لە شکرێکی گەورەترو ڕقێکی ئەستوورە وەبۆ جاری دوەم پەلاماری دانەوە. تاتوانی دەوڵەتی ماد بڕۆخێنێ و تەفرو تونایان بکات و شاری هەمەدانی گرت. خۆی بوە فەرمانڕەوای پارس و ماد، لەم کاتەوە دەوڵەتی ئێران دەست پێ ئەکات کە ئێران بە مانای وڵاتی مادو پارس دێت. سەدەیەکیش پاش ڕوخاندنی دەوڵەتی ماد بەئێرانیان و تومماد تەنانەت شەڕی ئێران و یونان بەشەڕی مادو یونان ناو براوە. پیرینا لاپەڕە ٥٨. سنووری ئێران لەم کاتەدا لە خوارەوە – قزل ئیرماق – ولە دەریای خەزەرەوە تا دەریای عومان بوە. کورش هێرشی بردوە سەر ئەرمەنستان و ئەوێش ی داگیر کردەوە بوە بە بەشێك لەئێران. هێرۆدۆت کورش بە فەرمانڕەوای پارس ناو ئەبات و( نابنائید ) بە فەرمانڕەوای بابل. وتەکەی هیرۆدۆت ڕاستە چونکە کورش پێش ئەوەی هێرش بباتە سەر ماد فەرمانڕەوای پارس و عیلام بوە.( پیرینا ل ٦١ ). کورش ساڵی( ٥٤٦ ) پ ز وڵاتی لیدی خستە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە پەلاماری ئاسیای بچووکشی داو ساڵی( ٥٤٥ ) پ ز ئەو ناوچەیە چووە ژێر دەسەلاتی‌یەوە لە هەموو هێرشەکانی کورش بەرەو سەرەوەو رۆژهەلات و ڕۆژ ئاوا سوپای مادو پارس و عیلام شان بەشانی یەك بوون جەنگیون.

ساڵی( ٥٣٨ ) پ ز کورش هێرش دەباتە سەر بابل و نابۆنائید بەدیل ئەگری و بابلیس دەکاتە بەشێك لە دەسەلاتداریتی ئێران و پەلیش بەرەو فینیقیە و فەلەستین ئەهاوێ و ئەوێش داگیر ئەکات. ساڵی( ٥٢٩ ) پ ز لەدنیا دەرچووە ماوەی دوو سەدە هەمووکوردەکانی رۆژهەلات و ڕۆژئاوا مادو گوتی تا هاتنی ئەسکەندەری ڕۆمی لەژێر دەسەلاتی ئێراندا بوون. لەکاتێکدا کەیخسرەوی بچووك – کورشی بچوك – والی( کپادۆکیا ) بووە حەز ئەکات خۆی فەرمانڕەوایی بکات و ئەردەشێری برا گەورەی دەربکات. لەگەڵ یونانیەکان ڕێك ئەکەوێ لەسەر چەند مەرجێك و( ١٣ ) هەزار کەس بەکرێ بەسەرکردایەتی کلارخوس

ساڵی( ٤٠١ ) پ ز بەم سوپایەوە و هێزێکی گەورەی کیادۆکیاوە بەرەو بابل ئەکەوێتە ڕێ لە نزیك( خان ئەسکەندەریە ) لە ژوروی بابل لەگەڵ سوپای ئەردەشێری برایدا بەیەکدا دێن و شەڕێکی سەختێ خوێناوی ڕوونەدات. هەرچەندە سوپای کەیخسرەوی بچووك سەر ئەکەوتن بۆ سوپای یونان بە دەسیسەی( تیساندین ) لەناو ئەچن( ١٠ ) هەزار کەسیان ئەمێننەوە.گەزنەفون بەسەر کردە هەڵئەبژێرن. ئەم سوپا دەهەزارکەنارێ دەریای ئیسلامبولەوە تێ پەڕیون و دەریایان جێ هێشتوە. لەکاتی گەڕانەوەیاندا لە کوردستان لەدەربەندی زاخۆ توشیان ئەبێت بەتوشی هێزێکی کوردەوە کە بەکاردۆشی ناو ئەبران.

کوردەکان شپرزەیان ئەکەن و سوپاکەیان پەرش و بڵاو ئەکەنەوە تا نزیکی ئەرابزون دوایان ئەکەون. گەزنەفون لە کتێبی( ئانابازیس ) دا ئەنووسێ : ئەم کاردۆشیانە سەریان بۆ فەرمانڕەوایی ئێران شۆڕ نەکردوە. تەنانەت فەرمانڕەوایەکی ئێران بە سوپایەکی( ١٢٠ ) هەزار کەسیەوە هێرش ئەکاتە سەریان لە ئەنجامدا سوپاکەی تێك ئەشکێن و ئەگەڕێنەو. بەڕای گەزنەفون کاردۆشیەکان سەر بە ئەردەشێر بوون. سەرپێچی فەرمانیان ئەکردوە. دیسانەوە ئەڵێن وڵاتی( کاردۆك ) تا بۆتنی ئێستا پەرەی سەندووە لەو ساتە بەدواوە ڕوباری دیجلە و دەورو بەری کێوی( جودی ) پێ یان وتوە( کوردمان ) یا( کارداك ) زۆربەی مێژوو نووسان بە کوردوان ناویان بردوە و لە زمانی ئارامیدا بە مەڵبەندی کاردۆ بەناوبانگ بووە.( کوردمان ) یا دارای سێ یەم پێش ئەوەی فەرمانڕەوایی ئێران بگرێتە دەست والی ئەرمینیاو وڵایەتی کوردوان بووە تا ساڵی( ٣٣٨ ) پ ز بەهۆی زیرەکی و لێ هاتوویییەوە لە پلەی والیەوە بۆتە فەرمانڕەوا. سنووری کوردان لەم کاتەدا لەزێی گەورە تا سەرچاوەی هاخامەنشینی لەلایەن ئەسکەندەرە وە وڵاتی کوردەکان( ماد – کاردوان ) کورتی و گوتی کەوتۆتە ژێر ئەم پەلامارە. سلەئاوکۆس یەکی لە سەردارانی یۆنان ساڵی( ٣٢٣ ) پ ز فەرمانڕەوای ئەم ناوچەیە بووە کە بە درێژایی یەك سەدە کوردەکان لەم ماوەیەدا خەریکی ڕاپەڕین و پەلاماردان بوون. سەرەتای سەدەی دوەمی پێش زاین بەشی سەرووی کوردستان بە یارمەتی یەکەم فەرمانڕەوای ئەشکانی( مهردار ) کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئەرمەنەوەو بەشی خواروی کوردستانیش وردە وردە سەرەتای سەدەی یەکەم کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئەرمەنەوە کە مەرکەزی شاری( ئامەد ) یانی( دیاربەکر )ی ئێستا بووە. مێژوو نووسی بەناوبانگ ؟( ئەسترابۆن ) لە باسی ئەرمەنەکاندا ئەڵێت : کوردەکان

زۆر بە سەلیقەو خاوەن پیشەن لە کاری هەندەسەو پیشەسازی دا شارەزان فەرمانڕەوای ئەرمەن تیگدران سوودی لە سەلیقەیان وەرگرتوە. سالی( ٣٦ ) پ ز کوردستان تووشی پەلاماردان بوومو لەلایەن( ئەنتوان )ی سەرداری رۆماوە کوردستان داگیر کراوە، لە شەڕێکی گەورەدا لەگەل سوپای ئەشکانیەکان تێك ئەشکێ هاوکاری ئاشکانیەکان( مادی بچووك ) لە ناوچەی ئازەربایجان لەم شەڕەدا لە تالان و بڕۆو دەسکەوتی شەر بێ بەش ئەبن و دڵ پەشاو ئەبن لەگەڵ ئاشکانیەکاندا. بۆیە بەدزیەوە هانی سەرداری رۆما( مارك ئەنتوان ) ئەدەن کەجارێکی ترهێرش بکاتەوەو یارمەتی دەری ئەبنە. رۆمەکان بەنیازی تۆلەوە سالی( ٣٤ ) پ ز هێرش ئەکەنەوە و ئەرمەنستان داگیر ئەکەن. لەم لایشەوە فەرمانڕەوای ئاشکانیەکان( فەرهادی چوارەم ) بە سوپایەکی گەورەوە هێرش ئەباتە سەر مادی بچووك و پاش شەڕێکی خویناوی ئەیگرێ ولەوێشەوە بەرەو ئەرمەنستان ئەکەوێتە رێ و دەستی بەسەردا ئەگرێ لەکەسانی نزیك خۆی سەرپەرشتی کارانی بۆ دائەنێ. سالێك پێش لە دایك بوونی مەسیح فەرمانڕەوای ئاشکانیەکان( فەرهادی پێنجەم ) پەیمانی دۆستایەتی لەگەڵ رۆمەکان بەست و کوردستان و ئەرمەنستانی خستە سەر دەسەلاتدارێتی رۆم. لە کۆتایی سەدەی یەکەمی زاین دا( ئالان ) یەکان و گورجیەکان هێرش دەکەنە سەردەسەلاتی ئەرمەنستان و کوردستان و ولاتی مادی بچووك تووشی دەردی سەری و تالان ئەبن. فەرمانڕەوای ئەشکان لەم دەست درێژیە بێ دەنگ بومو هیچ بەرگری نەکردوە. سالی( ١٦١ )ی زاینی بلاشی سێ یەم فەرمەنڕەوای ئەشکانیەکان ئەرمەنستان ئەگرێ بەلام رۆمەکان بەسەرکردایەتی کاسیوس توانیان بەشی زۆر ئاوایی دەولەتی کۆردۆ، ولاتی( ئەرمەن ) وەربگرنەوە و سوپای ئەشکانی بشکێن. سالی( ٢٤٢ ) زاینی کوردەکان بە یارمەتی دەولەتی ئێران توانیان سوپای( والرین )ی فەرمانڕەوای رۆمەکان بشکێنن و سەرکردەی لەشکرەکەی بکوژن لەپاشدا دەسەلاتدار بوون سالی( ٤٩٥ ) ك دەولەتی ئاتابەکانی کود پێك هات کە بریتی بوون لە پێنج دەولەت[٢٧] :

---

[٢٧] ئەمە هەڵەی مێژوویيە ئەم پێنج ئەتابەگیە کە لە کوردستاندا دامەزران سەرۆکەکانیان پاشماوەی سەلجوقیانی تورك بوومو هەندێ مێژوو نووس بە هەلە بە کوردیان داوتە قەلەم تەنیا دەولەتی ئەتابەکانی لوڕستان کورد بوون –( ١ ) تاریخ الأمم الاسلامیة بەرگی دوەم.

١-         دەوڵەتی( ئەرتەکیە ) لە حەسەن کیف و ماردین دروست بوو بەشی ماردین تا ماوەی سێ سەدە بەردەوام بوو لە پاشدا هەردوو بەشەکە لەلایەن دەوڵەتی( قەرەقۆینلو ) ەکانەوە لە ناو بران.

٢-         دەوڵەتی شانەرمەن لە ئەخلاق کەماوەی بیست ساڵ لەگەڵ دەوڵەتی ئەیوبیەکاندا لەشەڕدا بوون ئەو ساڵە ناوچوون.

٣-         دەوڵەتی زەنکی لە موسڵ و سوریا و جزیرەو سنجار و ئەربیل – دا فەرمانڕەوابووە بەشی موسڵ لەلایەن مەغۆلەکانەوە داگیرکراوە چوار بەشی کەی تری بەدەستی دەوڵەتی ئەیوبیەکان لەناو چووە.

٤-         دەوڵەتی ئەتابەکانی ئازەربایجان کە لە ساڵی( ٦٢٢ )ی کۆچی مایەوە لە پاشدا خوارزمەکان دەستیان بە سەردا گرت.

٥-         دەوڵەتی ئەتابەکانی لورستان لە ساڵی( ٥٤٤ )ی کۆچی لە لوڕستان پێك هات ماوەی سێ سەدە فەرمانڕەوا بوون لە ئەنجامدا بەدەستی تەیموری لەنگ لەناو چوون[٢٨]. ئەیوبیەکان یەکێك بوون لە دەوڵەتی هەرە ئازاو ناودارەکانی کورد لە ساڵی( ٥٢٨ )ی ك دەست بە فەرمانڕەوایی ئەکەن لە ئەنجامدا لەشکری ئێران و کورد تێك ئەشکێ و پەرت و بڵاو ئەبنەوە. ڕۆمەکان واز ناهێنن و سەر سەختانە جارێکی تر ساڵی( ٦٢٧ )ز دژی( خەسرەو پەروێزی ) فەرمانڕەوای ئێران هێرش دێننەوە. هەر لە شارەووروەوە هەتا ناوچەی ئەردەڵان( سنە ) هەرچی دێهاتی تیا ئەبینێ ئەتسووتێنن و زۆربەی خەڵکەکەی ئەکوژن و دەربەدەریان ئەکەن.[٢٩]

لە ساڵەکانی( ٦٢٨، ٦٤٠، ٦٤٢ )ز بەرانبەر ساڵی( ١٦، ١٨، ٢١ )ی کۆچی لە ئەنجامی شەڕی عەرەبەکان لەگەڵ دوڵەتی ئێران کوردستان بۆتە مەڵبەندی شەڕو شانۆی پێکدادان( حەلوان و تکریت ) لە لایەن عەرەبەوە داگیر کراوە. دانیشتوانی( شارەزورو پاوە ) توشی کوشتن و کاولکاری بوون. لە ئەنجامدا خۆیان دا بەدەست سوپای ئیسلامەوە وموسوڵمان

---

[٢٨] ئەمە( هەڵەیە دەوڵەتی لوڕستان تا سەردەمی پەهلەوی هەر مابوو.

[٢٩] ئەنسکلپیدیای ئیسلام بەرگی دوەم ل( ١٠٣٤ ).

بوون.( تاریخ کامل - تاریخ کوردستان - حدیقەی ناصری ) ساڵی( ٣٢٠ )ی کۆچی دەوڵەتی دیالە - ئال بومیە - لە شیراز و لە بەغداو

ڕەی دامەزراوە تا ساڵی( ٤٤٧ )ی کۆچی بەردەوام بووە. ساڵی ٣٢٣ ك دەوڵەتی

( ئەخشیدیە ) پێك هاتووە ماوەی دەسەدە فەرمانڕەوا بوون لە وڵاتی شام. ساڵی

( ٣٥٨ )ك دەوڵەتی حوسنەویە لە( دینەوەر ) سەری هەڵدا. ساڵی( ٣٨١ )ك سوپای ڕۆمی تێك شکان لە سوریا. ئەحمەدی کوڕی زوحاك پاڵەوانێکی دلێری کورد بوو لەناو سوپای میسردا بە سەرۆکایەتی( ابن صمصام ) بە تاکە سوارە پەلاماری بردە ناو سوپای ڕۆم و توانی سەرداری ڕۆمەکان بکوژێ هەرئەم پاڵەوانیەتیە بوە هۆی وره بەردانی سوپای ڕۆم و تێك شکانیان( تجارب الأمم ) ابن مسکویە. ساڵی( ٤٤٤ ) ك دەوڵەتی شوانکارە لە هەرێمی فارسدا دامەزرا نزیکەی دوو سەدەو نیویانی تا ساڵی( ٦٦٨ )ك لەگەڵ دەوڵەتی ئێران پەیمانێکی دۆستانەیان بەست. ساڵی( ٢٩٧ )ی زاینی سوپای ساسانیەکان بە سەرکردایەتی( نەرسی ) حەوتەم بەدەستی سوپای ڕۆمەکان و لەژێر چادوێری( کالاپوش ) تێك ئەشکێ و نەرسی بریندار ئەکرێ. لە ئەنجامی ترسنۆکی و لەسەر خوێنی خەڵکی کورد ناچار دەکرێت پەیمانێکی دۆستایەتی لەگەڵ ڕۆمەکان ببەستێ و ناوچەی کاردۆو کوردستانی ڕۆژئاوا بەچوار ویلایەتە( ئازون، موك، زابدە- رەجیمە ) بدات بە ڕۆمەکان. دەورو بەری ساڵی( ٢٣٨ )ز( تیرداد )ی کورد بۆتە فەرمانداری ئەرمەنستان و ئاینی ئەرمەنی لەبەر بەرژەوەندی خۆی و هەندێکی تر وەرگرتوە. کوردە شاخاویەکان لەسەر دینی زەردەشتی خۆیان ماونەتەوەو حەزیان بە ئاینی ئەرمەن نەکردوە هەمیشە شەڕو ئاکۆکی و پەلاماردان لە نێوانیاندا هەبو. یانی زەردەشتی و( ئەنەوشیروان ) دووجار بە کوردستاندا تێپەڕ ئەکات جارێك بەرەو( لازیکا ) و جارێکی تر لە ڕێگەی کوردستان و ئەرمەنستانەوە،بۆ تەمێ کردنی( خەزەرکان ) ئەم دوو جارە کوردەکان ڕێزێکی زۆر لە خۆی[٣٠] و سوپاکەی ئەگرن و خواردن وئالیفیان بۆ ئامادە ئەکەن و خزمەتیان ئەکەن.

---

[٣٠] ئالان بریتین ئاریە ئێرانەنیەکان لە نزیك دەربەند( داریل )نیشتەجێ بوون لە پاشدا وردە وردە بەرەو( ڤۆلگا ) بەرێ کەوتون و بڵاوبونەتەوەتا سەدەی حەوتەمی کۆچی مەغۆلەکان هێرش ئەکەنە سەریان و ئەوانیش لە ترسا بەرەو ڕۆژئاوا کۆچیان کردوە.

جارێکی تر سالی( ٦٢٤ )ز کوردەکان دەستی هاوکاری برایەتی درێژ ئەکەن بۆ دەولەتی ئێران و پێکەوە شەڕی قەیسەری ڕۆم( هەرقل )ئەکەن.( ٥٦٩ )ك بەھە شێوەیەکی رەسمی دەست بەسەر ولاتی کوردستان و میسرو سوریاو جزیرەو ئەرمەنستاندا ئەگرن **[31].
دەولەتی خورشیدیەکان ماوەی( ١١٦ ) سالی لە ناوچەی لوڕی بچووکدا پێك هات تا سالی( ٦٩٣ ) ك بەردەوام بوو. جگە لەو دەولەتانەی باسمان کرد کورد خاوەنی( ٤٦ ) میرنشیی گەورەو بچوکی تر بووە کە هەریەکەیان خاوەنی( تەپڵ و بەیداخی ) تایبەت بوون[32].

ئەولیا چەلەبی جگە لەوانەی باسمان کرد پێنج دەولەتی تری ناو بردوە کە سەر بە بەشی تەورێزن " قوتور، پیرەدۆزی، گولانی، دەمدەمی، دەبنلی " [33]

---

[31] ئەنەوشیروان دادگەر نەبوو خوێن ڕێژ بوو لەیەك ڕۆژا سەدوبیست هەزار کەسی لە( سیستان ) کوشت.

[32] نیشانەو بەیداخی کوردە مادەکان شێروتیر بوون.

[33] فتح القسی فی فتح القدس – ل ٣٠٢. سیرە صلاح الدین. ابن شداد( ابن خلکان ) و تقویم التواریخ هتد.

- ئەولیا چەلەبی بەرگی چوارەم ل ١٧٨.

## هاودەردی كوردو پارس

وەك لە پێشەوە باسمان كرد بۆمان دەرئەكەوێ هەر لە سەرەتای مێژوومەوە كوردو پارس هەمیشە هاردەدو هاو پەیمان بوون، هاو بیروراو هاو مەزهەبی بوون. لە شادی و خۆشیدا، لەچەوسانەوە و كوشتن و برین دا، وەك یەك بوون و هەرگیز لە یەك جیا نەبوونەتەوە. لە كاتی دەسەلآت و فەرمانڕەوایی كوردا، پارسەكان بەشدار بوون و هاوكاریان كردوون وە دەوڵەتی كوردی " گوتی، كاسی،كیانی، ماد ". كاتی دەسەلآتداریەتی پارس، كوردیش بێ بەش نەبوون و هاوكار بوون وەك دەوڵەتی " پێش دادی، هاخامەنشینی، ساسانی ". هەركات بە هۆی داگیر كردنی بێگانەوە لەیەك جیابوونایەتەوە یەكێكیان بكەوتایە ژێر دەسەلآتی دەوڵەتێكی ترەوە هەردوولا ئەكەوتنە بیری یەك گرتن و سەربەستیەوە. وەك سەردەمی فەرمانڕەوایی " كلدە، ئاشور، عمالقە " هەردوولا پەیڕەوی ئاینی زەردەشت بوون و " ئاهورامەزدایان " پەرستوە و بڕوایان بە خوای خێرو خۆشی و ئاشتی بووە. ئەفرەتیان لە خوای شەرو ئاژاوەو گرانی( ئەهریمەن ) كردووە. كورد بۆشەڕی ئیسلام دەستپێشخەری كردوە. قوربانیەكی زۆری دا دژی سوپای عەرەب[24]. لەئەنجامدا كوردو پارس پێكەوە موسڵمان بوون ئەم هاوپەیمانیە هەروا مایەوە و كاتی پەیدا بوونی مەزهەبی شیعە برێك لە هۆزە كوردەكان لەگەڵ پارسەكاندا مەزهەبی شیعە گەریان پەسەند كرد _ لۆڕ، كەڵهور، شادرلی، باودەلی، كەرمشەلی، بەختیاری، كولیائی، سینامینلی. پیهرماز، بلیكان، ئەشمیشارت، لەك،.... هتد. كە زیاتر لە سەد هۆزن كەعەلی( خ ) بە خەلیفەی ڕاستەقینەی پێغەمبەر ئەزانن. بەڵكو هەندێ لەم هۆزانە عەلی بەخوداوەند ئەزانن و ئەیپەرستن وە هۆزی( ئانەكەلی، دێرسملی، لە ناوچەی دەرسیم نیشتەجێن[25]. لە كتێب و مێژوە كۆنەكاندا هەمیشە

---

[24] ئەمە هەڵەیە ئەگەر كوردەكان لەستەمی ساسانی وەڕز نەبوونایە و لەگەڵ عەرەب دەستیان تێكەڵ نەكردایە عەرەب لە( حەلەوان ) ڕەت نەئەبوون. ئەوەبوو. خوودی عومەری كوڕی خەتاب وتی ئێمە ڕەشەخاكی عیراقمان بەسە لە حەلەوان تێنەپەڕن.

[25] ئەمانە ئەڵێن خوا عەلی بە پێغەمبەر ناردە خواوە محەمەد شوێنەكەی داگیر كرد خەلیفەكانی ڕاشدین غەدریان لێ كردو خەلافەتیان نەدایە. عائشەو معاویەو خوارجەكان نەیان هێشت بە ئاسودەیی بژی ناچار بەدڵ شكاوی لە دنیا دەرچووە و خوایشی لە پاداشتی ئەوەدا جێگای خواوەندی داوەتێ.

ناوی( مادو پارس ) له یەك ئەبڕاون وبەیەكەوە ناو براون تا دەوروبەری سەدەی پێنجەمی پێشزاین ناوی ئێران پەیدا بوو له بریتی – مادو پارس [٣٦]- هەروەها شەڕی كوردەكان لەگەڵ – والدین- سالّی( ٢٤٤ )ز پێك دا دانەكەی قەیسەری ڕۆم( هەرقل ) سالّی( ٦٢٤ )ز وەك باسمان كرد هەربەلایەنگیری له دەولّەتی ئێران بوووە.

بڕێك له زاناكانی مێژوو ئەلّێن پاش ڕوخانی دەولّەتی مادكه بەهۆی كارتێ كردنی مادی و مەعنەوی له لایەن پارسەكانەوە بەشێك له مادەكان چونه پالّ پارسەكان بوون و هەندێ لەسەركردەكان لەپایتەختی پارس مانەوە و جێگیر بوون و پالّپشتی دەولّەتی پارس بوون. بۆ وێنه كواكساری دوەم كوڕی ئازیدەپاك سەركردەیەك بوە له سوپای كورش له كاتی پێوستدا كوردەكانی كۆ ئەكردەوەو شەڕیان ئەكرد بەشێكی تر له مادەكان چوونه پالّ كوردەكانی زاگرۆس.

مێژوو نووسەكان ئەلّێن ئەشكانیەكانیش هەربەو شێوە لەوناو پارسەكاندا ماونەتەوەو تێكەلّ بوون. لەكتێبی( كورد در مقابل ترك )( ٢١ )دا ئەلّێت ئەو هاوكارەی نێوان كوردو پارس لەوانەیە ئەو تێكەلّ بوونەی مادەكان لەگەلّ پارسەكاندا بووبێت كه باسمان كرد. دكتور فریح – لەكتێبی – كردلر – دا ئەلّێت( جەژنی كوردی ) كه هەمووو سالّێك كوردەكان له( ٣١ )ی حاغستۆسدا به هۆی ڕزگاری ئێران له دەست – زوحاكی خوێن ڕێژ – بێوارسب – ئەیگێڕن. ئەو جەژنه جەژنی دەماوەندیشی پێ ئەلّێن. ئەمه نیشانەی

هاودەردی و هاو پەیمانیەتی كوردو پارسه خاوەنی كتێبی – مروج الذهب – ئەم جەژنی بەجەژنی – میهرەجان – ناو بردوە. لەئەنجامدا ئەلّێن جەژنی كوردو جەژنی دەماوەندو جەژنی میهرەجان هەرسێكیان یەكن شا ئیسماعیلی سەفەوی له سالّی( ٩٠٧ )ی كۆچی دا بەشێوەیەكی ڕەسمی مەزهەبی شیعەی ناساند كه چەند هۆیەكی سیاسی هەبوو، ئەمەش بەلّگەیەكی چاك بوو بۆ عوسمانیەكان كه سولتان سەلیمی قانوونی بەهۆی مەلا ئیدریسەوە پەیوەندی كرد به هەندێ لەسەرۆك هۆزەكان و پەیمانێكی دۆزو دەلەسەی لەگەلّدا مۆر كردن و توانی هەندێكیان له شا ئیسماعیل هەلّگەڕێنیتەوە و بكەونە ژێر دەستەلاّتی عوسمانیەوە.

---

[٣٦] كتێبی ئەستید ئایەتی( ٢، ١٨، ١٩ ). كتێبی دانیال ئایەتی( ٨، ١٢، ١٥ ) بەشی( ٦ ) ئایەتی ٢٠ بەشی ٨. كتێبی ئەشعیا بەشی ٢١ ئایەتی ٢.....هتد

تورکەکان ئەم پەیمانە درۆینە بە هۆیەکی سەرەکی ئەزانن بۆ بڵاوبوونەوەی دەستەڵاتی عوسمانی لە ئاسیای ناوەڕاستدا تورکە عوسمانیەکان کوردەکانیان بە بەربەستێکی گەورە زانیوە بۆ داگیر کردنی ئێران پاش ئەوەی بە هۆی مەلا ئیدریسەوە پەیمان نامەیەکی مۆر کرد وردە وردە کەوتە دەست درێژی بۆسەر وڵاتی ئێران و لە ناوەوەش دەستی کرد بە چەوسانەوەی کوردەکان( مێژوی ئەولیا چەلەبی ).

لەسەردەمی کەیخوسرەی گەورە تا هاتنی شا ئیسماعیلی سەفەوی کوردەکان بەشێك بوون لە دەوڵەتی ئێران و هەر فەرمانڕەوایەك لە ئێراندا بوویێت کورد یا پارس ئەمان لە ژێر دەسەڵاتیا بوون. وە بەهیچ جۆرێك مل کەچی فەرمانی تورك نەبوون و ژێر دەستەییان قبوڵ نە کردوە[37] کورش ی گەورە بە هۆی هێزو بازوی ئەم دوو نەتەوە گەورە( ماد و پارس ) کەوتە خەیاڵی داگیر کردن و پەل هاویشتن. لە رۆژ ئاواوە تا هالیس( قزل ئیرماق ) لە رۆژ هەڵاتەوە تا بشتەوەی روباری( سەیمون ) رۆیشتوون.

بەهۆی ئەم دوو برا باوکی و دایکیەوە توانی پەرە بە سنووری خۆی بدات سوپاکەی بەهێز بکات. پشت بەر ئەدان و هاوکاری ئەم دوو نەتەوە لەگەڵ کورشی گەورە وای کرد لە دەریای خەزەرەوە تا کەنداوی عەرەب بکرێت[38].

وەك چۆن ئاو لە دوو رەگەزی( ئۆکسجین و هایدرۆجین ) پێك دێت هەر بەو شێوەیەش ئێران لە دوو رەگەزی سەرکی( کورد و پارس ) پێك هاتووە. یانی ئەگەر کورد نەبێت تەنها بە فارسەکان ناوترێ ئێران وە ئەگەر فارسیشی نەبێ تەنها بە کورد ناوترێ ئێران. کەوابوو دوو وشەی بەیەکەوە لکاون، کورد و پارس مانای وڵاتی – ئێران – پێك ئەهێنن[39].

---

[37] فتوحات اسلامی بەرگی دوەم لاپەرە ١٢٢

[38] نخبە الازهریە ل ٥٢٠.

[39] ئەم هەڵنانی پارس( فارس ) بۆ ئاسانکاری و رێگە دانی بڵاو کردنەوەی ئەم( مێژووی کوردو کوردستان ) بووە. ئەگەر ناهەر لە دامەزراندنی یەکەمین فەرمانڕەوایی فارسەوە لە سەر داو پەردووی کورد بومو لەوە پێش تریش دژاتەتیان بۆ کورد دیارو ئاشکراە.     " وەرگێر ".

## بەندی سێ یەم

## دەربارەی نووسین و زمان و دین و خوو ڕوشتی کورد

نووسین : -

کوردەکان خاوەنی نووسینێکی تایبەتی خۆیان نەبوون، لەگەڵ پەیدا بووونی خەتی بزماری کورد و پارس هەڵس و کەوت و نووسینیان بە خەتی بزماری بووە .

( ئلداکه ) ئەڵێت " ئەگەر کتێب و نوسراو لە پاش کوردەکان بەجێ بمایە وا چاوەڕوان ئەکرا لەگەڵ نووسینی پاشاکانی هاخامەنشینی جیاوازی نەبوایە "[1] سەدەی دمیەمی پێش زاین پیاوێك بە ناوی( ماسی سوراتی ) پەیدا بوو. بە پێ ی پیتە ئەبجەدیەکان چەند پیتێکی دۆزیەوە و لەسەری نووسین و هەڵس و کەوت کراوە کەبە پیتی( ماسی سوراتی ) بەناو بانگە و لەو پیتانە ئەچێت کە لە سەدەی شەشەمی زاینی دۆزراونەتەوە کە( پیستی ئاوێستا )ی پێ ئەڵێن. ئەو وێنەی لە بەردستایە چەند نموونەیەکن لە پیتی ماسی سوراتی[2]. تا نزیکی سەردەمی هاتنی ئاینی ئیسلام پیتی ماسی سوراتی لە ناو کوردا بەکار هاتوە و لەگەڵ ئەوەشداخەتی( ئارامی، سریانی، یونانی ) یان بەکار هێناوە. لەساڵی( ٣١٢٨ )دا( سید حسین ) ناوێك لە پەیڕەوانی شێخ علاوالدین لە ناو کوپەیەك هەرزندا کتێبێکی دۆزیەوە کەسێ بەش بوو بە ناوی( اجازه نامه ) بە هۆی پرۆفیسۆر براونەوە - درایە دەست زانای خەت و نووسینی کۆن - پرۆفیسۆر - منس - بەشێکیان ساڵی( ٨٨ ) پ ز نووسراوە بەزمانی پەهلەوی و بە خەتی ئارامی و سریانی. دوو بەشەکەی تری بە زمانی یونانی نووسراوە هەردو بەشەکە باسی سەردەمی فەرهادی چوارەم ئەکات کە لە سەدەکانی( ٢٢ - ٢١ ) پ ز فەرمانڕەوایی ئەشکانی کردوە. ئەو دو خەتە وا دەر ئەخەن کە ئەو بنەماڵەی ئەسفەندیار بابا گەورەی هەورامیەکان

---

[1] کتێبی - تتبعت تاریخی حول ایران القدیم دارمستر

[2] شوق المستهام فی معرفه رموز الاقلام( احمد بن ابی بکر )

فەرمانڕەوا بوون. پاش بلاّو بوونەوەی ئایینی ئیسلام و پەیدا بوونی دەستەلآتیان لە کوردستاندا پیتە( کوردی و بزماری و ئارامی و یونانیەکان ) بە تەواوی لە بیر چوونەتەوە و بکار نەهێنراون. لەبریتی یان خەتی - کوفی - بەکار هێنراوە. لە دێی - نگل یی کەلآ تەرزان ی سەر بە ناوچەی سنە قورئانێك دۆزرایەوە کە بە خەتی کوفی نووسراوە و مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی دووەمی کۆچی. پاش پەیدا بوونی خەتی( تعليق ) کورد و فارس هەردوکیان بەم خەتەنووسیویانە و لێرەدا بۆمان دەر نەکەوێ کە لە نووسینیشدا شانبەشان بوون.

زمان

بە پێ ی لێکۆڵینەوەی دکتور( سبایزار) هەر چوار هۆزەکەی زاگرۆس یانی کوردە ئاراراتیەکان بریتین لە " لۆلۆ، گوتی، کاسۆ، شۆبار " هەر یەکەیان خاوەنی زمانێکی تایبەتی خۆیان بوون بەلام لەبەر ئەوەی لە یەکەوە نزیك بوون وەکو بەشە جیاکانی ئەمڕۆی کوردستان کە جل و بەرگ و زمان هەندێ جیاوازی تیایە. بەلام هەمووی یەك زمانە و پێ ی ئەوتریێ کورد. برێك لە رۆژهەلات ناسەکان ئەڵێن زمانی هەر چوار بەشەکەی زاگرۆس ئاری بووە بەلام تا ئێستا روون نەبۆتە وە ئاری خۆی لە چ بەشێك بووە. چونکە هیچ بەلگەیەك بە دەست نەهاتووە کە ئەم گرێ کوێرەیە بکاتەوە. لێرەدا ئێمە واز لە زمانی کوردە ئاراراتیەکان دێنین و ئەچین بە لای کوردە رۆژهەلاتیەکانەوە( ماد ).( دارمستتر ) دانەری کتێبی( تتبعات ئێران ) ئەڵێت زمانی مادەکان هەمان زمانی ئاوێستا بووە بەلام تا ئێستا هیچ بەلگەیەکمان بەدەست نەگەیشتوە کەزمانی ماد لەگەڵ ئاویستا لەیەك بچن. ئاسترابۆن – جوگرافی زانی یونانی کەلە سەدەی یەکی زایندامردوە لە کتێبی – ئێران قدیم – ئەڵێت " ماد و پارس هەردووکیان بە چاکی زمانی یەکتریان زانیوە و لە یەك گەیشتوون " وا دەر ئەکەوێ زمانی ماد و پارس وەکو زمانی کوردی فارسی ئەمڕۆ لە یەکەوە نزیك بوون. زۆر لە مێژوو زانەکان ئەڵێن زمانی – موکری – ئێستا هەمان زمانی مادی کۆنە چونکە کتێبی – زوەند و ئاویستا – کە بە

زمانی مادی نووسراوە زۆر لەزمانی موکری ئێستا نزیکە یاهەر هەمان زمانە. ئەم رایە لە لایەن – هۆرات و دار مستتر و برێ لە لێکۆڵەرەوەکانی تریشەوە پەسەند ئەکرێ کە زمانی ئاوێستای زەردەشت زمانیمادی – کوردی – بووە. زمانی فارسیش لەو سەردەمەدا هەمان زمان و نووسراو بووە کە لە پاش ماوەی( برسی – پۆلیس ) جێ ماو.

دەر ئەکەوێ زمانی کوردی کۆن خۆی لە وشەی عەرەبی زۆر پاراستون و تا بۆیان کرابێ نەیان هێشتوە تێکەڵ ببێت. لێرەدا بە پێچەوانەی زمانی فارسیەوە کە تێکەڵیەکی زۆری تێدایەو پەیوەندی زۆری پچڕیوە لەگەڵ پارس کۆندا.

بۆ نموونە نامە نووسین بەزمانی کوردی زۆر ئاسان و ڕەوانە. بەلام نووسینی فارس گەلێ دژوارە[1]. زمانی کوردی ئەمڕۆ لە چوار شێوە زمان( لهجه ) پێك دێت ( کرمانج، گوران، لور، کەلهور ) و هەر یەکێ لەمانە بوون بە چەند بەشێکی ترەوە کەشێوەیان لەیەك جیاوازە. لە سەرچاوەی دیجلەو فوراتەوە تا کەنداوی عەرەب قەلەمڕەوی زمانی کوردی بووە. کە پایتەختی ئەم زمانە یەکەم ئارارات و لە پاش ئەو زاگرۆس و دوای ئەو ئەسفەهان لە پاشدا ئەهاوەند وهەمەدان و سەردەمێکیش تویسەفون( مەدائن ) بووە. ئەتوانین بلێین زمانی کوردی لە سەرانسەری ئێران دا کە ئەسکەندەری مەقدۆنی فەرمانڕەوای بوە بە ڕەسمی ناسراوە. بنچینەی زمانی کوردی ڕۆژ هەلات بە زمانی ئاریایی کۆنە کەزمانی – ئانزارنی – یان پێ وتوە[2]. کەبە باوکی هەموو زمانەکانی( ماد، هیند، پارس. عیلام ) ئەژمێرێ. نزیکەی سێ هەزار سالێ پێش میلاد ئاریەکان بەم زمانە گفتو گۆیان کردوە و لە پاشدا جیا بوونەتەوەو جیاوازی پەیدا کردوە زمانی پارسی کۆن بریتی بوی لی حەوت بەشی بەم جۆرە : ١- پەهلەوی ٢- دوری ٣- زاولی ٤- سەگزی ٥- سەگری ٦- هەروی ٧- پاشتوی.

وشەی( پەهلە ) لە فارسی کۆندا بە مانای شار هاتووە. لە کوردی دا( پالە )ی پێ وتراوە هەموو پایتەختەکان لە کۆندا( ئەسپەهان، ئەهاوەند، هەمدان ) پەهلەیان پێ وتراوە. هەر بەم واتەیە بە کەسانی خاوەن هێزو ئازاییان وتوە پالەوان یان( پەهلەبان ) بە واتای پارێزەری شا وەك " پاسەوان. باخەوان، دەرگاوان... هتد ". پێلاو لە کۆندا پێ ی وتراوە - پالی - چونکە تەنها خەلکی شارەکان لە پێیان کردوە.

---

[1] هەوراومیەکان کە نیشتە جێ ی شاخن توانیویانە زیاتر پارێزگاری زمانی کوردی بکەنو وشەی جیاواز بۆ ئامرازی پیاوو ئافرەت بەکار بێنن، کەچی فارسەکان نەیانتیانیوە ئەو پارێزگاریە بکەن. بۆیە تێکەلاوی زۆر لە زمانەکەیاند هەیە +

+ جیاکردنەوەی تەعبیر بۆ پیاوو ژن پاش ئیسلام پەیدا بووە. کوردو گەلانی تر هەرگیز بەئەتقی و سووکی تەماشەی ژنیان نەکردوە کە - ژێر - یان بۆ بەکار بێنن، ئەمە کاری عەرەب -.

[2] ( ٢ ) ئانزان وشەی( ئینسان ) عەرەبی لێ وەرگیراوە کە(ز)کراوە بە(س) لە هەورامیدا هەر ئانزان بەکار دیت. ابن خلکان

لەم رونکردنەوەیەدا بۆمان دەر ئەکەوێ کە زمانی پەهلەوی یانی زمانی شاری کە خەڵکی شار و دەشت گفت گۆیان پێ کردوە. بە پێچەوانەی زمانی( دوری ) کە دانیشتوانی دەرەوەی شار یانی خەڵکی چیاو دەشت و لادێ کان قسەیان پی کردوە.( ئەسترابۆن ) لە کتێبی( ئێرانی کۆندا ) ئەڵێت : - لە نووسراوەکانی سەردەمی هاخامەنشینی و فارسی کۆندا بۆمان دەر ئەکەوێ کە زمانی فارسی کۆن بۆ نووسین و خوێندنەوەی کاروباری دەوڵەت بەکار هاتووە. بەڵام قسە کردن بە زمانی پەهلەوی بووە. سەرچاوەی زمانی( فارسی کۆن، ئاوێستا،سانسکریت ) دەگەڕێتەوە سەر زمانی ئاری. هەندێ لە رۆژهەلات ناسەکان ئەڵێن : تاوەکو ئێستا رون نی یە کە زمانی ئاری چ بەشێك بووە لە سەردەمی پارس و ساسانیەکاندا هەر بەکار هاتووە. لە - فیوم – ی میسردا نووسراوێك دۆزراوەتەوە کە بە زمانی پەهلەوی نووسراوە میستر ویست ئەڵێ : سەردەمی نووسراوەکە ئەگەڕێتەوە سەردەمی دوەمی کۆچی. دیسانەوە ئەڵێت جگە لە ئاویستا ئەو نووسراوانەی کەلە سەردەمی ساسانیەکانەوە جێ ماوە هەمووی بە زمانی پەهلەوی نووسراوە( ئەمە پچەوانەی سەرچاوە هەورامیەکانە ). لەهجەی لوڕی نزیکترین لەهجەی کوردیە لە زمانی پەهلەویەوە لە پاش ئەویس لەهجەی کەڵهوڕی و ئەمجا( گۆران، هەورامی، گێلی. کرمانجی ) دێت لەبەر ئەوەی گۆران و کرمانج نزیك و دراوسێ ی کلدان ئاشوری بوون زمانەکەیان زۆر لەیەکەوە نزیکن. زۆربەی وشەیان لە یەك ئەچێت هەندێك لە مێژوو نووسەکان ڕایان وایە کە زمانی لەهجەیەکە لە زمانی فارسی.

( سێر سدنی سمیپ ) دانەری کتێبی ئاشوور ئەڵێت ئەمە ڕایەکی هەڵەیەو ئەقڵ گیر نی یە چون کە زمانی کوردی خاوەنی گۆڕانکاریەکی تایبەتی کۆنی خۆیەتی کە شەشەمی پێش زاییینەو هێشتا زمانی پەهلەوی لە دایك نەبووە.

جیاوازیەکی زۆری هەیە لەگەڵ فارسی کۆنداو زۆریش لەو کۆنترە. بە پێ ی ئەم ڕایەی مێژوو نووسەکان ئەتوانین بڵێین کەزمانی کوردی زمانی سەربەستی سەدەی پاش ئەوەی دەسەڵاتی ساسانیەکان لە ئێراندا پەرەی سەند زمانی فارسی پەرەی پێ دراو زیاتر کەوتە گەشە کردن بۆیە زۆربەی زاناو ئەدیبە کوردەکانیش هەر بە فارسی نووسیویانە. تەنها ئەو کەسانە نەبێت کە گیانی کوردایەتیان زیاتر بوون و حەزیان کردوە وەك یادگار هەندێ شتی فۆلکلۆری و بەخشان و شیعر یان بۆ بەجێ هێشتووین.

# ئایین و خوو رەوشت

پێش هاتن و بڵاوبوونەوەی کوردەکان لە سەدەکانی پێش زاین بۆ شوێنەکانی ئێستیان ئاین و داب و نەریتیان بە تەواوی روون نی یە. پاش هاتنیان بۆ شوێنەکانی ئێستایان روون بۆتەوە کەوا کەدا( ئاهۆرا ) پەرست بوون یانی( رۆناکی پەرست). هەمیشەو ئاگرو رۆشناییان خۆش و یستومو دڵیان پێ کراوەتەوە. بەڵام لە تاریکی پەست و دڵ تەنگ بوون. وەك لە پێشەوە باسمان کرد ئاهور یا ئاهێر بە مانای ئاگر دێت. ئاهۆرا لە دوو بەش پێك هاتووە ئاهور یانی ئاگر. ئا - یانی هاتن – کە ڕاستیەکەی لە ئاگرەوە هاتوە وەك وشەی خوا - خودا کە لە. خود + ئا - پێك هاتوە یانی( خودی خوا خۆی ) یان لە خودی خۆیەوە هاتووە. مەبەستی ڕاستی لێرەدا ئەوەیە کە خوا یا ئاهۆرا لە ئاگرەوە یا رۆشناییەوە پەیدا بووە. ئەو رۆشناییە پێ یان وتوە( شید ) یا( شیدان ) لە زمانی عەرەبی بە مانای نور- الانوار دێت ئەمەیان بە پەروەردگاری هەموو جیهان زانیوە.( الله نور السموات و الارض). وردەوردە پلەی هێزو توانایان پێ داوەو زیاتر پەرستاری بوون. ئاهورامەزدا – یان پێ وتوە یانی خاوەن هێزو دەسەلات.

رۆژ کە( هۆر ) و( خۆر ) و خورشیدی پێ ئەڵێن هەر بەو بۆنەوەیە کەسەرچاوەی رۆشناییە خۆشەویستە لایان و پەرستویانە هەر بەو بۆنەیەوە بە کوردەکانیان وتوە رۆژ پەرست.( مێژوی کلیسای کۆن ل ۳۰۱ وشەی مەزدا بە مانای زۆر بە هێزو توانا دێت هەروەها هێرۆدۆت ئەڵێ – موغەکان کە یەکێکن لە شەش هۆزەکەی ماد ئەمانیش هەروا ئاگر پەرست بوون. ئەتوانین بڵێین کوردەکان بەڵکو فارسەکانیش لە سەرەتای هاتنیاندا بۆ شوێنەکانی ئێستایان پەیوەندی بە هێزیان لەگەڵ رۆژو مانگ و ئەستێرەو ئاوو باو سەوزاییی و یەزدان و ئەهریمەن بووە. ئەهریمەنیان بە نیشانەی شرو تاریکی هەر کاتێ کەسێکیان بمردایە لە سەرەتاوە نەیان ئەخستە چاڵ بەڵکو لە شوێنێکی بەرزدا دایان ئەنا تاوەکو قەلو داڵ گۆشتەکەی بخوات و تێکەڵ بە گۆشتی گیاندارانی تر بێت. لە پاشدا ئەم یاساو نەریتە تەرك ئەکەنو مردوەکانیان ئەخەنە ناو کوپەیەك سرکەوەو لە سەر لوتکەی چیاکان ئەیان ناشتن. عەقدو نکاح و مارە کردن نەبووە بەڵکو رازی بوونی باوك سەرۆك خێڵ و کورو کچ خۆیان بووە. چەند ژنێك بۆ یەك پیاو لە ناو کوردا باو

بووه. زیناو هەتو بازی زۆر عەیب بووه. خوشك و كچبه پیاو نەشیاوه. خەتەنە كردن باونەبووه. كچ تا كاتی گەوره نەبوایەو سەرو عوزر شۆر نەبوایە دەرپێ ی لە پێ نەنەكرا، سەرتاپا لەشی بەكراسێكی ئاوداماں داپۆشتوه. كور تا كاتی ژن هێنان پشتێنی نەبەستوه زۆربەی كورد لەو سەردەمەدا كۆچەر بوون. بە مەڕو ماڵات بەخێو كردنەوه خەریك بوون. حەزیان بە نیشتەجێ بوون نەكردوه. خواردن و كەره سەی ژیانیان لە دارستان و داری بەرداری ئاژەڵ پەیدا كردوه. هەمیشە لە گەرمیان و كوێستان كردندا، سامان و دەرمەتیان بریتی بووه لە مانگاو گاو بزن و مەڕو ئەسپ و ئەو گیاندارانەی كە خۆیان بژێو پەیدا نەكەن. لە پاشدا ورده ورده لێ یان نیشتەجێ بوومو دێهاتی بچووك بچووكیان ئاوەدان كردوه بە كشتوكاڵەوه خەریك بوون و داری بەرداریان ناشتوه. هەررووداوێك ڕوی بدایە لە نێوان خێزانێك یا چەند خێزانێك یا تیرەو هۆزێك لەگەڵ ئەوی تردا هەوڵیان داوه لە ڕێگەی ڕاوێژو پرس بە ڕیش سپیانەوه كێشەكەیان یەك لا بكەنەوه. پەیوەندی كردن بە فەرمانڕەواو دەسەڵاتدارانەوه لە ڕێگەی سەرۆك هۆزكانەوه بووه. هەر سەرۆك هۆزێك هۆیەك بوه بۆ پەیوەندی كردن لە نێوان دەوڵەت و هۆزەكەی خۆیدا( گەل ). وەك كۆكردنەوەی سوپاو باج و چارە سەركردنی كێشەی هۆزەكەو كاروباری ناوخۆیی. پاره لە نێوانیاندا مكار نەهاووه. هەموو كڕین و فرۆشتنێك لە ڕێگەی ئاڵ و گۆڕەوه بووه. یانی كەل و پول بەكەل و پەلی تر ئاژەڵیان داوه بە گەنم و جۆ. گەنم و جۆیان داوه بە هەندێ كاڵاو پێویستی ڕۆژانەو ساڵانەیان[11]. بەهۆی میوانداریەوه لە خواردەمەنی یەكتریان خواردوه میوانداری و ڕێز لێ نانی میوان باو بومو تا ئێستاش لە كوردەواریدا باوه. جل و بەرگ و پێڵاویان لە پەشم و خوری چەرمی ئاژەڵی ماڵی و كێوی بووه زۆر ساده دروستیان كردوه ژن هاوبەشی پیاوەكەی كردوه لە كارو كاسبی كردندا. كەل و پەلی شەڕیان بریتی بووه لە قەمەوخەنجەر و تیرو كەوان و گورزو شمشێرو كەمەندو كوتەك و بەردەقانی. پەرستن و كاروباری ئاینی تەنها لە ئەستۆی گەورەی ماڵدا بووه كە

---

[11] تا ئەم سەردەمەش لە كوردستاندا ئالو گۆڕی كەل وپەل هەر باو بوه. بۆ وێنە لە دێهاتەكەندا كابرایەك ترێ یا شوتی ئەهێنێ لە دێ یەكی تر ئەیگۆڕێتەوه بە گەنم و جۆ یاخود لە شارەوه كابرایەك ورده واڵەی ئەهێنا بۆ لادێ و ئەیدا بە خوری یا هێلكە.

وەرگێڕ

پیٚ یان ئەون( پیر ) ئیتر ئەوانی تر لە پەرستن و کارو باری ئاینی خۆیان نەگەیاندوە. وردە وردە( هورمزد ) پەرستیان پشت گویٚ خستومو دەستیان داوەتە( سیحرو جادو گەری ) کە هەمووی درۆو دەلەسەو هەڵخەڵەتاندنی خەڵك بووە. لە سەدەی حەوتەمی پ ز( ٦٦٠ ) پ ز یەکیٚ لە هۆشمەندان و رۆشنبیرانی کورد بی ناوی – زەردەشت – ی دوایی لە ورمیٚ پەیدا بووە ئەیویست ئەو بارە نالەبارە بگۆریٚ و دوریان بخاتەوە لە جادو گەری و سیحر. بەلاّم پیرەکانی کورد زۆر بەر بەرەکانیان کردو گویٚ یان پیٚ نەداو دژی وەستانەوە تا ناچار لە( ورمیٚ ) وە بەرەو( بەلخ ) رۆیشتوە. دەستی کردوە بە بانگ کردنی خەڵك بۆ سەر رێبازەکەی. لەویٚ خەڵکیکی زۆر پەیرەوی بوون وردە وردە پەلی بۆ ناوچەی( سیستان ) هاویشت و لەوێدا بە تەواوی ئاینی زەردەشت بلاّو بوەوە. دیسانەوە گەڕایەوە ناوچەی ورمیٚ و دەستی کردە بانگەوازی خەڵك و ئالاّی( ئاهورامەزدا ) پەرستی ی هەڵکرد. زۆربەی ئەمو میژوو نووسانەی کەلە بارەی مادەوە نووسیویانە دان بەوەدا ئەنیٚن کە( زەردەشت ) لە مادە یانی( کوردەکانی میدیا ) یانی ولاّتی مادو کتێبی ئاوێستا بە زمانی نیشتمانی خۆی کە زمانی – مادی – یە نووسیوە گەڵیٚ لە میژوو نووسەکان بیرو رایان جیاوازە دەربارەی پەیدا بوونی زەردەشت. رای دروست ئەوەیە : کە یەکەم زەردەشت لە بەلخ پەیدا بومو کوری پورشسبە. کە هۆشەنگ پەیرەوی ئاینی زەردەشتی کەئازەر هۆشەنگیان پیٚ وتوە. قسەیەکی خەسرەو پەروێز لە شانامەدا ئەم رایە ئەسەلمێنیٚ : -

| | |
|---|---|
| کەمارا زدین کەن ننگ نیست | بگیستی بە از دین هوشنگ نیست |
| همە رادە دادا ست و ایین مهر | نظر کردن اندر شمار سپهر |

ئەڵیٚ لە پاشماوەکانی زەردەشتی ئەکەم کتێبی( زەند )ە کە تەنها بەشێکی ماوەتەوە سەرتای پەیدا بوونی ئەم زەردەشتە ئەگەڕێنێتەوە بۆ هەزار ساڵ پیش زاین کە نوح پێغەمبەر لە سەردەمی ئەمدا لە دنیا دەرچووە. زەردەشتی دوەم بە فرەیدون ئەوتریٚ کە راپەڕینی دژی( ئازیدەهاك ) بەرپا کرد لە ساڵی( ٢٢٠٠ ) پ ز هەندیکی تر ئەڵێن ساڵی( ١٣٧٨ )پ ز. زۆربەی میژوو نووسەکان بوونی( کاوەو فەرمیدون و ئەژدەهاك ) تەنها بە ئەفسانە ئەزانن. دوا زەردەشت هەر ئەو زەردەشتە کوردەیە کە لە ورمیٚ سەری هەڵدا لە

سەردەمی( کشراسب )دا. بەرکۆشەکەی چەرسەکەی کاوە کە کردویە بە ئالاو تا سەردەمی هاتنی ئاینی ئیسلام مایەوە کاتێ سوپای ئیسلام ئێرانی داگیر کرد ئەو ئالایە کەوتە دەستیان فیردەوسی ئەڵێ : -

فهم پشت زردشت بیشیسن بداو

مه اباد پیغمبر راستگو

لە کاتێکدا کوردی مادی هیچ پەیوەندیەکی لەگەڵ( مائاباد )دا نیەو لە سەردەمی مائاباد تاوەکو سەردەمی کشتاسب چەند هەزار ساڵ ئەبێت، کەوابوو هەزاران پشت پێویستە تاوەکو زەردەشت ئەگاتەوە سەر مائاباد[45]. تا ئێستا را دەربارەی پەیدا بوون سەردەمی زەردەشت زۆرەو بە تەواوی ساغ نەبۆتەوە( ئورژۆکسوس ) و( ئەرستۆ ) سەردەمی پەیدا بوونی زەردەشت بە شەش هەزار ساڵ پێش سەردەمی ئیفلاتون دائەنێن یانی( ٨٣٦٥ ) ساڵ پێش ئەم.

مێژوو نووسی یونانی( گزانتوس ) ئەڵێت( ١٠٨٠ ) پ ز زەردەشت پەیدا بووە. زەردەشتیەکان خۆیان ساڵی (٦٦٠ ) پ ز باس ئەکەن( میستر جاکسن )ی شامزای ئاینی زەردەشت ئەڵێت – زەردەشت لە نیوەی دوەمی سەدەی حەوتەمی پ ز هاتۆتە دنیاوەو لە نیوەی یەکەمی سەدەی شەشەمی پ ز لە دنیا دەرچووە [46]کە ئەم رایە زۆر نزیکە لە رای زەردەشتیەکان خۆیان. دیسانەوە لە کتێبی( زبدە الصحائف ) پەیدا بوونی زەردەشت بە ساڵی( ٤٧٨ ) پ ز نووسراوە بە پێ ی ئەو سەرچاوانەی لە پەراوێزی پێشودا باس کراوە زەردەشتی دووەم یا زەردەشتی کورد لە ناوچەی( ورمێ ) رەزائیەی ئێستا لە دایك بووە، ناوە – زەردەشت – کوڕی پورشسب کوڕی پێرسب کوڕی کیدا کوڕی ناریاك کوڕی ئاگەئند کوڕی ئاگیر کوڕی مامیر کوڕی هەرزیان کوڕی ئەپستمان و لە سەردەمی کشتاسب لە ساڵی( ٦٦٠ ) پ ز سەری هەڵداوە. کشتاسب بڕوای بە

---

[45] دبستان المناهب ل ٥

[46] مێژوی سرجان ملکم ل ٢٧ و مێژوی مسعودی – حمزە اصفهان. یاقوت و قەزوینی و ابو الفداو و ابن الفقیە و بلاژن و خوردادبە... هتد

زەردەشت هێناوەو برەیکی زۆری بە ئاینەکەی داوە هەر ئەو یارمەتیە بوە هۆی پەیدا بوونی ناوی کشتاسب چونکە کشتاسب تەنها فەرمانڕەوای بەلخ بووە. فیردەوسی ئەلێ کشتاسپ( ۳۸ ) کوڕی بوە کە لە ناوەڕاستی سەدەی حەوتەمی پ ز ساڵی( ٦٦٨ ) پ ز فەرمانداری بەلخ بووە[٤٧]. کشتاسب لە ئەژادی کیانی یەو کوڕی لوهراسبی کوڕی ئەرجان( ئەروەندشاه ) کوڕی ئابۆ کوڕی کەیقوباد کوردە.

کە یەکەم فەرمانڕەوایی زنجیرەی کیانی یەکانە. هەندێ لە مێژوو ناسەکان بە هەڵە ناوی گرشاسب دێنن کەدوا فەرمانڕەوای پێش دادیەکان بووە. لە کۆتایی سەدەی( ۱۰ پ ز لە دنیا دەرچووە. برێکی تر بەهەڵە بە( وێشتاسب )ی ناو ئەبەن. یەکێ لە ڕاوێژ کاران یا وەزیری کشتاسب بە ناوی( جاماسب ) برازایەکی خۆی بە ناوی( ئاهۆ ) ئەدا بە زەردەشت و کچەکەی زەردەشت( پورجیست ) یا( بەرجیس ) مارە ئەکات ئەم خزمایەتیە بوە هۆی ئەوەی جاماسب یارمەتی زەردەشت بدات. لەم دواییەدا پارچە هۆنراوەیەك دۆزراوەتەوە وا دەر ئەکەوێ کە کورد کاتی پەلامار دانی سوپای ئیسلام بۆ سەر کوردستان ئاینی زەردەشتیان پەیڕەو کردوەو بڕوایان بە( ئاهۆرامەزدا ) بووە. هۆنراوکە باسی هێرش پەلاماری سوپای ئیسلام ئەکات بۆ سەر خاکی کوردستان کە لە ناوچەی شارەزوور چەند کوشت و کوشتاریان کردوەو چەندین دێهاتێن کاول کردووە :

هۆرمزگان رمان ئاتیران ك وژان
وێشان شاردەوە گۆرە گۆرەکان
زۆرکار ئارەب کردتە خاپوور
گەناو پاڵە هەتا شارەزوور
شنۆ کینگان وەدیل بشینیا
مێرد ئازاتای ژە ڕووی هۆینیا
ڕەوشت زەردەشت مانەوە بێکەس
بەزیبکا نیکا هورمزو هویچکەس

[٤٧] یەکێ لە کوڕەکانی کشتاسب ناوی ئەسفەندیارە و باوکی بەهمەنە کە بە بابا گەورەی لڕو بەختیاری و هەورامی دائەنرێ.

ماناکەی : - مزگەوتەکان( هورمزگان ) یا هورمزدگان وێران بوون و ئاگرەکانیان کوژاونەتەوە، گەورەکان هەموو خۆیان شاردۆتەوە، دوژمنەکان زۆر ستەم کارانە شارو دێهاتەکانیان لەناو برد[٤٨]. کچ و ژنیان بە دیل گرت ئازاو دلێرەکان خوێنی گەوزان – پەیڕەوانی زەردەشت بێ کەس مانەوە( هورمز ) بەزەیی بە کەسدا نەهاتەوە. پاشماوەی کوورە ئاگروکان و ئاگردانەکان لە کوردستاندا بەڵگەیەکی ئاشکرایە کە کورد ئاگر پەرست بوون بو شێوەیەکی گشتی بە پێ ی ئەو پاشماوەو چیرۆکە ئەفسانە کوردیانە ئەتوانین بلێنین کە کورد لە سەرەتاوە( رۆژ) پەرست بوون. لە دواییدا ئاگریان پەرستوەو هەندێکی بۆتە جولەکە. لە ئەنجامدا کوردو پارس بە ڕەزامەندی هەردووکیان ئاینی ئیسلامیان پەسەند کردوەو موسلمان بوون. ئاینی ڕەسمی کورد ئیسلامەو پەیڕەوی مەزهەبی ئیمامی( حەنەفی ) ین و زۆربەیان( شافعی )ن کە لە سالی( ١٥٠ )ی کۆچی دا لە دایك بوەو لە( ٢٠٤ )دا لە دنیا دەرچووە. لە گۆرستانی سەرەکیان هەلبژاردوە کە بە – قادری –و نەقشبەندی – ناو ئەبرێت یانی دەروێش و سۆفی.

[٤٨] وشەی مزگەوت لە هورمزدگەوە هاتوە. گد – لێرەدا بە مانای ئەدا دێت یانی گەدا کاە یا هورمزدگ کە بە مانای شوێنی پەرستنی هورمزە. ناوچەی سنە بە گشتی بە مزگەوت ئەڵێن( مزدگ ) یا مزگت. " وەرگێر"

## بەندی چوارم

## دەربارەی کوردستان

### " ژمارەی دانیشتوانی هۆزەکانی کورد "

کوردستان بریتی یە لەولاتیك کە کورد لە سەدەکانی پێش زایینەوە کۆچیان بۆ کردووە پەلیان بە هەموو لایەکیدا هاویشتووە تێدا جێ گیر بوون بە ناوی خۆیانەوە ناو نراوە( کورد – ستان ) کە هەردوو بەشەکەی یانی رۆژهەلات و رۆژ ئاوا ئەگرێتەوە

سنووری کوردستان : - لای سەرەوە ئەرمەنستان. لای رۆژهەلات ئازەربایجان و زنجیرە شاخی زاگرۆس( تێ بینی، ئەمە راست نی یە ! چونکە هەرگیز ئازەربایجان لای خۆرهەلات نی یە. جگە لەوەش ئەو وا دیارە کرماشان، وە لورستانی بە بەرچاو نەگرتووە ). لای خوارەوە عیراقی عەرەب( بابلستان )لای رۆژ ئاوا رووباری فورات و ولاتی ئاسیای بچووك. هەندێکی تر لە مێژوو ناسەکان سنووری کوردستانیان بەم شێوەیە دیاری کردوە:- لای سەرەوە چیاکانی یاگری داغ – ئارارات -. لای رۆژ ئاوا رووباری فورات تا سنوری شاری بەغدا لای خوارەوە سنووری سەرەوەی بەغدا عیراقی عەرەبی. لای رۆژهەلات سنووری خوزستان و پارس زنجان و ورمێ و خۆی و ماکۆ.

بە پێ ی ئەم دیاری کردنە بەشێك لە یوورزە رۆم و ویلایەتی رۆژهەلاتی ئاسیای بچووك و بەشی خوارووی ئازەربایجان ئەکەوێتە کوردستانەوەکە کورد ئێستاش لەم شۆێنەدا ئەژی.( حمدالله المستوفی ) لە کتێبی( نزهه القلوب )دا ئەلێت"لە کۆندا شاری( بەهار ) کە ئەکەوێتە ژوورووی هەمەدانەوە مەلبەندی کوردستان بووە لە پاشدا ئەو مەلبەندە گوێزراوەتەوە شاری( سولتان ئاباد )–چەمچەمالێ( چەمچەمالێ نزیك کیۆی بێستون ئێستا فەوتاوە ) لە نزیك کێوی بێسون. هەروەها ویلایەتی ئەرمەن جزیرە لە بەشی کوردستاندا بووە( ئەربیل و ئامەد ) سەر بە ویلا یەتی( جزیرە ) بوون. بە پێ ی ئەم نووسراوە لە سەدەی هەشتەمی کۆچی دا کوردستان بریتی بوە لە( ١٦ ) ویلایەت بەم شێوەیە : -

١- ئالات٢ – ئالشتر٣- بەهار٤- خەفتیان٥- دەربەندی تاج خاتوون ٦- دەربەندی زەکی٧- داربێل و ئیرنێل٨- دینەوەر٩- سوڵتان ئاباد( چەمچەماڵ ).١٠ – شارەزوور١١- کرماشان١٢- کەرەند و خۆشاب١٣- کەنگاوەر١٤- ماەی دەشت١٥- تاقە وستام١٦- بێستون. ئەنسکلوپیدیای ئیسلام نووسیویەتی کوردستان دیاری کردوە ئەڵێ : کوردستان بریتی یە لە وشوێنا ئەی کوردی نیشتە جێ یە بەڵام زۆربەتەسکی سنوری بۆ دیاری کردوە ئەڵێ زەویەکی لاکێشی کە لە خواروی رۆژهەڵاتی لورستان درێژ بۆتەوە تا سەرووی رۆژ ئاوای( مەلاطیة و بریتی یە لە( ٦٠٠ )میل درێژی و( ١٢٠ تا ١٥٠ )میل پانی و زۆربەی پانتای ئەکەوێتە نێوان موسڵ و ئارارات کە( ٢٥٠ )میل ئەبێت. ئەولیا چەلەبی ساڵی( ١٠٦٥ )ی کۆچی گە شتێکی بە کوردستاندا کردوە سنووری بەم شێوەیە دیاری کردوە، لای سەروە ئەرزرۆم. لەوێوە بەرەووان هەکاری و جزیرە و عەمادیەو موسڵ و شارەزوورو ئەردەڵان و دەماوەندو دەرەنەو دەرهەتەنگ تا بەسرە ئەڕوات کە نزیکەی( ٧٠٠ ) فرسەخ[49] ڕێگا ئەبێت( فەرسەخ ٣ میلە ). بە درێژی پانتاییەکەی لەوە کەمترە[50]. هەر بەم شێوەیە لە نێوان رۆژهەڵات ناسەکاندا جیاوازیەکی زۆر هەیە دەربارەی سنووری کوردستان کە هیچیان بە تەواوی شارەزا نەبوون. سێر مارك سایکس – سنووری کوردستانی لە نێوان سەرچاوەی زێ ی گەورەو دیجلە و خوارووی گۆمی وان داناوە.( تۆرۆ دانژین ) ی رۆژهەڵات ناس لە کتێبی( ئاپوریولوجی ) لە دوو تابلۆ کە ئەگەڕێتەوە بۆ دوو هەزار ساڵ پ ز ناوی ویلایەتی( کارداکا ) هاتووە کە دراوسێ ی ( سۆی ) بووە کە ئەکەوێتە خواروی گۆمێ ( وان ) ەوە. شەرفنامە ئەڵێ : لە ناوچەی بتلیس قەڵایەکی زۆر کۆنی تیایە بە ناوی( سۆی ) و بە زمانی( ئارامی ) بەم ناوچەیان وتوە حەوزی کاردۆ). جگە لە نووسینی مێژوو نووسەکانیش ئەم ئەوچەیە بە( کوردوان ) ناودارە. جزیرەی ابن عەمەری ئێستاش( کازارتای کاردۆ ) یان پێ وتوەو ئەرمەنیەکان بە( کوردۆخ ) ناویان بردوە.

---

[49] فرسەخێك بە مانای سەعاتە ڕێگایەکە بە پێ

[50] ئەولیا چەلەبی بەرگی چوارەمی مێژوەکەی ل ٧٥

( بلاذری و طبری ) ئەڵێن لە ناو عەرەبەکاندا بە( کاردا ) یا( کاردای ) بە ناوبانگ بووە. یاقوت حەمەوەی ابن عمرو نزیکەی دوو سەد دێ ی بوەو شارەکانی بریتی بوون لە( الثمانین، جودی. فیروز، شاپور ) کە کەوتونەتە کەناری چەپی دیجلەوەو بەرانبەر( بازیدا )[51].

لە پاشدا ناوی کاردا لە کتێبە ئیسلامیەکاندا ون کراوەو لە بریتی( جزیرەی ابن عومەر ) ( بوەتان ) لە شوێنی نووسراوە. وا دەر ئەکەوێ ( بوەتان ) لە بوختانەوە هاتبێ وەك رۆژهەلأت ناسەکان ( نۆلدکەو ) ( کیپارت ) و( هارتمان ) ئەڵێن هەر ئەو( بوختە ویج ) ە یە کە( هیرۆدۆت ) لە سەدەی پێنجەمی پ ز ناوی بردوە کە سیانزەمین ویلایەتی( ئاخامن ) بوە لە پاشدا بوە بە بەشێك لە ئەرمەنستان.( گەزنەفون ) لە کتێبی گەڕانەوەی دە هەزار یۆنانی دا ئەڵێت – ویلایەتی کاردۆك تا بوەتان درێژ بۆتەوە دیسانەوە( ئەسترابۆ ) ی رۆژهەلأت ناس ئەڵێت کوردا مامتەك بە شاخەکانی دیار بەکرو موش – ی ئێستا وتراوە. لێرەدا جێ ی گومان نی یە کە ویلاتەتی( کاردۆك ) کارداخ – کاردۆشوی – کاردا کا – کاردای – کوردۆ – کوردان – ) بە مەڵبەندی بنەڕەتی کوردیان وتوە. ئەم ڕایەش لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا چەسپاوە ڕیسکی رۆژهەلأت ناس ئەڵێت : – کورد، کوردی، کوردیا هەمووی یەکێکەو جیاوازی نی یە. بە پێ ی ئەو تابلۆ گرنگەی کە باسی جوگرافیای سەدەی حەوتەمی ئەرمەنستان ئەکات( ئەدومنس ) ئەڵێت لەو تابلۆیەدا وشەی کورچیخ نووسراوە. رۆژهەلأت ناسی ناوبراو ئەڵێت وشەی کورچیخ لە – کورتیخ ئاخ موە هاتوە کە بە مانای کورد دێت سەردەمی فۆستیوس بیزا پیوس سەدەی چوارەم( کورچیخ ) ناوچەیەك بوە لە نزیك سەڵماس لە پاشدا بووە بە ویلایەتێك لە چۆڵە مێرگ تا جزیرەی ابن عمر پانتایی بووە. مێژوو نووسان ( س مارتن. نۆرمان ) لە کتێبی رۆژهەلأتی کۆندا – سر مالکم لۆرسە هاسل – براون – دکتور رۆسۆ... هتد – هەر یەکە لەمانە دەربارەی نیشتمانی کورد جۆرە ڕایەکی تایبەتیان هەیە. کە لەیەکەوە دوورن. جگە لەوەی هیچیان بە ڕاستی و ڕوانی چۆنیەتی باسەکانیان دەربارەی کوردستان نەنووسیوە بەڵکو کوردستانیان زۆر بە بچووکترە. بە پێ ی لێکۆڵینەوەی ڕاست و دروست ناوچەی لوڕستان و

---

[51] بازیدا – کەوتۆتە لای ڕاستی کەناری دیجلەوە. مەبەست لەو( کاردا ) یە( قردا ) کە بەشێ بوە لە جزیری –ابن عمر– و ئەو بەشەکەی– بازیدا– بووە.

کرماشان و سنه( ئەردەلان ) و بوشی خواروی ئازەربایجان و خۆی سەلماس و[٥٢] ورمێ و باکۆو موکری هەمووی بەشی کوردستانن مەبەستمان لە کوردستان غەیری ولاتی ( مادە )ە کە لە پاشدا باسی ئەکەین. هۆزە کوردەکان لە زۆر شوێن و جێگادا بلاو بوونەتەوە بۆ وێنە ( هۆزی بازۆکی ) لە دەوروبەری تاران و هۆزی بە( چناوەند ) و( باوەنوور ) و( زەفرانلی ) لە خۆراسان. لە هەمەدان هۆزی جۆزەکان و لە ناوچەی مازەندران عەشایەری( مۆداکۆ ) ولە ناوچەی فارسدا عەشیرەتی شوانکارەو لە عیراقی عەجەم هەزی ئەسیارلوو چەند بەشێك لە تیرەی لەك. لە قەزوین و سەروی ڕۆژ ئاوای ناوچەی گێلان هۆزی( عومەرلو ) هەیە کە بریتین لە چەند بەشێك( قەبەقرانلو، شمگاملو. بەهادرلو. شاکلانو، پشانلو) "ە هەموویان کوردن لە خوزستان و قەهستان کورد هەیە"[٥٣]. هۆزی یراخۆی زەنگەنە لە بلوجستان و هندوستان و ئەفغانستان و ئەنقەرە بلاو بوونەتەوە. کوردستان ئەکەوێتە دامێنی( بان ی ) ئەرمینیاوە وردە وردە بەرەو( بین النهرین ) بەرزایی کەم ئەبێتەوە. هەر بە پێ ی ئەم بەرزایی چیای( چلچەشمە ) لە سنە( ٤٠٠٠ ) م و بەرزایی لوتکەی کەلی خانلە نێوان سەقزو بانە( ٢٢٥٥ ) م و بەرزایی چیای ماردین لە نێوان دیجلەو فورات لە کوردستانی ڕۆژ ئاوا( ١١٠٠ )م لە کاتێکدا کە بەرزایی شاخەکانی ئارارات زیاتر لە( ٥ ) هەزار مەترە شاخی عبدالعزیز و سنجار بەشێکن لە ڕیزە شاخەکانی کوردستان کە لە دامێنیا بیاباتێك درێژ بۆتەوە تا دەوروبەری جزیرە کۆتایی دێت.

---

[٥٢] سەلماس –لە زەمانی ڕەزا شدا ناویان گۆڕی بە شاپوور

[٥٣] کوردلر لە نووسینی دکتور فریج ل ٣٢

## رووبەری كوردستان

لە رۆژهەلاتی لورستانەوە تا رۆژ ئاوای دیاربەكر هێلی پانتایی( ٣٢- ٣٩ ) پلەی ژوورو هێلی درێژی( ٣٩ – ٥٠ ) پلەی رۆژ هەلاتی كە ماوەی( ٧ ) پلە پانی و( ١١ ) پلە درێژی هەر پلەیەك بریتی یە لە( ١٥ ) میل. ئەنجامی كۆی درێژی * پانی * ١٥ = ١٧٣٢٥ میل چوار گۆشە كە بریتی تیە لر رووبەری خاكی كوردستان ئەگەر ئەم ژمارەیە *١٠ بكەین ئەكاتە( ١٧٣٢٥٠ ) كیلومەتر چوار گۆشە. بەلام لەبەر ئەوەی رووبەری كوردستان لاكێشەو چوار گۆشە نی یە وەك شێوەی دوو سێ گۆشە لەم سەرو ئەو سەرەوە هەیە، سێ بەشی رووبەرەكەی داگیر كردووە. ئەگەر ئەم سێ بەشەی لێ دەربكەین( ١٢٠،٠٠٠ ) كیلومەتر چوارگۆشە ئەمێنێتەوە كە بریتی یە لە پانتایی رووبەری خاكی كوردستان.

" ویلایەت و شارەكانی كوردستان "

كوردستان پێك هاتوە لە شەش ویلایەت( والی نشین – ئەمیرنشین ) بەم شێوەیە :

ێ- دیاربەكر – شارە گرنگەكانیی ئەم ویلایەتە بریتین لە : ١- دیاربەكر – مەلبەندی ناوچەكەیەو ئەكەوێتە نزیك روباری دیجلەوە دانیشتوانی شارەكە نزیكەی( ٣٥ ) هەزار كەس ئەبن.

٢- میافارقین – شارێكی خوشەو بەناوو باخی زۆر بەناوبانگە

٣- ماردین – ئەكەوێتە دامێنی چیای ماردینەوە. شارێكی گەورەیەو بە ماری گەزندە ناودارە.

٤- ئەسیبین – هاوینە هەوارێكی خۆشە خاوەنی باخ و ئاوی زۆرە

٥- ئامغەنی – شارێكی پیشەسازی یەو كانی مس و فافۆن و ئاسنی تیایە

٦- سورەك –

٧- ئامەد : - بریتین لە ٧ شار لە رۆژئاوای دیجلە

٨- جزیرەی ابن عمر – بە جزیرە ناودار روباری دیجلەی پێدا تێپەر ئەكات

٩- ئەیشاپور

١٠- سەعرەت

١١- ئەرجەکی

١٢- بۆتان

ب – مۆسل : - مەڵبەندی ویلایەتەکەیە. ئەکەوێتە لای ڕاستی دیجلەوە کەلاوەکانی ئەینەوا کە پایتەختی ئاشوریەکان بووە نزیکیەی( ٢٠ ) کیلومەتر لەم شارەوە دوورە لە کۆتایی سەدەی حەوتەمی پێش زایین یانی( ٦٠٦ ) پ ز کوردەکانی ورمێ لەگەڵ کوردە مادەکانا( عیراقی عەجەم ) بە سەرکردایەتی( کواکسار ) و هاو پەیمانیەتی( بابلیەکان ) ئەینەوایان داگیر کردو بۆ هەمیشەیی کردویانە بە کەلاوەو فەرمونڕەوایەتی ئاشوورییان لەناو بردوە.

٣"- ئەربیل – هەولێر بەهۆی شکاندنی سوپای( دارا ) لەم شۆینەدا بەدەستی ئەسکەندەری مەقدۆنی بەشارێکی مێژوویی ئەژمێررێ.

٤"- سولەیمانی – لە کۆندا کورد پێ ی وتوە شارباژێر. لەم دواییەدا ئیبراهیم پاشای بابان بە ناوە باپیریەوە ساڵی( ١٧٨٧ )ی زایینی ئاوەدانی کردەوە. بوە پایتەختی ئەمارەتی بابان.

٥"- بستان : -

٦"- کەرکوک – لە کۆندا( ئارباخا )ی پێ وتراوە. شارێکی نەوتی گرنگە.

٧"- سنجار – شەنگار.

٨"- عەقرە - ئاکرێ ٩"- عەمادیە ١٠"- ڕواندوز – لە دوو بەش پێك هاتوە ڕەوەند – دژ واتا قەڵای ڕەوەند، کۆچەرەکان. لە ڕەوەندەکانی هەرێمی( دوین – کە ئێستە کەوتۆتە هەریمی – کە نجە -.

١١"- کفری ، ١٢" – سەلاحیە( تێ بینی – کفری و سەلاحیە یەك جێگەیە )، ١٣"- گوڵ عەنبەر یا( خلمار ) کە ئێستا بۆتە خورماڵ ئەکەوێتە دامێنی شاخەکانی سورێن یانی ڕۆژهەلاتی دەشتی شارەزوور.

ج – سنە یا ئەردەڵان. بۆیە ئەردەڵای پێ وتراوەچونکە مەڵبەندی فەرمانڕەوای ئەردەڵانیەکان بووە. ئەردەڵ – بابا گەورەی بنەماڵەی ئەردەڵانیەکانە و ناوی ڕاستەقینەی( فەیروزی کوڕی خەسرەو )ە. ئەردەڵ ساڵی( ١٣٧ )ی کۆچی لە سەردەمی فەرمانڕەوایی( ابو العباس عبدالله عباس ) بە یارمەتی( ابو سلمی خۆراسانی ) ناوچەی

موسڵ و دیاربەکری داگیر کردوە لە پاشدا لەگەڵ لەشکرەکەیدا ڕومو شارەزوور هاتوە تا ساڵی(٥٦٤) ئەردەڵانیەکان لە شارەزووردا فەرمانڕەوا بوون لە پاشدا دەستیان بەسەر ناوچەی سنەدا گرتوە. شارە گرنگەکانی ئەو ویلایەتی بریتی یە لە

١- سنە( سنندج ) یا( سنادژ ) یا کوردستان مەڵبەندی فەرمانڕەوایی ئەردەڵانیەکان ئەکەوێتە سەرووی دامێنی کێوی ئابیدەرەوە. ئاوو هەوایەکی سازگاری هەیە عەرەبەکان سنادژیان کردوە بە سنندج هەندێك بە هۆی ئەو دوو نوونەوە کە لە عەربیەکەی دا هاتوە ئەڵێن بنەڕەتیی وشەکە لە( سانان دژ)ە وە هاتوە یانی قەڵای فەرمانڕەواکان. چونکە لە زمانی کوردەوایدا تەنها بە دەسەڵاتدارەکانی هەورامانیان وتوە( سان ). لە سەردەمی فەرمانڕەوایی شا ئیسماعیلی سەفەوی دا دەوڵەتی عوسمانیەکان هاتن لەقەبی( پاشا )یان دا بەسەرکردە کوردەکانی سەر سنووری ئێران بۆیە شا ئیسماعیل لەقەبی( سان ) ی دا بە دەسەڵاتدارو سەردارانی هەورامان و لەقەبی( خان ) یشی دا بە دەسەڵاتدارانی ناوچەی سنە. هەردوو ناز ناوەکە بەرانبەر نازناوی پاشای عوسمانیەکان بوە لەو کاتەوەبە دەسەڵاتدارانی هەورامانیان وتوە سانو بە دەسەڵاتدارانی ناوچەی سنەیشیان وتوە خان. هیچ کاتێك سانەکانی هەورامان لە سنەدا فەرمانڕەوایەتیان نەکردوە. مادە تەئریخی شاری سنە( غمها ) یە لە ساڵی( ١٠٤٦ )ی کۆچی لە لایەن( سلێمان خان ) ی کوڕی میر – علم الدین – ی ئەردەڵانیەوە ئاوەدان کراوەتەوە و فەرمانڕەواییان کردوە تا کاتی لە ناو چوونی ئەم بنەماڵە یە.

٢- بیجار – مەڵبەندی گەڕووسەکانە وشارێکی ناودارە

٣- سەقز – شارێکی بازرگانیەو گرنگێتی لە شاری سنە زیاترە

٤- بانە - شارێکی ئاوو هەوا خۆشەو دانیستوانی بە ئازایی بەناوبانگن.

٥- هەورامانی تەخت – شاری هەورامان – ئێستا بە تەواوی وێران بووە تەنها دێ یەك لە شوێنی ماوەتەوە، هەر بە شاری هەورامان ناودارە.

د- ویلایەتی ساوجبلاغ – مەهابادی ئێستا کە تەنها سەردەشت لەژێر فەرمانڕەوایدا بووە.

ه – کرماشان : شارە بەناوبانگەکانی بریتی یە لە :

١- كرماشان – مەڵبەندی ویلایەتەکە یەکەرویتە خواروی ڕوباری( قەرەسو) پاشماوە دێرینەکانی( تاقەوسان و بێستون) لەم ناوچەیەدا( کان) ی نەوتی زۆری تیایە.

٢- سونقور – مەڵبەندی هۆزی( کولیایی) یەکانە

٣- کەنگاوەر – شارێکی مێژوویی کۆنە.

٤- کەرەند – شارێکی خنجیلانەیەو نەکەویتە سەر ڕوباری نەڵوەند

٥- هارون ئاباد – گوایە هارون الرشید – ئاوەدانی کردۆتەوە.

٦- زەهاو – قەسری شیرین کە ئاوی نەڵوەند لێرە تێ نەپەڕێ و دەچیتە ناو شاری خانەقین – ەوە.

٧- هەرسین.

و – لوڕستان – شارە بەناوبانگەکانی بریتین لە :

١- بروجەرد – کە بنەڕەتی وشەکە وەریگرد – وەروگرد – ە و مەڵبەندی ویلاتەکە بە شارێکی ئاوو هەوا خۆشە.

٢- خورەم ئاباد – شارێکی خنجیلانەی سازگارە.

٣- سیمرە - کە - صەهی مرە - یشی پێ نەڵێن.

٤- مەلایەو – ئێستا پێ ی نەڵێن دەوڵەت ئاباد.

٥- نەهاوەند – لە کۆندا پایتەختی دەوڵەتی کورد بومو شەڕی فارس و ئیسلام لەم ناوچەدا ڕووی داوە.

٦- تووسرکان – وڵاتی کوردستان دەورەی بەچیای بەرزو لویکەی گەردەن کەش دراوە بەشی رۆژهەلآت و خواروی ڕۆژئاوای بریتی یە لە دیجلە و فورات و ڕوبارو جۆگە و کانیاو و کارێزی زۆری تیایە. زەوی زۆر بی پیت و بەرکەتە بۆ کشت ە کاڵ. شاخەکانی بەشی سەرەوەی پێ ی نەوترێ زنجیرەی زاگرۆس. شاخەکانی کوردستان بە دارستانی چڕو گژو گیاو گوڵی جوان ڕازاوەتەوە بە هاوین و زستان قەرەبالغن و شارو دێهاتی زۆری تیابە. بەلآم چیاکانی نێوان ئێران و تورکیا بە پێچەوانەی ئەمانەوە زۆر سەخت و بەرداوی و ڕووتەنیە بە شێوەیەك زۆر بە گران ئازاترین سوپای پیا تێپەڕ بووە. سەرچاوەی ئاوەکانی کوردستان هەر لەم چیا سەر کەشانەوەیە وەك دیجلە و فورات و چەند بەشێکی

تری وەك زێ ی گەورەو زێ ی بچووك و خاپوور... هتد. هەموویان لە سەرەوە بەرەو خواردێن. جگە لە ڕوباری( قزل ئازن ) یانی ڕوباری سپی کە بەرەو ژوور ئەڕوا و ئەڕژێتە دەریای خەزەرەوە. پەروەردگاری مەزن درێغی نەکردوە لە بەخشینی جوانی و سامانی زۆر بە کوردستان. وەك چیاو دەشت و دۆڵ و ئاوو هەوای سازگارو دارو دارستانی زەبەند. کە بۆتە هۆی خۆشگوزەرانی خەڵکەکەی. کوردستان پڕە لە کانی ئاسن و مس و نەوت و گۆگردو ئاڵتون و یۆرانیوم و... هتد. ئەم وڵاتە وڵاتی و شوێنی کشت و کاڵ و ئاژەڵ داریە. ئەم وڵاتە وڵاتی قارەمانی و پیاوەتی یە.

## " ژمارەی دانیشتوانی کوردستان "

تا ئێستا لە کوردستاندا بە شێوەیەکی ڕاست و دروست و زانستی سەر ژماردن نەکراوە بەڵکو چەندەها جاریش سەرژمێر کراوە کەهیچی ڕاست و ڕێك و پێك نەبومو دوور بووە لە واقیعەوە. ساڵی ١٨٩٢ فرانسوای لە کتێبی زەردا ئەڵێت " دانیشتوانی کوردستانی تورکیا بریتین لە( ٨٧٩، ٣١٢ ) کەس ئەگەر کوردەکانی ئێرانیشی بخەینە سەر ئەوا( ٥ ) ملیون و شتێك ئەبن. لە ١٦ ی ئابی( ١٩٢٥ ) دا لەسەر داخوزای کورد خۆی بڵاوکراوەیەك دەربارەی ژمارەی دانیشتوانی کوردستان بڵاوکرایەوە کە( کنت تلگی ) سەرەك وەزیرانی هەنگاری لەلایان – عصبه الأمم – ە وە نێررابوو ئەڵێ ١- کومردەکانی تورکیا ١،٥٠٠،٠٠٠ ٢- کوردەکانی ئێران ٧٠٠،٠٠٠

٣- کوردەکانی عیراق ٥٠٠،٠٠٠، ٤- کوردەکانی سوریا و وڵاتەکانی تر ٢٠٠،٠٠٠

هەمووی ئەکاتە سێ ملیون کورد. الکسەندەرژابا لە کتێبی سەرگوشتەی کوردا ئەڵێت( ساڵی ١٨٦٠ لە شاری بگرس بورغ – دا بڵاوکراوەتەوە ئەڵێ : ئەگەر بمانەوێ کوردە ڕەشماڵ نشینەکان و کۆچەریەکان بنووسین ئەبینین ژمارەی خێزانیان لە( ٥ ) کەس تا ٢٠ کەس ئەبێت ئەگەر بمانەوێ ژمارەیەکی ڕاست و دروستی کوردمان بۆ دەرکەوێ ئەوا ژمارەی ناوەڕاستی یانی( ١٠ ) وەر ئەگرین و لێکی ئەدەین کە بەم شێوەی لێ دێت. ١- تورکیا ٣،٩٨٧،٩٦٠ ٢- عیراق ٧٤٩،٣٨٠ ٣- ئێران ٣،٢٠٠،٠٠٠ ٤- سوریا ٢٨٩،٩٤٠ ٥- ئەرمینیای سۆڤێت ٦٠،٠٠٠ هەمووی( ٨،٢٨٧،٢٨٠ ) کەس.

ئەکاتە( تێ بینی ئەم سەرژمێرانە هی( ٧٠ ) ساڵ لەمەوبەرە. ئەو حەلە تورکیا ١٧ ملیون بوو ئێران( ١٣ ) ملیون بو. عیراق ٣ ملیون بوو، سوریا ٢ ملیون بوو.

کوردکانی بلوجستان و ئەفغانستان و هندوستان لەسەر ئەم ژمارمیە نین بەلام بەشێوەیەکی گشتی ئەم ژمارمیەبەلای راستدا ناچێت و هەرگیز ژمارەی کورد لەو کاتەدا لە( ١٠ ) ملیون کەمتر نەبووە. چونکە کوردستان بەم پانی و بەرینی و خاون پیت فەرەوە لە خاکی ئاسیای بچووك گەورەترە کە ژمارەی دانیشتوانی لە( ١٦ ) ملیون کەس کەمتر نیە.

" هۆزەبنەڕتیەکانی کورد "

بە پێ ی پاشماوە دێرینە بەدەست هاتومکان و سەرچاوە مێژووییەکان کورد ئەکرێت بە دوو بەشەوە. بەشی یەکەم بریتێن لەو کوردانەی کە چەند هەزار ساڵ پێش زایین تاومکو ئێستا خۆیان بەکورد ناوبردوە. مێژوو زانە خۆی و بیگانەکان هەر بە کورد ناویان ئەبەن. بەشی دومم بریتێن لەو کۆمەڵەی کەلە سەدەی نۆهەمی پ ز خۆیان بە ماد ناو بردوە مێژوو ناسەکانیش بە مادی ناوی بردوون. بەشی یەکەم بریتێن لەو کوردانەی کە لە ئارارات، شاخەکانی جودیەوە هاتوون بە درێژایی دیجلەو فورات تا رۆژئاوای سوریا و شام و کەناری دەریای سپی و لە رۆژهەلاتەوە تا کەنداوی وعەرەب و کەناری دەریای عومان بلاوبونەتەوە( بەمانە ئەوترێ منظومەتي زاگروس ) بەشی دومم بریتێن لەو کوردانەی کە لە ئاسیای ناومراستەوە بەرەو رۆژئاوا هاتوون لەوێوە بەرەو خواروی دەریای مازەندەران و ناوچەی ئازەربایجان و ئاسۆاهان – ئاکباتان – و لورستان هاتوون. ئەم ناوچەیە پێ ی وتراوە ولاتی میدیا. دیواری( مەدی ) کە لە نێوان بابل و( مابين النهرين ) دایە زۆر گرنگەو بە چاکی دروست کراوە لە خشت و قیر. بە یەکێك لە شاکارەکانی ماد ئەزانرێ( ٤٥ ). هۆزەکانی کوردی رۆژئاوا یانی کوردەکانی زاگرۆس بریتێن لە ١- لۆلۆ ٢- گوتی ٣- کاسی( کاستۆ ) ٤- سوریاو یا سوباری. هۆزەکانی بەشی دومم یانی کوردەکانی ئاسیای ناوەڕاست بریتێن لە ١- ماد ٢- ئایری ٣- کاردۆخ ئەم حەوت هۆزە بریتێن لە هۆزە بنەڕتیەکانی کورد کە ئەمانیش چەندین هۆزو تیرە خێلیان لێ جیا بۆتەوەو لە سەر تاسەری کوردستان و دەرەوەی کوردستان بلاو بوونەتەوە.

## هۆزه كوردەكانی

### بەشی ئارارات

١- لۆلۆ: - ئەم هۆزە بریتین لە كوردە ئاراراتیەكان و پێش پێك هاتنی دەوڵەتی( جەمشیدی ) لەسەدەی( ٣٧ ) پ ز یانی( ٢٧٠٠ ) پ ز لە ناوچەی( لۆلۆم ) كە ئەكەوێتە نێوان كرماشان و بەغداد فەرمانڕەوا بوون. هەندێ تر لە مێژوو ناسان ئەڵێن گوایە لە ویلاتی( سولەیمانی ) ئەمڕۆو شارەزوورو زەهاو حەلوان دا بوون. ئەم هۆزە ساڵی( ٢٧٠٠ ) پ ز لە شەڕێكی سەختا لەگەڵ( ئەكەدەكان ) تێك ئەشكێن لە سەردەمی فەرمانڕەوایی( ئەرامسینی كوڕی سارگنی یەكەمدا ) سەركردەی لۆلۆكان( شاتوون ) بووە[54]. هەندێ لە مێژوو نووسە ئێرانیەكان بەتایبەت( شانامە ) زۆر بە ئەزانانە نووسیویانە كورد لەو ڕاكردوانە پێك هاتوون كەلە ترسی زوحاك داویانە شاخ. دكتور سپایزار لە كتێبی – میسوپوتامی – دا ئەڵێت : تابلۆیەكی دێرینە لە زەهار دۆزراوەتەوە كە لە سەدەی( ٢٨ )پ ز لە سەردەمی( ئانۆبانین ) فەرمانڕەوای لۆلۆ دا بوو. هەندێ لە فەرمانڕەوایانی ئاشور لە سەدەكانی( ١٩- ١٨ )پ ز لە هۆزی لۆلۆ بوون و لەوە ئەچێ هەندێكیشیان لە سوریا ژیابن. بە پێی ئەو پاشماوانەی كە لە سەردەمی( ئاشورنازیر پاڵ دا بە دەست هاتووە ولاَتی لۆلۆ زۆر ئاوەدان بوەو خاوەنی گەلێ زاناو ڕۆشن بیر بووە پیشە سازی تێدا پەرەی سەندوە. ولاَتێكی پێشكەوتو بوە ئاشور نازیرپال، گەلێ لە زاناو ڕۆشنبیرەكانی بردۆتە ولاَتی ئاشور( ئۆلمسێد ).

یەگلات پەلازەری دوەم بەشێك لە ئارامیەكانی میسوپوتامی بردوە بۆ ولاَتی لۆلۆ[55] ( دكتور سپایزار ) لۆلۆكان بە بابا گەورەی لوڕ دائەنێت لە كاتێكدا پاشماوەی لۆلۆكان لە( ژەنگارو عیراقدا ) ماوەتەوە. هیچ جۆرە پەیوەندیەك لە نێوان زمان و خوو ڕەوشتی ئەوان و لوڕەكاندا نییە ی. فەرمانڕەوایانی ئاشور گەلێ جار لەگەڵ لۆلۆكاندا بەیەكدا

[54] مێژوی كۆنی ڕۆژهەلاَت ی نزیك ل ١٨٦

[55] فۆرژ ل ٤٣

هاتوون. شەڕی توندو تیژ لە نێوانیاندا ڕووی داوە. بەتایبەت لە سەردەمەکانی تەگلات پالازارو،ئاداد نێراری، تۆکۆلێ فیونۆرتا، ئاسورنازیرپال – بەتایبەت ئاسور نازیرپال چوار جار سوپای بۆ سەر وڵاتی( لۆلۆ ) هێناوە. لە سەدەی نۆهەمی پ ز ئاسور نازیرپیال پایتەختی وڵاتی لۆلۆکان شاری( زەیمەری داگیر کردوە ). پاش ڕووخاندنی دەوڵەتی ئاشور و سەرەتای پەیدا بوونی دەوڵەتی ماد وڵاتی لۆلۆیش بۆتە ژێر دەستەی فەرمانڕەوای ماد. بە تەواوی سنووری دەوڵەتی لۆلۆ نەزانراوە بەڵام بە پێ ی نەخشەی کۆن دەسکەوتە مێژینەکان سنووری وڵاتی لۆلۆ بەم شێوەیە لای سەرەوەی( زاموا ) ناوچەی( ئامری ). پشتەرو سەردەشت و لای ڕۆژ هەڵاتیەوە سوی و هاشمارو هارهارو هالمان[56]. لای خوارەوە ویلایەتی( بارامسی و تۆکریش )ی عیلام بووە، لە ڕۆژ ئاواوە( ئارباخا – ئارخا ) یانی کەرکوکی ئێستا. ویلایەتە گرنگەکانی وڵاتی لۆلۆ بریتی بوە لە _ بابێت ) یانی ناوچەی بازیان هەروەها( داگارا، کاکری، بارا، زەیمری، هۆدۆن، مسۆ، ئارزیر، قەڵای ئاوزێ، کینسابا، پیرەمەگرون ). شاخە بەرزوکانی ئەم وڵاتە بریتی بو لە( لیسیر ) یا( کینابا ) یانی شاخی ڕزگاری[57] ونیکلدیم ئارا. سیماکی و( ئازیروی ) یانی( ئەزمڕ ) کۆلار، لارلار، سوانی و نیسپی، لەوانەیە لە شاخەکانی هەورامان بن. ڕوبارەکانی ئەم وڵاتە : ڕوباری( ڕادنۆ ). و( ئادێر )( سپایزار ).

٢- گوتی یا گودی. ئەمانەش لە هۆزەکانی بەشی ئاراراتن یەپێی ڕای چەندین لە ڕۆژهەڵات ناسەکان ڕەگەزی بنەڕەتی کورد ئەمانن کە لە چیاکانی زاگروس و ناوچەی کورکوك فەرمانڕەواییان کرودە. ئەم هۆزە

لە سەدەی( ٢٧ ) پ ز یانی( ٢٧٠٠ ) پ ز هێرشیان کردۆتە سەر وڵاتی بابل و سۆمەر ئەکەدو داگیریان کرودەو سوپای ئەرامسینی کوڕی سامگۆنیان شکاندوە. لەو دوو تابلۆیەی

---

[56] هارهار لە سەدەی( ٨ ) پ ز لە لایەن سارگون – ەوە داگیر کراوە ناوی نا( کارشارۆکین ) یانی شاری سارگون. لەوانەیە شاری هەڵەبجەی ئێستا بووبێ یا لە دەوری بەرپا بووبێت( ئەمین زەکی بەگ )

[57] ڕزگاری – ئاشور ئازێپالی فەرمانڕەوای ئاشور ئەڵێن : ئەم شاخە لە ڕوژهەڵاتی ئاشورەکاندا تاکە شاخێکە نوك تیژ. نوکی وەکو نوکی نێزە تیژە( مستەر سێرك ) لە ئەنسکلوپیدیای ئیسلامدا بەرگی یەك( ١٠٦ ) ئەڵێت نوسەرانی ئەساری بە شاخی جودیان وتوە شاخی کوردان. شاخی نسیریش هەرلە وڵاتی کوردانە.

که له سەردەمی تۆکۆلی – ئایورتا )ی فەرمانڕەوای ئاشوردا نووسراوە لە یەکێکیاندا ناوی – گوتی- و لە تابلۆی دووەمدا ناوی( کورتی ) هاتووە. لێرەدا وا دەرئەکەوێ کە ئەم دوو ناوە بەیەك مانا هاتبێت. گوتی بەشێکن لە - کورتی – و لە شاخی ئارارات – ن واتە گوتی لە بنەڕەتدا گودی یە کە پیتی( د ) کراوە بە( ت ) چونکە گودی یا بە جودی ناو براوە بە پێ ی مێژووی کۆن وچەند سەرچاوەیەکی دێرین – گوتی – ناوی هۆزێکە لە هۆزەکانی بەشی ئارارات کە بە ناوی شاخی گودی یەوە ناو نراون. لە پاشدا چونەتە ناو کۆمەڵی زاگرۆس و بەرەو کەرکوك هاتوون لە سەردەمی ئاشوریەکاندا بە ویلایەتی( بۆتان و ئاشور ) یان وتوە( گۆتێوم ) یانی وڵاتی گۆتی.( د. ئاوری رۆژهەلأت ناس ) لەم بارەیەوە ئەڵێت " کاردۆ، کاردۆخی، کارتوخی. کاردۆشی، کاردا، کارداك، کارداویە، کارتاویە،کوردی، کورتی، کورتەدی، کورتۆخی، کوردوانی، کوردیا گوتی " ئەمانە هەمووی یەکن بەیەك ناو ناو ئەبرێن. هەرچەندە لە ناوەکاندا( تلفظ )یان جیاوازە بەلأم هەموویان بەیەك کۆمەڵ ئەوترێن. ئەم رۆژهەلأت ناسە وشەی( سیرتی ) گۆڕیوە بە کورتی و لەو ناوانەدا ناوی بردوە. هەر بەم جۆرە ئەم رۆژهەلأت ناسە کاردۆشیا یا کاردۆخی گەزنەفون و کاردای شۆمێر بە کوردی ئەمڕۆ دائەنێ. ئەم وشانە لە تابلۆیەکەوە وەرگیراون مێژووی ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی فەرمانڕەوی( ئاردانانار )ی( لاگاش ) لە سەرەتای سەدەی( ٢٤ ) پ ز لەو هۆیانەوە بۆمان دەرئەکەوی کە ناوەکان هەموویان هەر شێوەیەك نووسراون. بەیەك واتا دێن کە واتای – کوردە - مێژوو ناسەکانیش هەمان رایان هەیە[٥٨].

سەلماناڕاری یەکەم فەرمانڕەوای ئاشور کەهەمیشە لەبەر بەرەکانێ و شەڕۆ شۆردا بووە لەبارەی گۆتی یەکانەوە ئەڵێت : " نیشتمانی گودی یەکان لە( ئۆراندی )

یانی( ئارارات )ە وە دەست پێ ئەکات تا " کموخی " واتە تورعابدین.

٢- کاسو یا کاسی – ئەم هۆزە کوردە ئاراراتیە بۆ یەکەمجار لە ناوچەی کرماشاندا دەرکەوتون و لەو ناوەدا جێ گیر بوون. ئەکەدیەکان پێ یان وتون( کاسۆ یا کاشۆ ) بە

زمانی ئەکەدو ئاشور کاسۆیەو بە زمانی کوردی( کاکۆ یا کاکە ) یە و بە پارسی( کاکا ) یەو وشەی کاکاوەند لەمەوە وەرگیراوە،لە دەوروبەری شاری سنە چەند دێ یەك

---

[٥٨] هۆزی میسوپوتامیا ل ١١٧ د. سپایزار

هەیە بەناوی( کاکۆ ) لەوانەیە لەم ناوچەیەشدا نیشتەجێ بوون. کاسیەکان بە کوردە ڕۆژ پەرستەکان ناو براون لە سەردەمی فەرمانڕەوایی هاخامەنشینیەکاندا بەهۆی هاتوچۆ کردنیانەوە لە نێوان بابل و ئەکباتاندا هەموو ساڵێك باجیان لە دەوڵەتی ئێران سەندوە. ئەسکەندەری گەورە لەگەڵ کاسیەکاندا بەشەر هاتوە سەرداری ڕۆمەکان( ئاینفۆنوس ) بە خاکی کاسی دا تێپەڕی کردوە تا( دەربەند چی تەنگی گلو ) ئازادۆگای چوارەم ئەوەی( حامورابی بابلی ) لە ساڵی( ١٩٧٧- ١٩٥٦ ) پ ز لەگەڵ عێلأمەکان پەیمانێکی بەست دژی هێرشی کاسیەکان بۆ سەر وڵاتی بابل کەچەند جارێك هێرشیان کردوەو تا ڕۆژهەلاتی دیجلە داگیریان کردوە[٥٩]. ساڵی( ١٩٦٠)پ ز سەردەمی فەرمانڕاویی( شمشوئایلونا)ی بابلی، کاسیەکان هێرشیان کردۆتە سەر بابل بەلأم نەیانتوانیوە داگیری بکەن. دیسانەوە پاش دوو سەدە یانی ساڵی( ١٧٦٠ ) پ زکاسیەکان بە هاوکاری( گودی و لۆلۆ )ی هاو ڕەگەزی خۆیان بەسەر کردایەتی( گاندیش ) هێرشیان کردۆتە سەر بابل و توانیان داگیری بکەن. ساڵی( ١٧١٠ ) پ ز دەوڵەتی شۆمێر کۆتایی پێ هاتووە. فەرمانڕەوای بابلەکان – ئاگامیل – ویستویەتی وڵاتی عێلأم داگیر بکات بەلأم نەیتوانیوەو بەشکاوی گەڕاوەتەوە. یەکێ لە سەرکردەکانی کاسی بە ناوی( ئالتۆم باباش ) لەگەڵ ئاگامیلی بابلی دا کەوتۆتە شەڕو بەسەریاندا سەرکەوتوەو وڵاتەکەی داگیر کردوون. پاش چەند ساڵێك( ئاگۆم )ی برازای( ئالتوم بریاش ) فەرمانڕەوای کاسی و بابل توانی قەلأی شومێر یا قەلأی( دورئا ) بگرێت و بیخاتە ژێر دەسەلأتی خۆیەوە. پاش داگیر کردن و چەسپاندنی دەسەلأتی هەردوو ویلایەتی( سۆمەرە ئەکەد ) ی ناونا( کارۆنیا ) نزیکەی شەش سەدە یانی( ٦٠٠ ) ساڵ فەرمانڕەواییان کرد، بە یەکێك لە چوار دەوڵەتە گەورەکانی دنیا ناو ئەبرا( میسر، هیشت، کاردۆنیا، میتانی ) پانتایی و دەسەلأتی ئەم دەوڵەتە کوردیو لە دەستەلأت و خاکی حامورابی گەورەتر بووە. پاش لەدەست چوونی فەرمانڕەواییان و ڕووخاندنی

دەوڵەتەکەیان کاسیەکان گەڕانەوە شوێنی بنەڕەتی خۆیان( زاگرۆس) و تا دەوروبەری ساڵی لەدایك بوونی مەسیح لە ئاوچەی لوڕستان مانەوە. لە ئەنجامدا ناوی

---

[٥٩] مێژووی کۆنی ڕۆژهەلأتی نزیك ١٩٨ و پیرنیا ل ٢٢

کاسی ورده ورده بیرچوومو نەماو لە بریتی وشەی( لەر ) سەری هەڵدا. هەر لەبەر ئەمەیە کە مێژو ناسەکان ئەڵێن لوڕەکان لە نەوەی کاسین. وشەی " کاسی، کاسا، کاسای، کاشۆ، کاکۆ " هیچ پەیوەندیەکی لەگەڵ لوڕدا نی یە بەڵام لەوە ئەچێ لوڕەکان لە ناودا تواییتەوەو بە هەموویان وتبێ لور. رۆژهەلآت ناسەکان گومانیان نی یە کە کاسیەکان لە نەوەی ئارین و زمانی کاسی زمانی ئاری یە. مسترهۆڵ ئەڵێ زمانی کاسی لە زمانەکانی کۆمەڵی زاگرۆسە.( هۆزەکان میسوپوتامی ).

٤- شۆباری یا سۆباری یا سوربـاو هۆری ؛ - إ- ئەم ناوە بۆ یەکەمجار بە ناوی – سۆبێر – لە تابلۆیەکی سەردەمی( لۆگال ئانی مەندۆ ) سەدەی سێیەمی پ ز بەدەست هاتووە. ئەم ناوە لە سەردەمی ئەکەدیەکاندا وڵاتێکی زۆر گەورە بوە لە سەرووی رۆژئاوای عێلامەوە تا شاخی ئامانۆس[٦٠] دەسەلآتی بووە لە پاشدا بۆتە جێ نشینی بڕێك لە هۆزە کوردەکانی بەشی ئارارات. لە پاشماوەی ئاشوراکاندا وشەی – سوربـاو – نوسراوەو( حامورابی ) ئەم ناوەی بە ناوچەیەکی سەربەخۆی وتووە. لێرەدا بۆمان روون ئەبێتەوە ئەو کۆمەڵەی بەناوی – سورباوە وە هاتوە لە( مابین النهرین – و سورباو ئەناتولی بوون[٦١]. تەگلات پالازاری یەکەم فەرمانڕەوای ئاشوریەکان لە ساڵی( ١١٠٠ ) پ ز ئابلوقەی شارێکی سورباو ئەدات بەناوی( شیرش )( سۆربای، کارتی، موشکی ) یەك ئەگرن بۆ بەربەست کردنی ئەو هێرشە.( مێژووی کۆنی ئاشوور ) سورباویەکان لە ناوەڕاستی سەدەی ١٠ پ ز دا دەوڵەتێکی بەدەسەلآت بوون بەڵام لە دەوروبەری کۆتایی هاتنی دەوڵەتی ئاشوردا کۆتایی بە ئەمانیش هات و ناویان کوێر بوەوەو ناوی – نایری – هاتەکایەوە. زۆر نزیکە ئەم هۆزە تیرەیەك بن لە سۆرباویەکان و بە هۆی زۆری دەسەلآتیانەوە توانیبێتیان بەسەر سۆباریەکاندا زاڵ بن ناوی( نایری ) یا( نائری ) پەیدا بووبێت پاشماوەو نەوەی نائری ئێستا لە ناوچەی سەمزینانە. نووسەری کتێبی( بابلستان ) سێر( کینگ ) و هەندێ تر لە رۆژهەلآت ناسەکان( میتانی ) ش بە یەکێك لە

---

[٦٠] شاخی ئامانوس – شاخێکی زۆر بەرزە ئەکەوێتە ویلایەتی ئەگنەوە خەتی شەمەندەفەری نێوان ئەگنەو حەڵەب بەوێدا تێپەر ئەکات.

[٦١] اقوام میسوپوتامی د. سپایزا.

لقەکانی کاسی نەزانن بەلام لە کتێبی - هۆزەکانی میسوپوتامی - ل( ١٢١، ١٢٥ ) دکتور سپایزار بە پێنچەوانەی ئەم رایە نووسراومو ئەڵێت : - میتانیەکان کە بەشێکن لە کۆمەڵی( سوبارتۆ - سوریاو ) ئەم کۆمەڵە لە فوراتی ناوەراستدا یانی لە نێوان موسڵ و ئەرابلس دا نیشتەجێ بوون ". لە سەدەی( ١٦ ) پ ز دەوڵەتێکی بەدەسەلات بوون. ئەم دەوڵەتە وەك لەمەوبەر باسمان کرد یەکێك بوود لە چوار دەوڵەتە گەورەکەی جیهان( میسر، هیتت، کاردونیا، میتانی ). پایتەختی میتانیەکان شاری( واشۆگانی ) بووە.

نامەیەك لەم دواییەدا دۆزرایەوە باسی پەیوەندی نێوان دەوڵەتی میتانی و میسر ئەکات بریتی یە لە( ٦٠٠ ) دێرو بە زمانی ئەکەدی نوسراوە لە لایەن( توشراتا )ی فەرمانڕەوای میتانی یەوە نامەکە نووسراوە.( بۆرك ) رۆژهەلات ناس ئەڵێ : ئەو نامەیە تێکەڵ بوە لەگەڵ زمانی قەفقازی یانی بە کوردی قەفقازی نووسراومو بە زمانی ئەکەدی یانی زمانی ئەکەدی لەو سەردەمەدا زمانی رەسمی بووە. لە ناوچەی کەرکوك چەند هەزار پاشماوە لە دەوڵەتی سوباری جێ ماومو لە شاری( بۆغازکوی ) یش چەند پاشماوەیەکی تر بەدەست هاتووە.( جونسۆن )ی رۆژهەلات ناس ئەڵێت: ناوو نیشانی میتانی تەنها بە خێزانی فەرمانڕەوای میتانی وتراوە ئەسلی دەوڵەتەکە سۆباری بووە. ناوی ویلایەتەکە( هانی گلبات ) بوە ئەم راپۆرتە لە پاشماوە دێرینەکانی کەرکوك نزیکە.

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی( ئاشور نازیرپاڵ ) دا وردە وردە دەسەلاتی میتانیەکان کەم بوموە لە پاشدا لەناو چوون وەك باسمان کرد دەوڵەتی میتانیەکان لە سەدەی( ١٦ ) پ ز دا زۆر دەسەلاتدار بوون ولاتی سوریا و عاموورو بەشێ لە کوردستانی رۆژئاوا( ناریاخا ) ویلایەتی ئاشور لەژێر دەسەلات و فەرمانی میتانییەکاندا بووە. دانیشتوانی میسری کۆن بە میتانیەکانیان وتوە - ناهاری - لەبەر ئەوەی لە دیجلەوە نزیك بوون. لەوە ئەچێ وشەی ناهاری وشەی( نائری ) لێوە هاتبێ.( سێر سدنی سمیپ ) ئەڵێ بەشی رۆژئاوای دیجلەی سۆباری بە( هۆری ) بەناوبانگ بووە. سپایزار ئەڵێ لەوە ئەچێ لقی میسوپوتامی و هوری لەژێر ناوی - سۆباری - دا ناسرابێت. ئەو کتێبە مێژووییانەی دەربارەی کورد نووسراون ناوی هۆزەکانی هەریەکە بەجۆرێك تۆمار کردوە کە

ئەمەش هۆی ئەشارەزایی ئەو نوسەرانەن پرۆفیسۆر سپایزار لە کتێبی میسوپوتامی ل( ١١٦ ) دا ئەڵێت ئەم رایە راستەو ناوی( هوری ) بەم چەند جۆرە لە کتێبەکاندا نووسراوە(

هۆری، هۆریت، هۆرلۆ، هۆرلاش، هۆرهه، کورد هۆرۆهه، هاری، موری). له بارەی میتانیەوە ئەم ناوانەی نوسیوە( میانی و میتلانی) هەروەها له باسی لۆلۆکاندا( لۆلۆ، لۆلۆم، لۆلۆمی، لۆلۆیو، لۆلۆیوم، نۆلۆ)ی بەکار هێناوە لەباسی مادمکانداوشەی( مادا، ئامادای، مەد، مید، میدی، میدیا)ی بەکار هێناوە له باسی کاسیەکاندا( کلسی، کلسا، کاسای، کاسۆ، کاشۆ، کاکۆ)ی بەکار هێناوە. هەر بەم شێوەیە ناوی کورد له چەند زمان و کاتێکدا جۆراو جۆر هەریەکە بەجۆرێ ناوی بردوە. دوچاری چەندەها ناوی سەیر بووە. چەند رۆژهەلات ناسێك رایان وایە کە ئەم ناو ئالوگۆر کردنە هیچ کار ناکاتە سەر ناوی( کورد). ئەو وشانە هەریەکە دەربارەی هۆزێك یا تیرەیەك یا بەشێك له کورد و تراوە. بیگانەکانی کورد کۆمەڵ و هۆزو تیرەکانی کوردیان بەیەك ناو ناو نەبردوە بۆ نموونە( سۆمەری و ئەکەدی) یەکان بە کوردیان وتوە( گوتی، یا گودی) لەبەر ئەوەی له چیای جودی یەوە هاتونە خوارەوە ئاشورو ئارامیەکان وشەی( گوتی، کوتی، کورتی، کارتی، کاردۆ، کاردا، کاردان، کارداك، کارکەتان) یان بەکار هێناوە ئێرانیەکان( کورتو، کورتەوی، کورداها، کوردها سیرتی) یان بەکار هێناوە رۆم و رۆمانیەکان( کاردۆسوی. کاردۆسوی کاردۆخۆی. کاردۆك، کاردۆکیا، کوردوکی، کاردۆخی) یان وتوە. ئەرمەنیەکان( کودرونانی، کورخی، کورتیخ، کورچخ)یان بەکار هێناوە.

عەرەبەکان وتویانە( کرد، کورد، کردی، کوردی، جورد جوردی، جودی، کاردۆی، کاردا، کارتاویە). رووسەکان وتویانە( قورت، قورد، قرن).

تەنها پرۆفیسۆر سپایزار ئەم رایەی نی یە بەڵکو زانایانی تری وەك( مستر دراوەرو نولدکەو هارفمان... هتد. هەمان رایان هەیە. ئەم ناڵ و گۆرو جۆرەها ناوە پەیوەندی بە سەدەکانی پێشوو نی یە. بەڵکو ئێستاش هەروابە هەر کەسەر هەر گەلە بە

شێوەیەکی تایبەت ناوی هۆزێك یا گەلێك یا ولاتێکی تر ئەبات[62]. بۆ وێنە له کۆندا بە ئێران وتراوە( سفن) له پاشدا بووە بە ئاریا ئەمجا پێشدادیە عەجەم و ئاریان له کۆتاییدا ئێران و پارس.

---

[62] کوردو فارس بە( یابان) ئەڵێن ژابۆن. فارسەکان بە پۆلەندە ئەڵێن( لەهستان) و بەدەلهی ئەڵێن دههلی و پرتقال ئەڵێن پرتەقاڵ ( ومرگێر)، عەرەب بە ولاتی چین دەڵێن صین

سەلمانازار وتویە( پارسوا ) ئەوروپیەکان وتویانە( پرس ) ڕوسەکان وتویانە( برسیا ) عەرەب وتویە( فارس ) یاعەجەم. ئەم هەموو ناوو ناڵوو گۆڕش تەنها مەبەست لە یەك وشەیە بەلأم هەر کەسەو هەر نەتەوە بە جۆرێك ناوی بردوە.

## هۆزە کوردەکانی

## بەشی رۆژهەلات

ماد – سالی( ٢٥٠٠ ) پ ز چەند هۆزێکی دراوسێ و هاو رەگەزکە ئاری یان پێ وتراوە لە نەژادی( هیندو ئەوروپی ) بوون لە رۆژهەلات سەروی رۆژهەلاتی دەریای خەزەر نیشتەجێ بوون. هەندێکیان بەکشتوکالەوە خەریك بوون، بەلام هێشتا لە دەورەی( بەردا ) بوون و کەمتر گەشەیان کردبوو. بەشێکی کەمیان ئاسنیان بەکار هێناوە بۆ هەندێ کاروباری رۆژانەی وەکو راوو کشت وکالْ ئاژەلْ بەخێو کردندا خەریك بوون، وەکو ئەسپ و ماین و مەرو بزن. نووسین و خوێندنیان نەزانیوە. هەندێکیان روەو هیندوستان کۆچیان کروده. کتێبی وێراس یانی کتێبی پیرۆزی هیندەکان کە بە زمانی – سانسکریت – نووسراوە دەربارەی ژیانی سەرەتایی ئەم گەلە هەندێ شتی روون کردۆتەوە. بەشێکی تر روەو رافیدەین کۆچیان کردوە، کە لە نێوانیاندا دوو هۆزی خاوەن دەسەلات و ئازادا بوناوی( ماد ) و( پارس ) هەبوون. هاتنی مادەکان لە رۆژهەلاتی دەریای خەزەرەوە سەدەی( ٩- ٨ ) پ ز پێش ئاشووریەکان باسکراوە ئاشوریەکان بە مادو مادا ناویان بردوون. ئەم نەتەوەیە لە ناوەراستی سەدەی نۆهەم لەژێر فەرمانرەوایی کەیقوبادی کورد دەولەتێکی بەدەسەلاتیان پێك هێناو( پارس )ەکان لە خواروی خۆیانەوە. ئەژیان دەستیان بەسەرا گرتن و خستنیانە ژێر دەسەلاتی خۆیانەوە.ئەکباتان _هەمەدانی ئێستایان کردۆتە پایتەخت.تا ئێستاش شوێنەوارو کەلاوەکانی پاشماوەی ماد لەناو شاری هەمەدان ماوەتەوە.سالی( ٨٥٣ )پ ز لەسەردەمی سەلمانازاری دووەم یەکەم پەیوەندی نێوان ئاشوورو ماد دەستی پێ کردوە.ئاشوریەکان هەتا کاتێ لە دەسەلات کەوتن و کۆتاییان پێ هات هەمیشە لەگەلْ مادا لە شەروو شۆر بەربەرەکانێ دا بوون. پرۆفیسۆر سایس ئەلێت: _مادەکان هۆزێکی بە دەسەلاتی کورد بوون.لە وولاتی ئاشوردا جێگیر بوونو تا خوارووی دەریایی خەزەر فەرمانرەوایان بەشی

زۆریان له زمانی هیندو ئەوروپی و له ئەوەی ئاری بوون.ئەو باسه لەگەڵ مێژووەکانی کوردو یۆنان جیاوازی نیه.تەنها ئەوە ئەبێت که ئەڵێت مادەکان له وولاٚتی ئاشور جێگیر بوون.بەلاٚم مادەکان دراوسێ ی ئاشوریەکان بوون له ئەنجامدا که کوتایان به دەوڵەتی ئاشور هێناو وولاٚتەکەشیان داگیر کردن.هەندێ له مێژوو ناسەکان ئەڵێن(سەلمانازار) ناوی مادەکانی ناوە( ماد )بەلاٚم له کاتێکیدا سەلمانازار باسی گەشتەکەی خۆی بۆ ڕۆژهەلاٚت و خوارووو ئەنوسێ ناوی دوو کۆمەڵی هێناوە که له گەڵیانا به شەڕ هاتووە( پارسوا_ئامادا )ئەك له خۆیەوە ئەم ناوەی لێ نابێت.

( هۆزەکانی ماد )

مادەکان له دوو هەزار ساڵ پێش زاینەوە بریتی بوون له حەوت هۆز بەم شێوەیە :

١ )پارتاسنی _له ناوچەی وارەمین و ڕێ_تاران_ی ئێستاو کەناری دەریای خەزەر نیشتەجێ بوون.

٢ )بوزیابوس_له پێشدا له دەورو بەری دەریای مەزندەران ژیاون و له پاشدا بەرەو هەمەدان و عێراق کۆچیان کردووە بلاٚو بوونەتەوە.

٣ )ئاسترۆشات:_لەناوچەی سەمەر قەندو خوارزم بەکشت وکاڵ و ئاژەڵداریەوە خەریك بوون.

٤ )ئاریزانت_له ناوچەی ئازەربایجان ڕوباری ئاراکس و( ئاراس )دا جێگیر بوون.

٥ )بودی_ئەمانه بەرەو خوار بوونەتەوە له ئاورێژگەکانی هیندوستاندا جێگیربوون.

٦ )ماژ_ماك_ماخ_ماگوش_عەرەبەکان( مەجوس )ئەڵێن ئەم هۆزە له سەرەتادا برەویان به ئاینی زەردەشتدا.

٧ )دەربارەی هۆزی حەوتەم تا ئێستا هیچ ڕوون نیه بەلاٚم وەك دەر ئەکەوێ ئەڵێن( دیلاٚم )ی ناوبووە که له ناوچی دیماستان( مازندەران گیلان )بلاٚو بوونەتەوە مەڵبەندیان دیلمان بووە.هیرۆ دێت باسی شەش هۆزی کردووە ناوی حەوتەمین

نەبردووە( پیرینا ل ٤٩ )ئەم هۆزانە هەرچەند لەیەك دوورو بڵاو بوون بەڵام لە کاتی تەنگانە پێویستدا یارمەتی یەکتریان داوە. لەسەردەمی سەلمانازاری دووەم ساڵی( ٨٥٣ ) پ.ز لە شکری ئاشور تووشی بووە بە تووشی هۆزە مادیەکان لە ڕۆژهەڵاتەوە ئەم هۆزە یارمەتی کەل و پەلی ناردەوە بۆ ئاشوریەکان بەڵام ئاشوریەکان بیریان لەوە نەکردۆتەوە کە کورد ئەمەیان بەسەرا نەزانیوە.( ئازادد نێراری سێیەم سلی( ٨١٢_٧٨٣ )پ ز چەند جارێك لە گەڵ مادەکاندا بەشەڕ هاتەوە تەگلات پالازاری دووەم( ٧٤٥_٧٣٠ )پ ز بەناوی یارمەتی دەوڵەتی( نۆدارتوو )وە لەشکری گرتۆتەوە سەر وولاتی ماد وەك ئەگێڕنەوە تا دامێنی چیای دەماوەندی داگیر کردووە[٦٢].ساڵی( ٦٨١_٦٦٩ )پ ز سەردەمی( ئاسر هارون ) دەوڵەتی ماد ویستوویەتی لەگەڵ دۆستانەوە هاو پەیمانی خۆی وەك و(مانی ،سیت،کاسا )و هۆزە کوردەکانی کوردستانی ڕۆژ ئاوا هێرش بکاتە سەر وولاتی ئاشور. ئاشوریەکان هەوڵیاندا( سیتەکان ) یان بەرەو لای خۆیان ڕاکێشاوە لە مادەکانیان هەڵگەڕاندنەوە ئەم کارە تۆزێك ترسی لەسەر ئاشوریەکان لابردووە بۆ ماوەیەك ڕزگاریان بووە.بەڵام مادەکان دەستیان هەڵنەگرتوە چاوەڕوانی هەلی بوون بۆ پەلامادانی ئاشوور.

فەریبەرزی چوارەم فەرمانڕەوای ماد ساڵی( ٦٣٤ ) پ ز هێرشی کردۆتە سەر وولاتی باشوور لە شەڕێکی سەخت و دژواردا کوژراوەو سوپاکەی شکاوە. کواکساری کوڕی لە تۆڵەی خوێنی باوکیدا لە شکرێکی گەورەی پێکەوە ناوە هێرشی کردۆتە سەر وولاتی ئاشورو بە تەواوی سەرنگونی کردن و وولاتەکەی داگیر کردن.

نایری – نائری – ئەم هۆزە ئازاو دلێرە پێش هاتنی مادو پارس بۆ خاکی ئێران لە کوردستانی ڕۆژ ئاوادا ژیاون. هەرچەندە لە پاشماوە دێرینەکاندا لەبارەی نایریەوە هیچ نههاووە بەڵام لە سەردەمی فەرمانڕەوی ئاشورەکاندا باسی ئەم هۆزە کراوە. وەك باسمان کرد ئەمانە بەشێکن لە هۆزی سۆباری کۆن کە وردە وردە وشەی نایری بەسەر سۆباری دا زاڵ بووە یاخود لەبەر ئەوەی لە دەوروبەری( نههاری – دیجلە ) دا. ژیاون نههاریان بەسەردا بڕابێت و نههاری ی کرابێت بە نایری. لەوە ئەچێ دێهات و تیرەی( لوری شەمدینان ) و( ندری ) دەوروبەری سنە لە پاشماوەی ئەم نایری یانە بن. مێجەرسۆن

---

[٦٢] مێژووی ڕۆژ هەڵاتی نزیك ل ٤٤٦

ئەڵێت( ئەهەر سەریری لاپەرەکانی مێژووی کوردستان لە سەدەکانی( ١٢، ١٥ ) پ ز بکەین یەبینین مادەکان بریتین لە هۆزی ئامری ئەگەر ئەم قسەیەی مێجەرسۆن ڕاست بێت، مادەکان لە کوردەکانی ئارارات بن و لە پاشدا وەك گودیەکان بەرەو رۆژهەلات رۆیشتوون. ئەم ڕایە پێنجەوانەی پاشماوەی سەدەی نۆهەم وهەشتەمی پ ز ی ئاشوریەکانە. ئاوو دەسەلات و ئازایەتی ئایریەکان لە سەردەمی فەرمانڕەوییاندا هەموو هۆزەکانی تری دراوسێ یانی سەرکوت کردبوو. ئەمانە لەژێر ئاوی کوردا زۆر دەسەلاتیان پەرەی سەندو پایتەختیان لە دەراوی زێ ی گەورەدا بووە. ئینسکلوپیدیای. ئیسلام ئەڵی :
- تەگلات پالازاری یەکەم لەگەڵ ٢٣سەرکردەی ئایری دا شەری کردوە. لە دەشتی( مەلازگرد ) لای سەرچاوەی دیجلە دیوارێکی ستوون گەورەی دروست کرد کەتێدا باسی چۆنیە ئەو شەڕانەوی نووسیوە. ئەم هێرش و پەلامارەی تەگلات لازارە بۆ سەر ئایری یەکان تەنها بۆ لاواز کردن و هەل بەدەست هێنان بووە ساڵی( ٩١٠ ) پ ز دا سوپای ئاشوور دیسانەوە هێرش دەباتەوە سەر ئایری یەکان و لە نێوان دیجلەو ئارارات دا بەیەکدا دێن و سوپای ئایری تێك ئەشکێ زۆربەی فەرمانڕەواکانی ئاشور لەگەڵ هۆزی ئازاو دلێری ئایری دا هەمیشە لە شوڕو شەڕو بەیەکدا چوون دا بوون( توکولتی نینین ) ی دوەم زۆر بەزەحمەت توانی لە ولاتی ئاشوور دەریان بکات و تا پشتی چیای گودی راوی نان[61].
سە نحاریب – ی فەرمانڕەوای ئاشور ساڵی( ٨٠٥ – ٦٨٢ ) پ ز و لە ساڵی( ٦٦٩ ) پ ز دا لە دەورو بەری سەرووی زێی چیای گودی لە گەڵ ئایری یەکاندا شەڕی کردوەو ئەمەی بە( پێنجەمین ) شەڕ داناوە لەگەڵیاندا.( مێجەرسۆن ) ی کورد ناس ئەڵێت بەشی سەرووی زێی گەورە ولاتی ئایریەکان بووە. ئەو هۆزانەی لە دەورو بەری سەرچاوەی دیجلەو فورات و سەروی( نیفانس ) یانی( دیاربەکر، خەرپوت، درسیم ) و شاخی( بەتلیس و تۆرس ) بوون لە لایەن تەگلات پالازارو ئەوەکانیانەوە هەر بە ئایری ناسراون. ئەم ویلایەتانە بریتین لەو شوێنەی کە لە پاش ئەمانی دەوڵەتی ماد جێگای فەرمانڕەوایی کوردان بووە ساڵی( ٤١٠ ) پ ز لە سەدەی ناوەڕاستی فەرمانڕەوایی هاخامەنشینی دا ئەمانە بابا گەورەی کوردی ئەمڕۆو ئەوەی مادی پێشوون.

---

[61] مێژوی رۆژهەلات ی نزیك ل ٤٦٢

٢-کاردۆخی -( کاردۆخوی، کاردۆسی، کاردۆستۆی)، رۆژهەلآت ناسەکان لەسەر ئەم هۆزە دوو رایان هەیە، ێ – لەوە ئەچیٚ لەوشەی گوتی کۆنەوە وەرگیرابیٚت کە بریتین لە کوردەکانی بەشی ئارارات کە وردە وردە گوتی بوە بە کوتی لە پاشدا بە کورتی و کوردی و لە ئەنجامدا بە کاردۆخی( مستر دراواری) رۆژهەلآت ناس ئەلیٚت( ع وشەی کورتی سەردەمی توکولتونیٚراری ئاشورو کاردای سەردەمی( ئاراد ئانار( ی لاگاش و کاردۆ خۆی، کاردۆ شۆی گەزنەفون و هەر ناوٚیك لەم بارەوە و ترابیٚت هەموو بە کورد ناو براون و بریتین لە کۆمەلی کورد[٦٥] بە پیٚ ی ئەم رایانە ئەبیٚت ئەم کاردۆخیانە پاشماوەی کوتی کۆن بن و و شۆمیٚرو ئەکاد ولآتەکەیانی داگیر کردوە( ئەمانە لە بەشی منقومەی زاگروس ان، ب – لەوە ئەچیٚ کۆمەلی( کاردۆشی) لە کاتی هاتنی( مادو پارس) بۆ خاکی ئیٚران یا لە ناوەراستی سەدەی حەوتەمی پیٚش زاین هاتبنەخاکی کوردستان و جیٚگیر بووین، وردە وردە هۆزەکانی کوردستانیان لە خۆیان نزیك کردبیٚتەوە. رای( سیٚر سدنی سمیپ) وایە کاردۆشیەکان زمانیٚکی جیاوازیان هەبووە و هیچ پەیوەندیەکیان بە پارسەکانەوە نەبومو زۆر لەوانیش کۆنترن. جگە لەو هۆزۆ تیرانەی کورد چەندین هۆزو تیرەی تری گەورە هەبوون کە جار جار لە پاشماوە دیٚرینەکاندا بەدی ئەکریٚن. بۆ وینە( سیٚر ئالی میتد) ئەلیٚت( هۆزی موسەری کەبابا گەورەی( مسومری مزومری) یەکانی ئەمرۆن لە سەردەمی سەنحاریب سالی( ٧٠٥ – ٦٨٣) پ ز لە نیٚوان دوو لقی ناوی خەزمردا جیٚ گیر بوون[٦٦] بنکە لە سەروی زاخۆ وە جیٚ گیر بوون( پیتی د) کراوەتە( ت). بە پیٚ ی میٚژوو دۆزراوە بەنرخەکان بۆمان دەرئەکەویٚ لە سەردەمیٚکی زۆر دیٚرینەوە کاتی کۆچ کردنی کوردی رۆژهەلآت و رۆژئاوایی بۆ شۆینی ئیٚستایان مادو پارسیش بەرەو خاکی ئیٚستایان هاتون و نیشتە جیٚ بوون کوردستانی ئەمرۆ نیشتمانی هۆزیٚك بوە پیٚیان وتوە( گوتی یا گودی) یانی کوردە ئاراراتیەکان کە( کورتی) یا( کورددان)یشیان پیٚ وتوون. ئەم هەموو ناوو ناڵۆ گۆرە لە زامنی هەر کەس و هەر تیرەو هۆزیٚکەوە هاتبیٚ بە مانای ئەتەوەی گەورەی کورد هاتووە. کە بریتی بوون لە چەندین هۆزو تیرە کە زامنی تایبەتی خۆیان هەبووە. ئەم هۆزو تیرانە هەرچەندە خۆیان پاراستوە لە تیٚکەل بوون لەگەل ئەتەوەکانی

---

[٦٥] دکتور سپایزار- یش هەمان رای هەیە

[٦٦] میٚژووی ئاشوور ل ٣٦٦ە

تر ئەیان هێشتوە ئاین و خوێن و رەوشیان و زمانیان تێك بدەن. پاش ئەوەی( ماد و پارس ) فەرمانڕەوایی خۆیان لەدەست ئەدەن پارسەکان ئەکەونە ژێر دەسەلاتی ئەشکانیەکانەوە. مادەکان خۆیان لەم ژێر دەستیە دور ئەخەنەوەو ئەچنە شاخ و ماوەیەکی زۆر بە ئازادی ئەژین و ئاچنە ژێر دەسەلاتی ئەشکانیەکانەوە ئاویان لە مێژوودا بە کوردوان یانی کوردەکان هاتووە ولەژێر ئەم ئاوەدا ئاوبانگیان دەکردوە گەزنەفون ئاوی ئاون( کاردۆخوی ) دەربارەی ئەمانە کتێبێکی داناوە لەژێر ئاوی گەڕانەوەی دە هەزار یونانی – دا. هەر کەس سەرنجێکی ئەو کتێبە بدات بۆی دەر ئەکەوێ کە ئەم سەرداره یۆنانیە چەند تووشی دەردە سەری و زەحمەت بووە بە دەستی کوردەکان لە ناوچەی( ئانتی توروس ) هەکاری ) یا کوردستانی مەرکەزی دا. مێجەر سۆن ئەڵێت ڕێگای نێوان موسڵ و ئۆرفە کە بریتی یە لە دەشت و چیا لە مێژوودا بەناوبانگە لە نێوان ویلایەتی سەروو خوارەی الجزیرە( میسوپوتامی ) سنوورێکی ڕێك و پێك و ڕامیاری هەبووە. شاخە بەرزەکانی تۆرعابدین کە لە کۆندا بە( نیڤات ) بەناوبانگ بووە ئێستا لەیاد چۆتەوە.

سەرچاوەی ڕوباری دیجلە لە کۆندا بە( نیگریس ) ناودار بووە. لە سەردەمی تەگلات پالازاری یەکەم( ۱۱۰۰ ) پ ز چیاکانی نیفات ئەکەوتە سەرووی سنووری ئاشوورەوە ولاتی ئایری دراوسێ ی ئاشوورەکانە. تەگلات پالازار هەمیشە حەزی کردوە ئەم ولاتە داگیر بکات لە پاشدا ناوی ناوچەی ئایری گۆڕا بە کوردوان یا کوردۆ. لێرەدا بۆمان دەر ئەکەوێ کە کورد زۆر لە سەردەمی زوحاك کۆنترە بەلام هەندی لە مێژوو ناسەکان زۆر بێ ئاگایانە نووسیویانە کە کورد لە بەرەی یاخی بوەکانی سەردەمی زوحاك – ن. ئەتوانین بڵێین کورد پێش کۆچکردنی ئاری بۆ ناوچەی کوردستانی ئێستا ئەمانە لێرەدا ژیاون و بلاو بوونەتەوە.

## هۆزو تیرەو لقەکانی کورد

هۆزو تیرەو لقەکانی کورد بریتین لە نزیکەی( ٥٠٠ ) بەش لە کوردستان و دەورو بەری هەندێ وڵاتی دراوسێ بڵاو بوونەتەوە. مێژوو ناسەکان هەموویان بە شێوەیەکی گشتی باسی هەموو تیرەو هۆزەکانیان نەکردوە. هەر یەکەیان ناوی هەندێکیانی بردوە. بۆ وێنە مەسعوودی لە کتێبی – مروج الذهب – دا ناوی چەند هۆزێکی کەمی بردوە لە کتێبی( النفسیه ). دا تەنها ناوی یەك هۆز( بازیجان ) زیاد کراوە ئەستەخەری لە ( ل ١١٥ ) ی کتێبەکەیدا ناوی سێ هۆزی بردوە. ناوو شوێنی دانیشتنیانی لە خشتەیەکدا دیاری کردوە هەروەها لە لاپەرە( ٩٨ ) دا ناوی( رموم ) ی بردوەلەپاشدا ناوی( ٣٢ ) هۆزی کوردی نووسیوە کە لە وڵاتی فارسدا ئەژین( ابن حوقل و مقدسی ) داکۆکی ئەم بیروڕایە ئەکەن و ژمارەی ڕەشماڵە کوردەکانیان بە( ٥٠٠ ) هەزار کەس داناوە. لە( فارسنامە، مسالك الابصار. معجم البلدان. صبح الاعشی، التشقیف ) ناوی بیست ویلایەت براوە کە نیشتمانی کورد بووە لە پاشدا ناوی بڕێك هۆزو تیرەی کورد ئەبات. ئەتوانین بڵێن هیچ کەسێك لەم مێژوو نووسانە بەتەواوی ناوی هۆزو تیرکانی کوردیان نەبردوە هەروەها مێژوو نووسان( دەۆست و خانیکۆف ) و( دکتور دانیلو ) نەیان توانیوەبە تەواوی دەربارەی هەڵس و کەوتو خوو ڕەوشتی کوردو تیرەو هۆزەکانی بە شێوەیەکی زانستی بنووسن[١٢].
لێرەدا بەشێوەیەکی کورت باسی هۆزو تیرەکانی کورد ئەکەین ئەوی شیاوی باس بێت وە بە کورتی ژمارەی خێزان و شوێنی دانیشتنیان دیاری ئەکەین بە پێ ی پیتەکانی ئە بجەدی.

---

[١٢] ئەو کەسانەی ئەیانەوێ لە هۆزو تیرەکانی کورد شارەزا بن سەیری ئەم سەرچاوانە بکەن :-( مجموعە ملاحظات و اخبار حول کردستان ل ٦٨٦ میسێو ئەلەکسەندەر ژابا. کتێبی مسیو نیکیتین و بەرگی بیست و یەکەمی ئەنسکلوپیدیای گەورە کتێبی( هانری ) و( کە پتان های ) و( مێجەرسۆن ) و کتێبی( سیرمارکت سایکس. پسین میران خلیفە ) و پرۆفیسۆر( ئاکیازارۆ ) دکتور( ریچ ) ( ئارکالیان ) و( مورگان ) و شەرەفنامە.... هتد

ئه‌تمانیکان – نزیکه‌ی(٥) هه‌زار خێزانی کۆچه‌رین له‌ ناوچه‌ی به‌تلیس و بۆتان و مووش و ئه‌نقه‌رەدا بلاو بوونه‌ته‌وه‌.

ئاخه‌ سووری – نزیکه‌ی په‌نجا خێزان ئه‌بن به‌شێکن له‌تیره‌ی مه‌نده‌می و له‌ گه‌رمیانی کوردستاندا جیٚ گیرن.

ئاخ چه‌شمی – ئاق چه‌شمی – نزیکه‌ی( ٢٠٠ ) خێزانن له‌ رۆژئاوای( سیواس ) دان.

ئاده‌زکانی – ئه‌م هۆزه‌ له‌ ناوچه‌ی فارسدا جیٚ گیرن( ابن حوقل ) له‌ دیوانی الصداقه‌ ل ١٨٥ – ١٨٧ – و مقدسی و ئه‌سته‌خه‌ری.

ئادمانلی نزیکه‌ی ١٨٠ خێزان ئه‌بن له‌ ناوچه‌ی بایه‌زیددا

ئارتۆس – له‌ چه‌ند تیره‌یه‌ك پێکهاتوون نزیکه‌ی چوار هه‌زار خێزانن له‌ ناوچه‌ی موسڵ و زاخۆو دهۆك بیت الشباب و خۆشاب و شتاخ دا جێگیر بوون ئه‌مه‌ش ناوی تیره‌کانه‌ عزالدینی، مه‌رزه‌کی، مامه‌ره‌شی، مامه‌ند، ئالان، بروز، جریکی، شێدان، مامخۆر، خاوێستان، شه‌رڤان، ماوه‌دان، گاودان، زه‌نگی، زیره‌ك، هاڤیجان.

ئازادبه‌ختی – له‌ ناوجه‌ی خوره‌م ئابادو دلفان و خاومو گرهان – دا بلاوبونه‌ته‌وه‌.

ئازاددوختی – له‌ ناوچه‌ی فارسدا جیٚ گیربوون( ابن حوقل له‌ الصداقه‌ - استخری –

ئاشمیشارت – نزیکه‌ی( ٥٠٠ ) خێزان ئه‌بن له‌ ناوچه‌ی خه‌رپۆتدا بلاو بوونه‌ته‌وه‌ هه‌موویان زازاو مه‌زهه‌بیان شیعه‌یه‌.

ئاکۆ – نزیکه‌ی هه‌زار خێزان ئه‌بن له‌ سه‌روی رانیه‌و ناوچه‌ی هه‌ولێر دان.

ئالاك – فارس نامه‌ ئه‌لێت ئه‌مانه‌ له‌ کورده‌ فارسه‌کانن.

ئالیکایلی – سه‌دو په‌نجا خێزانێکی بلاون.

ئامه‌رزان – چه‌ند خیزانێکن له‌ ناوچه‌ی( سیوه‌رك ) ن.

ئایرۆ – نزیکه‌ی( ١٠٠ ) خێزانیکی کۆچه‌رن له‌ ناوچه‌ی موسڵ دا ئه‌ژین.

ئه‌بوتایه‌ر – چه‌ند ره‌شماڵێکن له‌ ناوچه‌ی( سیوه‌رك ).

ئاجاخی – چه‌ند خێزانیکن به‌( ئاجاخ کاخدری ) به‌ ناویانگن له‌ ناوجه‌ی سابلاخ و موکری ئه‌حمه‌د زه‌مینه‌ڵ – له‌ ناوچه‌ی( سنه‌ ) دان.

ئه‌حمه‌د وه‌ند – به‌هه‌مه‌وه‌ند به‌ناوبانگن.

ئه‌ختیار دینی – له‌ نه‌وه‌ی ئه‌میر ئه‌ختیارمه‌دین ی سه‌رداری بانه‌و سنه‌ن.

ئه‌رده‌لان – له‌ شاری سنه‌و دێهاته‌کانی ده‌ورو به‌ری شاری تاران بلاو بوونه‌ته‌وه‌. فه‌رمانداراانی سنه‌ له‌م بنه‌ماڵه‌یه‌ن. ئه‌رده‌لانیه‌کان له‌ سه‌ره‌تاوه‌ فه‌رمانڕه‌وای شاره‌زوور

بوون له پاشدا ناوچەی – سنه - یشیان خستۆته ژێر دسەلآتی خۆیانەوە جارێك له ژێر دسەلآتی ئێران و جارێك لەژێر دسەلآتی تورکدا بوون ماوەیەکیش سەربەخۆ بوون.
ئارۆك – یا بۆرۆك یا ئارۆك چیلی ٤٠٠ خێزان ئەبن له نێوان ئەماسیەو گۆفاندا.
ئازەلی – بریتین له چەند ڕەشمالێك له ناوچەی مووش.
ئیسحاقی – ئەمانه له ناوچەی فارسدان.
ئیسماعیل عوزمیری – نزیکەی( ٦٠٠ ) خێزانن له زستاندا له خاکی ئێران و له هاوین دا له نێوان دوکان و تۆقمان و سورداش دان.
ئاشتەم هاری – ئەم هۆزە له ناوچەی فارسدا بوون.
ئەشنویە- له ناوچەی شنۆو لچان دان.
ئالقاس – یا ئالقاس ئەلێن نزیکەی( ٥٠٠ ) خێزانێك بوون لەخواروی رۆژهەلآتی حەلەبدان چیایەك بەم ناوەوە هەیە.
ئالیا – ئەمانه کۆچەرین له دەورو بەری خەرپوت ژیان بەسەر ئەبەن.
ئیمامی – ئەمانە جاف –ن نزیکەی( ٧٠ ) خێزانێك ئەبن له جوانرۆدا.
ئەمبارلو – ئەنبالویا – هەمبارلۆ له عیراقی عەجەم دا بلآو بوونەتەوەو بەشێك له لورەکان بەم ناوە بانگ ئەکرێن.
ئەورامی هەورامی – خۆیان بەئەوی بەهمەن ئەزانن و له ناوچەی هەورامان( سنه )دا دوو هەزار خێزان زیاترن.
ئایله رووتی – ئەمانه بەشێکن له - ئێناخی – ەکان له زستاندا له دەورو بەری سیروان و له هاوین دا له نێوان هەورامان و جوانرۆدا ئەگەرێن.
ئایناخی – نزیکەی( ٥٠ ) خێزانن له ناوچەی بلوك و جوانرۆو له هاوین دا بەرەو چیای شاهۆ ڕۆیشتوون. ئەمانەش جاف- ن ناوی بابا گەورەیان – ئیناق – بووە.
ئەیوبیەکان ئەمانه بە( ئال ئەیوب ) یا فەرمانڕەوایانی میسرو شام بەناو بانگن سەلاحەدینی ئەیوبی لەم هۆزەیە. له ناوچەی کەرکوك و دەوروبەری بلآو بونەتەوە.
ئایولۆند – یا ئایتی وەند نزیکەی هەزار خێزانێکن له ناوچەی دلفان و تەرهان و پیشکۆدان.

-ب-

بابا جانی – لەگەڵ تیرەی قوبادی دا نزیکەی( ٨٠٠ ) خێزان ئەبن له بەشی جافەکانی جوان ئەمیر تەیمور ئەمانەی له خاکی عوسمانیەکانەوە بەرەو ئێران گواستەوە هەندێکیان له ناوچەی کەرمندا ماونەتەوە.

بابان – ئەمانە لە سەردارەکانی( بەبە )ن و لە ناوچەی سلێمانی و سنەدا بلاو بوونەتەوە لە بەشی کرمانجن. ئەمانە زۆر بەرێزەوە ناوی خالیدی کوڕی وەلید ئەبەن وەك ئەڵێن خالید ئەمانی موسوڵمان کردوە. بە پێچەوانەی ئێرانیەکان کە عومەری کوڕی خەتاب موسوڵمانی کردن کەچی خراپەی ئەڵێن.

باجەلان – ئەمانە بریتین لە دوو بنەماڵە( جەمورو قازانلو ) و لە تیرەی( لەك ) ن لە هۆزی لوڕی گەورە نزیکەی( ١١٠٠ ) خێزان ئەبن لە دەورو بەری قۆرەتو هۆرێن و شێخان و قەسری شیرین و قازانیەو مەندەلی دا جێ گیر بوون. نزیکەی( ٧٠ ) خێزانیان چوتە ناوچەی قەزوین.

بادەلی – نزیکەی( ١٠٠٠ ) خێزانیان لە ئالشگرو یۆزی دایەو( ٧٠٠ ) خێزانیکی تریان لە ناوچەی زازادایە هەموویان شیعە مەزهەبن.

بادینان – یا بەهدینان یا فەرمانڕەوایان عەمادیە بابا گەورەیان ناوی بهاو الدین بووە. ابن خلدون لە باسی بەربەر دا ئەنووسێ بادین کوردن و لە ولاتی جەزائیردا دائەنیشن.( تێ بینی – ناوچەی بادینان ناوەندی دینی زەردەشتی کوردو هۆی پەرە پێ دانی ئەو دینە بووە بە بەدینان ناوبانگیان دەرکردوە. فیردەوسی لە شانامەدا بە – دینی بەهی – ناوی سەردەشتی یانی بردوە ).

باران – هۆزێکن لە ناوچەی سیوەرکدا.

بارزان –( ٢٧٥٠ ) خێزانن لە سەروی زێ ی گەورەن لە ناوجەی زێبارو موسڵ دا جێ گیرن باریسان مەسعودی ل – مروج الذهب – دا ئەڵێ ئەمانە لەگەڵ هۆزە شاخاویەکاندا ئەژیان[٦٨].

بازۆکی – لە ناوچەی تاران و قەزوین بلاوبوونەتەوە. دکتور فریح ئەڵێ نزیکەی پێنج هەزار خێزانی بازۆکی لە ناوچەی ئەریڤـاندا ئەژین[٦٩].

بازیکەلی – نزیکەی( ٧٠ ) خێزان ئەبن لە ناوجەی – مەلازکرد – نیشتە جێن.

---

[٦٨] مەبەست لە جبال الاکراد ە کە ولاتی عەرەب لە ولاتی عەجەم جیا ئەکاتەوە. لەشاخەکانی هەمەدان شارەزوورەوە دەست پێ ئەکات تا سنووری ویلایەتی تەکفور.

[٦٩] کورد لر لاپەڕە( ٣٥ ).

بازینجان – مەسعودی و یەعقوبی و ئە ستەخەری ئەڵێن لە ناوچەی ئەسفەهاندا ئەژین.

باسیر – یا باسری یا باسیریە لەئەنسکلۆپیدیای ئیسلامی دا وشەی( مابیر ) هاتووە. لە سەرەتادالە شارەزوور ژیاون و لە پاشدا ڕومو شام و میسر کۆچیان کردوە.

باشمانلی – لە نێوان مەلازگردو ئالشگر دا ئەژین.

باشناوەی – لە ناوچەی زۆزان دا ژیاون. معجم البلدان ئەڵێ ناوچەکە بریتی یە لە موسڵ و خیلات و سەلماس. لەم ناوچەیەدا تەلارو دیواری زۆر هەیە.

باشۆکی – لە ناوچەی ڕەوانسەری سنەدان.

باکیلی – ئەستەخەری و ابن حوقل و مقدسی ئەڵێن لە ناوچەی فارسدا ئەژین بەلام مقدسی لە بری باکیلی – سالانی – نووسیوە.

بالابرانلی – ٥٦٠ ) خێزانن لە ڕۆژ ئاوای کەناری فورات دەورو بەری ئاکێن و خواروی ئەرزەنجامیش هەن.

بالاوەند – زیاتر لە( ٢٠٠ ) خێزان ئەبن لە ناوچەی هەلیلان و زەردەلاندا ئەژین بالا گرێوە لە لورەکای ناوچەی کرماشان – ن.

بالەك –( ١٢٠٠ ) خێزان ئەبن لە ناوچەی سەرووی ڕوباری ڕەواندوزدان ئەژین نزیکەی ( ٦٠ ) دێ ئەبن

بالەکان – نزیکەی ( ٢٠٠ ) خێزان ئەبن لە هۆزی زرزارن بە ناوی دێ کەیانەوە ناونراون.

بالەیان –( ٧٠ ) خێزانێك بوون لە ناوچەی خۆی دا.

بالیلوەند – یا بالیوەند.

بانەیی – نزیکەی ( ٢٥٠٠ ) خێزانن لە ناوچەی( بانە ) دا( ١٤٥ ) ئاوایی پێك دێنن لە ناو شاری( بانە ) دا زیاتر لە( ٨٠٠ ) خێزان پێك ئەهێنن.

بادەنوری – لە ناوچەی خوراسان دا ئەژین.

بەختی – بەختیان یا بۆتان بریتین لە چوار تیرە( سەندی، محەمەدی، راستی. دەنیکی ) نزیکەی( ٣٠٠٠ ) خێزانن. لە ناوجەی – زەرزان – هەزاریان لە ناوچەی موسڵ و( ٥٠٠ ) یان لە ئاگرێن ئەمانە لە ناو هۆزە کوردەکانی تردا بلاو بوونەتەوە.

بەختیاری – ئەمانە بەشێکن لە هۆزی لوڕی گەورەو لە دوو لق پێك هاتوون( چوار لنگ ) و( حەوت لنگ ). چوار لنگی لە ناوچەی بروجەرد و گوڵپایگان حەوت لنگ. لە کرماشان و ئەسفەهان و شوشتەرو زەرد کۆدا ئەژین. ئەمانە زیاترین لە( ١٠ ) هەزار خێزان. ئەم دوو لقە( ٣٥ ) تیرەن( ١ ). دکتور فریح لە کوردلر دا ئەڵێت ئەم بەختیاریانەلە نەتەوەی کوردن رۆژهەلاتناس – کرزن – ژمارەی بەختیاریەکانی لە ساڵی( ١٩١٨ ) دا بە( ١٧٠ ) هەزار کەس نووسییوە. بنەچەی ئەمانە ئەگەڕێتەوە بۆ کشتاسبی کوڕی کیانی.

بەدری – ئێستا بلاوبوونەتەوە.

بەدلیسی – یا ئەمیرەکانی بەدلیس

براخۆی – پانتایی خاکی براخۆی یەکان نزیکەی( ٢٢٠ ) میل ئەبێت ژمارەیان زیاتر لە( ٣٠٠ ) هەزار کەسە لە ناوچەی کەلات دا بوون ئەمانە فەرمانڕەوای دەوڵەتی بلوج یان کردوە. بڕیك لە بنەماڵەی کامێران لە هیندستان جێگیر بوون ئەمانە هەمووی سونی مەزهەبن.

برادۆست – نزیکەی( ٣٠٠٠ ) خێزانن لە ناوچەی ڕواندوزو پارێزگەی هەولێردا لەم تیرە پێك هاتون.( سۆماڵی – تەرکەوەری ).

بەراز – ئێستا نزیکەی ١٠٠ خێزان ئەبن لە هۆباتو قۆرەتوو مەریوان و سنەدا جێ گیرن ئەم تیرەیە لە ئەوەی کەی ها ساڵحن کە ئەمیر دەری کردون هاتنە کوردستانی ئێران.

بەراز دوختی – ئەمانە لە خاکی فارس دا بوون( ئەستەخەری و مقدس و ابن حوقل ).

بەرازیە – نزیکەی( ٩٠٠٠ ) خێزانن لە هۆزی( بریزانلی ) لە ناوچەی( سروج ) دا نیشتە جێ بوون. ئەم هۆزە لە دوانزە بنەماڵە پێك هاتووە( کیتکان، شیخان، نۆکیان، شەدادان، مەنلی دینلی، معافان، زروان، پێنجان، قەرکێجان، دینان، میردیدان )[70].

بەرزنجی – نزیکەی ١٥٠٠ خێزانن و لە ناوچەی کەرکوك و سنەو خانەقین ئەمانە ساداتی بەرزنجە نین جیاوان.

بەرکیلی – هەزار خێزانن لە خوارووی قەرە شار، لە کەناری ڕوباری قزل ئێرماق.

---

[70] نووسەر تەنیا ناوی( ١١ ) ە یانی نووسیوە

بەرواری – ١٧٠٠ خێزانن لە سەروی ڕوباری( کارە ) کە ئەڕژێتە زێی گەورەوە بڵاو بونەتەوە بریتین لە دوو تیرە(١ ) بەرواری بالا کە( ٧٠٠ ) خێزانن(٢ ) بەرواری خوارو( ١٠٠٠ ) خێزانن.

بەریزانلی – ئەمانە بەشێکن لە هۆزی( حەسەن عەلی ) و لە نزیکی گۆمی وان نیشتەجێ بوون دەورەی( ٩٠٠ ) خێزان ئەبن.

بەشری – ئەمانە لەنێوان سەعدمد میافارقین و دیاربەکر بڵاو بوونەتەوە. بەشێکی تریان لە ناوچەی کرماشان و شیرزاد دان.

بەکران – ئەمانە( ٥٠٠ ) خێزان ئەبن و لە هۆزی( بەکر توانیای ) کۆنن لە زستاندا دەورو بەری دیاربەکر و هاوین ناوچەی سەعدمد شوێنیانە.

بلباس – هۆزێکی گەورەن لە ناوچەی موکری و سابلاغدا ئەژین.

بلیکار – لە سەرووی شاری جولەمەرگ دا ئەژین نزیکەی( ١٨٠ ) خێزانێکن.

بلیکان – شەش هەزار خێزانن زازاو شیعە مەزهەبن لە ناوچەی مرشدا ئەژین.

بلیکانی – لە( ٢٥٠ ) خێزان زیاترن. ژمارەیان نزیکەی( ١٠٠٠ ) کەسێك ئەبێت. ئەمانە گەڕۆکن زیاتر لە ناوچەی مرعش دان.

بلیلومند – یا بالێومند نزیکی( ٢٠٠ ) خێزانن لە هەنگۆژان و ناوچەی ژاومرۆی سنەدا نیشتەجێن. لە نێوان کەرکوك و سلێمانی و لە ناوچەی کرماشان یشدا هەن.

بەنداد مەهلی – ئەمانە لە ناوچەی فارسدا ئەژین " ئەستەخەری و مقدسی و ابن حوقل ".

بەندداکی – ئەمانە لە ناوچەی فارسدا ئەژین " ئەستەخەری و مقدسی و ابن حوقل".

بۆرمکەیی – بابا گەورەیان ناوی( بۆرمکە ) بووە نزیکەی( ٤٥٠ ) خێزانن لە ناوچەی زههاو و لە یلان و هەندێکیان لە عێراق و ئەسفەد ئابادو ناوچەی حوسەین ئابادی سنەدا ئەژین. ئەمانە بەشێکن لە مەمەندیەکان.

بۆزیکان –( ١٨٠ ) خێزانیکی بڵاون.

بۆلێ – لە زستاندا لە دەوروبەری هەولێرو بالەك لە هاوین دا لە ناوچەی کۆیە نزیکەی ١٥٠ خێزانن.

بەهدینان – بادینان هەمان فەرمانڕەوایانی عەمادیەیە کە باسکرا.

بەهاروەند – نزیکەی هەزار خێزانن و لە( کیالان ) و سەرووی دیزفول دان. بەشێکن لە تیرەی دیرکوەند.

بەهتوەنی – یا( بێ تونی ) هەزار خێزانێکن لەسەرووی ڕۆژئاوای کرماشان دا( میر ئەحمدوەند )و( دەم سەفاوەند ) بەشێکن لەم هۆزە.

بەهێرماز – شیعە مەزهەب و زازان لە ناوچەی خەربووت نیشتەجێن لە( ٥٠٠ ) خێزان پێك هاتوون.

بێ بالی – یا( بێبانی ) نزیکەی(٤٠٠ ) خێزان لە قەزای خانەقین و سەرووی کەرکوك و ناوچەی سلێمانی ئەژین.

بێتیاوەند – چەند خێزانێکن لە سەروی ڕۆژ ئاوای شاری مەندیل.

بێتیار وەند – چەند خێزانێکن لە خواروی شاری سنەدا ئەژین.

بێراندەند – نزیکەی( ١٠ ) هەزار خێزانن ژمارەیان کە( ٦٠ ) هەزار کەس زیاترن ئەکرێنە دوو بەشەوە( ١ ) یار ئەحمەد( ٢ ) ماڵ ئەسەد هەردوو بەشەکە لە( ٢٦ ) تیرە پێك هاتوون و هەموویان لوڕن.

بێژندوەند – ئەمانەش دوو تیرەن لە ناوچەی( لفان ) سەفەرخانی. حەیدەر بەگی.

## پ –

پایی – نزیکەی( ١٠٠٠ )خێزانن لە شاخەکانی هەشت بەهلو شیرازو قیراب و سەرووی دیزفول دان.

پاتاقی – لە دەوروبەری کرماشان و ڕۆژئاوای کەرەند جێ گیرن.

بازۆکی – لە ناوچەی ڕەوانسەرو شاخی شاهۆ، هەندێکیشیان لە ناوچەی لەیلاغ دان.

پالانی – نزیکەی( ٣٥٠ ) خێزانێکن لە نێوان زەنگ ئاواو قەرەتەپەو ڕۆژهەلاتی چەمی سیروان و دگاگادا!.

پایرەوەند – دەورەی ٨٠٠ خێزان ئەبن لە شاخەکانی( پڕاو ) و سەرووی ررۆژهەلاتی کرماشان و خوارووی ڕۆژئاوای دینەوەردان.

پەچناوەند – ئەمانە لە ناوچەی خۆراساندان.

پرپیشەیی – لەناوچەی ئەسفەد ئاباد و سنە دا جێگیرن و نزیکی هەزار خێزان ئەبن.
پسانی – ئەولیا چەلەبی لە بەرگی چوار ل ٧٥ دا ئەم هۆزەی بە کورد داناوە.
پشدەری – نزیکەی( ٢ ) هەزار ئەبن لە ناوچەی پشدەر ئەمانە میراودە لیشیان پێ ئەڵێن. یانی لە بەرەی( میرعبدالعلی ) و ئەمانەش لە سێ بنەماڵەن( بابەکرئاغا، مەحموودئاغا، عەباس ئاغا ).
پەبغیتان – نزیکەی( ٩٠٠ ) خێزانیکن لە سەروی سعرد و دەوروبەری موش دان.
پەنیانیشلی – ئەم هۆزە لە ٩ تیرە پێك هاتوون( زەیدان، پارکەشان. کەناربروش، سوورەتاوان، بلیجیان، گۆجی، جلی، نشویلان، موسانان ). نزیکەی( ١٢٠٠ ) خێزانن لە رۆژهەلاتی ورمێ دان.
پەنیجاری –( ٤٥٠ ) خێزان ئەبن لە رۆژئاوای شاری موش دان.
پوران – نزیکەی( ٢٠٠ ) خێزان ئەبن لە نێوان دیاربەکر و موش دان.
پیران – نزیکی( ٦٠٠ ) خێزانن لە سەرووی رانیە و ناوچەی موکری دا ئەمانە بەشێکن لە بلباس.
پیزان – نزیکەی( ٣٠ ) خێزان ئەبن لە ناوچەی لاجان ی کۆن.
پیزیانلی – لە ناوچەی( ئەرزرۆم ) دا ئەژین و دەورەی( ٧٠٠ ) خێزان ئەبن.

-ت-

تاپیان – نزیکەی( ٣٠٠ ) خێزانی گەرۆکن لە خوارووی گۆمی وان دان.
تارابی – بەشێکن لە هۆزەکانی پشتکۆ.
تاراری مرادی – لە قارەخان و کانی درێژدا لە ناوچەی سنەدا ئەژین بەشێکن لە مەمەندیەکان و( ١٠٠ ) خێزان ئەبن.
تاکۆلی – نزیکی –( ٤٥٠ ) خێزانێکن لە رۆژهەلات ی گۆمی وان دان.
تالەبانی – دەورەی( ١٠٥٠ ) خێزانن لە ناوچەی کۆیە و کەرکوك و خانەقین دا بلاو بوونەتەوە.
تاماداتی –( تاهماداهنی ) ئەمانە بەشێکن لە کوردە فارسەکان.
تاوگۆزی – یا تابجوزی نزیکەی( ٥٠ ) خێزان ئەبن لە ناوچەی جوانرۆی سنەدا.

تایشەیی – بەشێکن لە جافەکانی جوانرۆ و لە ڕەوانسەردا جێگیرن.
تەبتەکی – تیرەیەکی بچووکن بەڵام ئازاو شەڕانی لە ئەشکەوتی داود و قەمرانیە نیشتەجێن لە ئەنسکلوپیدیای ئیسلامی دا لە بری تەتەکی( بەستێکی ) نووسراوە.
تەرخانی – بەشێکن لە هۆزی جاف ی مرادی لە ناوچەی شارەزوورو گەرمیان ڕەواندزدا هەن.
تەرهانی – بریتین لە( ١٢ ) تیرە لە هۆزی لەك( ٧٠٠٠ ) خێزان ئەبن هەموویان ئەچنەوە سەر لوڕ ژمارەیان لە( ٤٠ ) هەزار کەس زیاترە لە ناوچەی سایمرە و خاومو تەرهانی لوڕستاندا نیشتەجێن.
تەلیە - بەشێکن لە بنەماڵەی( حسانلو ) لە ناوچەی کەرکاردا نیشتەجێن.
تەمرتۆزەیی – نزیکەی( ٢٠٠ ) خێزانن لە ناوچەی لە یلاخ و سەرووی سنەدان.
تهۆیی –( ١٠٠ ) خێزانیکن لە دورویەری قەزوین دان.
تیرەییەکان –( ٦٥٠ ) خێزانن لە سەرووی دیاربەکر نزیکەی( ٤٥٠ ) خێزان ئەمانە لە( ٢٤ ) میلی ڕۆژئاوای ئەنتەرەدا ئەژین. نزیکەی( ٥٠ ) خێزانن لە ناوچەی کفری و زەردا و کەرکووك و خانەقین دان.
تیلە کۆیی – یا تیلە کۆهی نزیکەی( ٧٠٠ ) خێزان ئەبن لە ناوچەی هۆباتو تیلە کۆ لە هاویندا دەچنە باشماخی سنە.

-ج-

جاف – زیاتر لە( ١٢ ) هەزار خێزان ئەبن و شوێنی هەمیشەییان ناوچەی سلێمانی یە لە زستاندا لە بانی خێلان تا سنووری قزلرباط( قزرابات ) ئەچن. لە بەهاردا لە شارەزوور تا نزیکی سنە ئەچن ئەم هۆزە دوو لقن ١- جافی موورادی ٢- جافی جوانڕۆیی یاخود جافی عیراق و جافی ئێران.
جافی عیراق( مورادی )( ٣٢ ) تیرەن بەم شێوەیە( ڕۆغزایی، گەلالی، تەرخانی. شاتری، هارونی، کەدماڵەیی، عەمەلەیی، بەداخی، سەدانی سەیانی، میکایلی، سمایل عوزێری، شێخ سمایلی، سۆفی وەندی، ئەورۆلی، شوان، شێخ بزمیتی، تەلانی( جافەڕەشکە )، غەوارە، بێ سەری، قەویلەیی، پەرخی، چوچونی، هۆزحەسەنی، ڕەشەوێزی، باشکی،

مرادی، یوسوجانی، یەزدان بەخشی، پشت ماڵەیی، یارومیسی. عیسایی شەرەف بەیانی ).

بەشی دووەم یانی جاف ی ئێران( جوانرۆیی ) ئەمانەش(١٥ )تیرەن بەم شێوەیە( قوبادی، باوەجانی، وەلیدبەگی – وڵەوبەگی، ئێنناخی، نیمامی، دەتوویی، تایشەیی، تاوگۆزی، کەلاشی، نامداربەگی، قادرمیرومیسی، ئەیریزی، میرەبەگی، دڵەتازەیی، داروایشی ).

هەموویان سونی مەزهەبن.

جاکیە – بەشێکن لە تیرەی( حسانلو ).

جەباری – لە نێوان چەمچەماڵ و کەرکوك و شوان لە یلان و وان نزیکەی( ٥٠٠ ) خێزان ئەبن.

جەبارەکی – مەسعودی لە( مروج الزهب ) دا ئەڵێ لە جبل الاکراد ژیاون.

جوبرانلی – نزیکەی ٢ هەزار خێزانن لە نێوان بەتلیس و موش دا بریتین لە هەشت تیرە تۆرینی، تالیکی، ئازۆینی، موخەلی، شادرلی، شیخەکان، مامەخان، عەرەب ئاغا.

جزیریان – نزیکەی( ٣ ) هەزار خێزانن لە ناوچەی جزیرەدا ئەمانەش سێ تیرەن عەزیزیان، کورگێل، هیتك.

جەلال وەند – لە ناوچەی کرماشان نیشتە جێن.

جەلالی – نزیکەی ١٠٠٠ خێزانن لە شاخەکانی ئارارات و ناوچەی ئازەربایجان دان.

جەلیلکانی – بەشێکیان لە ناوچەی وان و هەندێکی تریان لە مرعشدان.

جەلیلی – لە ناوچەی فارس دان( ئەستەخەری، مقدسی، ابن حوقل ).

جەلیل وەندی – لە ناوچەی دینەوەرو دەورو بەری قەزوێنیشدا هەن. هەموویان شیعەن و لە هۆزی گەورەی لوڕن نزیکەی( ٢٠٠ ) خێزان ئەبن.

جەمبور – نزیەکی( ٥٠٠ ) خێزانن لە زەهاوو شاخەکانی( ئاڵەقلاق ) و ناحیەی( ئەسەدئاباد )ی هەمەدان. بنەماڵەیەکن لە تیرەی باجەلان.

جوانی – مەسعودی لە مروج الدهب – دا ئەڵێ: شوێنی ئەم هۆزە لە جبال الاکراد دایە کە عیراقی عەرەب لە عیراقی عەجەم جیا ئەکاتەوە. لەوە ئەچێ( جۆلانی ) بێت لە بریتی( جوانی ) وەك ئەولیا چەلەبی لە بەرگی چوارەم ل ١٧٨ دا باسی کردوە.

جودەکی – لە خوارووی خوڕەم ئاباد دائەنیشن نزیکەی( ٦٠٠ ) خێزانن.

جودی کانلی – ئەکەونە ژووروی گۆمی( قۆچ حەسار )ەوە. نزیکەی( ٢٠٠ ) خێزانن.
جۆزەکانی – لە ناوچەی موسڵ و شاخی گردی دان مسعودی ئەڵێت لەوە ئەچێ ئەمانە لە پاشماوەی کۆمەڵی – گوتی بن.
جۆزیکانی – لە ناوچەی هەمەدان دا جێگیرن.
جولەمەرگی( چۆڵەمێرگ )ی ئەم هۆزە نزیکەی( ٢ ) هەزار خێزانن لە ویلایەتی چۆڵەمێرگ لە سەرەتای هاتنی تەتەرەکاندا( ئەسعەدی کوڕی مەکلان ) فەرمانداریان بووە پاش ئەو عمادالدین کوری ولە پاشدا اسد الدین بوە.
جیهان بەگلی – لە نێوان ئافیون و قەرە حەسارو ئاق شەهردا بڵاو بوونەتەوە. زیاتر لە( ٥ ) هەزار خێزان ئەبن.
جێکانی – ئەمانە هۆزێکی گەورەن لە - گورجستان – دا بەرگی دومی ئیسکلوپیدیا ئیسلام.

– چ –

چاپکسان – تیرمیەکن لە دورویەری( سیومرك ) جێگیرن.
چاردۆلی – یاچراداوەری( ٢٠٠ ) خێزانن لە ناوچەی ئەسفەند ئابادو سنە جێگیرن ناوچەکەیان بە چراوەری ناوداره[71].
چەکوانی – ئەولیا چەلەبی لە بەرگی چوارەم ل ٧٥ دا ئەمانەی بە کورد داناوە.
چەشگزن – ئەمانە لە ناوچەی خۆراساندا نیشتەجێن. بریتین لە سێ لق( پرتك، سقمان، مجنکرد ).
چەتکەیی – نزیکەی( ٢ ) هەزار خێزانن لە سفیدرود لە تەنکەی کاوە شمارو ڕۆخانەی کە شکان و لە خورمم ئابادو چیای ملەی شوانان دا بڵاوبونەتەوە نزیکەی( ١٥٠٠ ) خێزان ئەبن لەناوچەی قەزوین دا.( ٣٠٠ ) خێزانی تریان لە ناوچەی سلیمانی و کەرکوك دا( ٣٠٠ ) خێزانیشیان بەرەو قەشقایی ڕۆیشتوون.

---

[71] لەناوچەی هەوشار لە بەینی شارەکانی شاهین دژو میاندواو دا نزیکەی( ٥٠٠ ) خێزانێکی چوار دۆلی نیشتەجێن کە بە( چارداوەروو ) ناو دەبرێن.

چی چیه - کی کیه - شیان پێ ئەڵێن لە دمورو بەری قەرجەداغ دا نیشتەجێن.
چیلی – ئۆرۆك چیلیشیان پێ ئەڵێن لە نێوان بین النهرین دا بڵاو بوونەتەوە.
چەنکەیی – ئەم هۆزە لە قەزوین و دمورویەریدا بە - چەگینی – ناودارن.

-ح-

حاجی یانلی – ئەوە ئەچێ حاجی مانی بێت لە رۆژئاوای قەیسەری و کەناری قزل ئیرماق و لە سەرووی ئاوا ئورس دا نیشتون. نزیکەی( ٣٠٠ ) خێزان ئەبن.
حەریری – لە ناوچەی حەریری پارێزگای هەولێردا نیشتەجێن.
حەسنانلو – یا( حەسنانیە ) نزیکەی سێ هەزار خێزان ئەبن لە سەر سنووری عیراق و ئێران و تورکیا لە نزیك بەتلیس و کەرکار دان ئەمانە لە هەشت تیرە پێك هاتون بەم شێوەیە( تەلیە، جاکیە، حەیدرانلو، خوراسانلو، سپیکانلو، جوبرانلو، زیلانلو، ئەدمانلو )، ئەم سێ تیرەی دوایی لە سەر سنوورن.
حەسنانلی – نزیکەی –( ٤٢٠٠ ) خێزانن لە ناوچەی خەنیس و مەلازگردو دار تودا ئەم هۆزە نزیکەی( ١١٠ ) دێ پێك ئەهێنن. بەشێکیش لەم هۆزە لە نزیك گۆمی وان دا ئەژین.
حەسنەوەند – ئەم هۆزە لە پێنج بنەماڵە پێك هاتوون( بسگام، ئەدیر، پشتکوو روباری کاکە رەزا و تەنگی رەبات و تەنگی حەسەن دا جێگرن نزیکەی( ٥ ) هەزار خێزانن.
حەسنەیە - بەم هۆزە ئەڵێن – ئەمیرەکانی دینەوەر – ئێستا بڵاون.
حسەینی – لەژووری جزیرەی ابن عومەردا دانیشتون. نزیکەی( ٥٠٠ ) خێزانن.
حاساران – یا هەساران بنەماڵەیەکی گەورەن. ئێستا بڵاون.
حەفتیان – یا هەفتیان – هۆزێکن لە ناوچەی هەفتیانی رەواندوز( شاری ) یشیان پێ ئەڵێن. لە ئەنسکلوپیدیادا لەباتی شاری( سوری ) نووسراوە.
" حەکاری – یاهەکاری ئەمانەش بریتین لە دوانزە تیرە بەم شێوەیە : جەلو، مەیسوری زێباری، هاویری، بەرواری، بارچیان، سێوالان، لانی هۆتان، ئادرامان، عەمادی. شەمدینان، شیروانان. لە عەمادیەو جزیرەی ابن عومەر و بەتلیس و قەڵای هارونی و نزیك چۆلەمێرگ و سلیمانی دان، نزیکەی( ٤،٠٠٠ )خێزانن هەمیشە دە هەزار تفەنگ چی یان هەیە.

حەمدیکان – تیرەیەکن لەنێوان مەلازگرد ووالشگردان.

حەمیدی – ئەم تیرەیە دراوسێ ی بەختیەکان بوون و ئێستا بلاون.

حەوتان – لە نزیکی بۆتان نیشتەجێن( ١٠٠٠ ) خێزان ئەبن.

حەوسەیی – لە - مسالك الابصار – دا نووسراوە لە شارەزووردا ژیاون.

حەیدەرانلی – نزیکەی دو هەزار خێزان ئەبن لە نزیکی موشو ورمێ دا لە هەندێ جێگای تردا هەن و بلاون.

حەیدەری – دەورەی( ١٥٠٠ ) خێزان ئەبن لە دەوروبەری سابلاغ و موکریان دان وا دەرئەکەوێ لە حەیدەر لیەکان بن.

-خ-

خاتوون ئۆغلی – ٤٠٠خێزانن لە خوارووی یوزغاد. بەشێکن لە هۆزی میللی.

خالتی – یا خالیدی یا خود ئۆراتۆ – ئۆراشتر، لە دەوروبەری ئارارات و کوردستانی موکری دا جێ گیرن، لە نزیك گۆمی( وان ) دا دەولەتێکی بەهێزیان بووە تا سەرەتای سەدەی شەشەمی پ ز فەرمانڕەواییان کردوە. لە پاش کەوتنی دەولەتەکەیان ئەمانیش بلاو بوونەتەوە.

خاتۆ وەندی – ١٠٠ خێزان ئەبن لە نزیکی( قهەرار ) و( گاگڕان ) و دەوروبەری فراهان دا جێ گیرن.

خەلەکانی – نزیکەی( ٤٠٠ ) خێزان ئەبن لە ڕۆژئاوای گۆمی قۆچ حەسار – دا

خالی – مەسعوودی ل ە- مروج الذهب – دا ئەڵێ لەوە ئەچێ خانی یا خەلالی بێت.

خانی – نزیکی( ١٨٠ ) خێزانن لە نزیکی خۆشاب دا جێ گیرن.

خانیان – تیرەیەکن لە ناوچەی بایەزید.

خەرات - خراط لە دەوروبەری سنە دا بە بلاوی ئەژین

خەسراوی- ئەستەخەری لە پاش عەشیرەتی ڕامەکان ل ٩٧ خەسراوی نووسیوە و مقلسی ئەم ڕایە پەسەند ئەکات.

خدرانلو – یا خەزرانلو یا خەزرانی لە دەوروبەری( کالینی ) و( ئازەربایجان ) دا بلاوبوونەتەوە.

خەفتیان – لەوە ئەچێ هەر ئەو هۆزە( شاری ) یە بێت کە لە ناوچەی ڕموادوز دان.

خۆشناو – نزیکەی دوو هەزار خێزانن لە ناوچەی( چەقەڵ ئاوا ) یانی شەقلاوای ئێستادا. ژمارەیان( ١٠،٠٠٠ ) کەس ئەبێت و( ١٠٠ ) دێ یان ئاوەدان کردۆتەوە لە ناوچەی کۆیە و ڕانیە ش دا هەن بە پێی ئینسکلوپیدیای ئیسلام لقێك لەم هۆزە لە ویلایەتی( کارتاویە ) بوون لە( دەربەندوقەرەبۆلی ) ئەم دەربەندە ناوی( هۆخمان ) بووە لە شاخێکی نزیك زێ ی بچووك.

خێزان – بنەماڵەیە کی گەورەن لە نزیك دیجلەو فورات دا. بریتین لە سێ تیرە( خێزان، مەکس، ئەسپایەردی.

خێلانلی – لە ناوچە شاخاویەکانی، نزیك باڵەکی ناوچەی هەولێردا جێ گیرن. نزیکەی( ٢٠٠ ) خێزان ئەبن ژمارەیان زیاتر لە( ١٠٠٠ ) کەس ئەبن.

– د –

دارخوری – لە نزیك شەرناق و تۆرعابدین ە وە دانیشتوون.

داسنی – ئەم داسنی یانە هەموویان شەیتان پەرستن لە ڕۆژئاوای دیجلەدا یا لە نێوان دیجلە و فوراتدا دانیشتوون. ئەمانە ڕایان وایە کە خوا هەموو ئیشەکانی داوەتە دەست شەیتان و خۆی بێ لایەن دانیشتوە جا لەبەرئەوە پەرستنی بێ لایەن سوودی نی یە. ئەبێ کار بەدەست بپەرسترێت.

دالوەند – لقێکن لە تیرەی لەك و هۆزی لوڕی گەورە لە ناوچەی پێشکۆ جێ گیرن

داودە – یا داودی نزیکەی هەزار خێزان ئەبن لە دەوروبەری( کەرکوك، خانەقین، کفری، تاوق، گل دان. بەشێکن لە هۆزی زەنگەنە.

دایابیلان – یا( دیابیلان ) لە وڵاتی سوریادا جێ گیرن، مەسعوودی لە مروج الذهب – دا هەمان ڕای هەیە.

دوڕاجی –نزیکەی( ٤٠٠ ) خیزان ئەبن لە ناوجەی ژاومرۆی سنەدا ئەژین لە کاتی گوزاری لەیلاخ و گەروس و کولیا بیشدا هەن.

دەشتی – لەناوچەی پشتکۆدا نیشتەجێن.

دلفان – لە ناوجەی خاوو ئالشتر دا جێ گیرن و بەشێکن لە( لەك ).

دەلۆیی –( ٦٠٠ ) خێزان ئەبن لە ناوچەی کەرکوك و خانەقین و کفری دا بریتین لە شەش تیرە( کاشی، جامەرێژی، پەنجانەکشتی، کارێزی تارکەوەند، سەلیم وەیسی ).

دلیکانی – ئەم هۆزە کۆچەرین لە دەشتی مرعش و تۆرۆس و کلیسدار) دا جیّ گیرن نزیکەی( ٢٠٠ ) خێزان ئەبن.

دەنبەلی – ئەمانە( عیسابەگی ) شیان پیّ ئەڵێن لە نێوان دیجلە و فورات دان.

دەنیکی – لە – مسالك الابصار – دا ئەڵێت( ١٠٠٠ ) خێزانێك بوون ئێستا بلاّون.

دۆدایی – لە خوارووی رۆژئاوای کۆیە و سەرووی کفری دا جیّ گیرن.

دوودەری – لە خوارووی گۆمی وان دان نزیکەی( ٤٠٠ ) خێزانیکن.

دوو رووییی – یا دوو روودی نزیکەی( ١٠٠ ) خێزانن لە ناوچەی( جوانرۆو رەوانسەر ) دان.

دۆسکی – ١٢٠٠ خێزان ئەبن لە پارێزگای دهۆکدان.

دۆغانی – هۆزێکی کۆچەرن لە رۆژئاوای( مرعش ) دا( ٢٥٠ ) خێزانن.

دۆم – یا( کەلاش کەری ) نزیکەی( ٢٠٠ ) خێزان ئەبن لە دەوروبەر شاری سنە هەندێکیشیان گەرۆکن.

دەلۆیی – یادەلۆ. هەر ئەو تیرەیە کە باسمان کرد لە پێشەوە.

دهۆکی – نزیکەی( ٣٠٠٠ ) خێزان ئەبن لە ناوچەی سابلاغ و موکریان دان.

دیاربەکری – کە( مەروانی ) شیان پیّ ئەڵێن. لە ناوچەی دیاربەکردا بلاّوبونەتەوە( ٦٠٠٠ ) خێزان ئەبن.

دەرسیمی – دێرسیملی – نزیکەی( ٤٠٠٠ ) خێزان ئەبن لە ناوچەی( دەرسیم و دیاربەکر و جزیرە و قەرەج داغ ) دان. زۆربەی ئەم تیرەیە( عەلی ئیلاهی ) ن ئەڵێن خوا پەیامبەری بە عەلی داوە و محەمەد داگیری کردوە. خەلیفەکانیش خەلافەتیان نەدایە تا خۆیان مابوون لە پاشی هەموویان خەلافەتی وەرگرت.( عائشە و معاویە و خوارج ) ەکان نەیان هێشت بە ئاسوودەیی خەلافەت بکات تا لە دنیا دەرچوو.

خوا بۆ دڵدانەوەی عەلی پلەی( خواوەند ) ی دایە خۆی بە ئاسوودەیی لە گۆشەیەکی عەرش دا دانیشتوە.( بەمانە ئەڵێن شیعەی موفریگ ) هەندێکیش لەم هۆزە یەزیدین و ناوی یەزید زۆر بەرێزەوە ئەبەن. ئەڵێن کاتیّ خەلافەت کەوتە دەست عەلی جگە لە شەر لەگەڵ موسڵمانەکان و خوێن رشتن هیچی تری نەکرد. ئیسلام لە سەردەمی عەلی دا هەر

وەك خۆی مایەوەو پەرەی نەسەند. حسین – یش ویستی وەك باوكی بكات تا یەزید توانی حسین بكوژێ و كۆتایی بە شەڕی نێوان موسوڵمانەكان بێنێ. دوبارە سەر لە نوێ ئیسلام گەشەی كردەوە. بەمانە ئەڵێن( سوننی موفریگ ). هەردوو تیرەكە. بریتین لە دوانزە لق( میلان، شواك، كەچەڵ، گیوران، فەرهاد، ئاچاغی، بەختیارلی، كرایانلی، میرزانلی، عەباسانلی، بالاشاخی، كوزلیچان، لاچین، ئۆچاغی ).

دێركەوەند – ئەمانەش لە دوو بەش( بەهاروەند، قەڵای وەند ) و لە( ٢ ) هەزار خێزان پێك هاتوون، نیشتمانیان بریتییە لە( دزفول و گیلان و شاخی تاف و شاخی هەشت پەهلو ).

دزەیی یا دزجی – نزیكەی( ٦ ) هەزار خێزان ئەبن لەناوچەی هەولێر و قەزای مەخموور و دەورو بەری( قەرەچۆق و كەندین ئاوا ) لە سێ لق پێك هاتوە( پیران، مامان، گونتولان ).

دەیلەمی – یا دەیلەمان – نزیكەی سێ هەزار خێزانن لە ناوچەی مازەندەران تا دەورو بەری كەركانرود – گیرستاندا هەن.

مەلبەندیان شاری – دیلمان – ە وەك باسمان كرد( گێلی، دەیلەمی، خەزەری، بەشێكن لە ماد یانی كوردە رۆژهەلاتییەكان كە زمانی دیلەمی كۆن زۆر لە هەورامی و زازاوە نزیكە. یونانیەكان بە گێلانیان وتووە( كاردۆشیان ).

دیناری – ئەمانە بریتین لە دووبەش( میرشەهابی، میرئیبراهیمی ) لە ناوچەی دیناراندان نزیكەی( ٥٠ ) خێزان ئەبن و لە هۆزی( زێبارین ).

دینارەوند – لەوە ئەچێ لە ناوچەی دینارەوە كۆچیان كردبێتە ناوچەی پشتكۆ و جێ گیر بووبن.

– ر –

راستی – نزیكەی سێ هەزار خێزانن لە ناوچەی( عەقرە ) دا دا نیشتوون سەرۆكی ئەم هۆزە( میرعلاو الدین بووە ). هەزار خێزانێك لەمانە لە ناوچەی – موسڵ – دان.

رامانی – بەپێ ی نووسینەكانی( ابن حوقل، ئەستەخەری، مقدسی ) ئەمانە لە كوردەكانی ولاتی فارسن.

رەحمان بەگی – بەشێكن لە هۆزی ئێناخی لە ناوچەی رەوانسەر و ماهی دەشت دا جێ گیرن.

ڕەشکۆتانلی –( ڕەشدینان ) یشیان پێ ئەڵێن( ٥٠٠ ) خێزانیکی کۆچەرین لە ڕۆژهەلاتی دیاربەکر.

ڕەشوان –( ٧٠ ) خێزانیکی کۆچەرین لە خوارووی( ئەرزرۆم ) دان.

ڕەشوەند – ٥٠٠ خێزانێکن لە دەورو بەری( قەزوین ) دا ئەژین.

ڕەشەوەندی – چەند خێزانێکن لە ناوچەی – ئازەربایجان – دا لەوە ئەچێ ئەم هۆزەش لەگەڵ ڕەشوەند یەك بن و کۆچیان کردبێتە ئەم ناوچەیە.

ڕوزبەکی – تەنهانەولیا چەڵەبی لە بەرگی چوارەم ل( ٧٥ ) دا باسی ئەم هۆزەی کردوە.

–ز–

زراری – ١٠٠ خێزانن لە ناوچەی هەولێردا( ١٢ ) دێ یان ئاوەدان کردۆتەوە.

زازایی – نزیکەی( ١٠٠٠ ) خێزانن لە ڕۆژهەلاتی( خەرپوت و قەزای سیوەك ) دا هەموویان دێ نشینن.

زافرانلی یا – زافرانلۆ – یاخود زەعفەرانی – بنەماڵەیەکن لە هۆزی حسانلو کە شا عەباسی سەفەوی کۆچی پێ کردوون بۆ خوراسان و مەشهەد و بجنورد.

زایاوی – کە بە هەلە( زیادی ) پێ ئەڵێن بەشێکن لە کوردەکانی وڵاتی فارس.

زایەخی – ابن حوقل، مقدسی، ئەستەخەری – ناویان بردوە بەلام هیچ ئاسارێك لەم هۆزە نی یە.

زەردوویی – نزیکەی( ٥٠٠ ) خێزانن لە ناوچەی جوانرۆ و دەوروبەری سیروان دا و هەندێکیشیان لە شاری کرماشان نیشتەجێن.

زەرزا – یا( زەرزان ) لە دەورو بەری( ورمێ ) دانیشتون نزیکەی( ٤٠٠ ) خێزان ئەبن.

زرزار- نزیکەی( ٥٠٠٠ ) خیزان ئەبن لە ناوچەی( ملازگرد، ستاق، مەرت و چیای جەنجرین دا کە بەسەر شنۆ دا ئەڕوانێ، ئەمیرەکەیان ناوی( نجم الداین باشاك ) بوە باڵەکیان بەشێکن لەم هۆزە.

زەرقی – لە تیرە کوردەکانی عیراقن لە نێوان دیجلە و فوراتدا ئەمانەش چوار( بنەماڵەن – دەرزینی، تەرجیلی، عەتاقی کردکانی ).

زەکەرمی – لە هۆزەکانی نێوان دیجلە و فورات – ن.

زەند – ئەمانە بریتین لە( ٥ ) تیرە( تایەرخان، محەمەد – سالح ئاغا، غەنی، عەلیان، کەریم خانی زەند فەرمانڕەوای ئێران لە تیرەی( عەلیان )ە، نزیکەی( ٦٠٠ ) خێزان ئەبن و بەشێکن لە و هۆزی لوری گەورە لە ناوچەی کەرکوك وخانەقین و نێوان ڕێگای کفری و سیروان دا هەن.

زەنگەنە – لە پارێزگای کەرکوك یا خانەقین و دەورو بەری کفری و ئیبراهیم خانجی و سۆماك – داجیَ گیرن. نزیکەی( ٤٥٠ ) خێزانن. هەندێکی تر لەم هۆزە لە دەوروبەری کرماشان و هەلیلان – دا هەن. ئەمانەش دوو بنەماڵەن( فارس ئاغا ) و( ڕۆستەم ئاغا ). شەرەفنامە ئەڵێت " لە وڵاتی ئەفغانستان – یشدا هەن لەوە ئەچیَ لە بلوجستانەوە چووبن.

زیباری – نزیکەی( ١٢٠٠ ) خێزان ئەبن لە - موسڵ و ئاکریَ و زیَ ی گەورە ن.

زیرکانلی – نزیکەی شەش هەزار خێزان ئەبن لە ژووروی( خەنس )، شاری( ئەنقەرە ) ش( ٥٠٠ )خێزانێکی ئەم هۆزەی لیَ یە.

زیلانی – هۆزێکن لە ئالشگرد – ایە.

زەمینەڵومند – لە هۆزەکانی پشتکۆی لوڕستانن لەم ناوچەیەدا جیَ گیرن.

-س –

سابولی – لەوە ئەچیَ سولی بێت – ئینسکلوپیدیی ئیسلام –

ساتیاری – نزیکەی( ٦٠٠ ) خێزانن لە ناوچەی( ڕەوانسەر و جوانڕۆو سیروان ) دا.

ساراتی – یا سارات لە ناوچەی ئازربایجان دانیشتون.

سارمی – لە خاکی عیراقدا بڵاوبوونەتەوە( ٢٠٠ ) خێزان ئەبن.

ساسۆنی – یا ساسۆنیان – لە خاکی عیراقدا بڵاو بوونەتەوە.

ساکۆر – سیَ سەد خێزانێکی گەرۆکن لە عیراقدا.

سالانی – مقدسی نووسیویە بەڵام( ابن حوقل و مقدسی ) باکیلی یان نووسیوە لە وڵاتی فارس دا جیَ گیرن.

سالمۆنی – ابن حوقل مقدسی و ئەستەخەری ئەڵێن لە وڵاتی فارسدا جیَ گیرن.

سەیایی – یا سەباهی کە زۆربەی خەڵك سەباخی یان پێ ئەڵێن بەشێکن لە کوردەکانی وڵاتی فارس.

سپەرتی –( ۷۰ ) خێزانی کۆچەرین لە سەرووی( زاخۆ ) وەن.

سپی کانلی – نزیکەی( ۳۰۰۰ ) خێزانن لە ژووروی گۆمی وان دا.

سەفاری – لە هۆزەکوردەکانی وڵاتی فارسن.

سەگوزر – لە ناوچەی سنەدا بڵاو بوونەتەوە.

سەگوەند – بریتین لە چوار تیرە. سەگوەندی حاجی عەلی خانی و سەگوەندی رەحیم خانی و( پاپی ) و( جودەکی ) نزیکەی( ٤٠٠٠ ) خێزانن لە ناوچەی( بالاگریوە ) و( هەرو ) پشتکۆ نیشتەجێن وبە شێکن لە لور.

سەلدۆز – نزیکەی( ۲۰۰۰ ) خێزانن لە ناوچەی ئازەربایجان و زازا و مامش و موکری دا نیشتوون سلسلە – لە هۆزی( لەك ) ن دانیشتوی( خاوناشتر )ن و هەندێکیان لە رۆژهەلاتی سنە و نزیکی کولیایی دان دێ یەك بە ناوی( سلسلە ) هەیە لەم ناوەدا.

سلێمانی – ئەم تیرەیە دوو بنەماڵەن( ئەمیرەکانی قلبو بگمان )و( ئەمیرەکانی میافارقین ).

سەلیوان – لەوە ئەچێ بەشێك بن لە زازا و لە رۆژئاوای( موست و سەراب ) دا نیشتەجێن.

سە نجاوی – یاسە نجابی نزیکەی( ۲۵۰۰ ) خێزانن لە ماهی دەشت و کرماشان و جوانرۆن.

سنەدان – ئەمانەش بریتین لە دوانزە بنەماڵە( چالاوی، دالیان، گوزای، بەرازی، سیمەوەند، سوورەوەند، تکاوەند، تفەنگچی، حەناظر خانی ) سێ تیرەکەی تریان لور و جاف و گۆران – ە کە( ئاماسوەند، دارخو، بێ ومشتیان ) پێ ئەڵێن.

سنجاری – ئەمانەش لە هەشت بنەماڵە پێك هاتوون( میرکان، سامۆکان، حەبابە، بیکران، بلد، مەندیکان، بیت الخۆلتا ) هەموویان یەزیدین و لە ناوچەی سنجار دائەنیشن.

سەندی گولی – نزیکەی( ۲۰۰۰ ) خێزانن لە موسڵ و نێوان هێزۆك و خاپور ) دا جێ گیرن.

سۆرانی – ئەولیا چەلەبی لە لاپەرە( ۷۵ ) بەرگی چوارەم ئەڵێت( ئاستێن بلند کوردی ) کەقۆچکە سورانی یانی پێ ئەڵێن لەم هۆزەیە.

سورکی – یاسورچی نزیکەی سێ هەزار خێزان ئەبن لە پارێزگای هەولێر وژوروی کەناری زێ ی بچووك تا ڕەواندوزبلاْوبوونەتەوە نزیکەی( ٥٠ ) دێ ئەبن.
سوور سووری – نزیکەی( ٢٠٠ ) خێزان ئەبن لە خواروی شاری سنە و لە ناوچەی ژاومرۆ تا پێلوار – دا نیشتەجێن شارۆچکەیەکیان هەیە بە ناوی سوور سوورەوە.
سوور کێشلی –( ٩٠٠ ) خێزانن لە رۆژهەلاْتی دیاربەکر دا تیرەی سودلی بەشێکن لەمان.
سوورەمیری – بریتین لە( ٥ ) تیرە( توتەك، ئانتر، ئاوینە، مامەجان. کەلْوری ) نزیکەی( ٢٠٢٥ ) خێزان ئەبن لە ناوچەی خانەقین، تیرەی ئەنتاری شارەبانە ئەبو جسرە - دان.
سووری – لە ئینکلوبیدیای ئیسلامدا لە بریتی سووری( شاری ) نووسراوە.
سۆسەنی – یا سۆیسنی نزیکەی هەزار خێزان ئەبن لە ناوچەی سابلاْغ واتا مەهابادی ئێستەدان.
سولی یا سولیە- ئەمانە هۆزێکی ئازاو دلێر و شەڕانین لە ناوچەکانی شارەزوورو شنۆ و ئازەربایجاندا – هەن نزیکەی( ٢٠٠٠ ) تفەنگ چیان هەیە، لە ئەنسکلوبیدیا – سابلولی – نووسرواە.
سویدی – بنەمالْەیەکن لە عیراقدا ئەژین لەوە ئەچێ لە - بەربەر – ە کان بن.
سهرانیان – ئەمانە تیرەیەکن لە خاکی عیراقدا لە نێوان دیجلە و فورات لە ئەوەی کەولۆس ن ئەمانە - سارانیان – پێ ئەلێن. سۆرانی
سیری – لە کوردەکانی ولاْتی فارس ن.
سەندی – لە مسالك الابصار دا نووسراوە ئەم هۆزە( ٣٠٠٠ ) تفەنگ چیان هەبووە لە ئە نجامدا لەناو هۆزە کوردەکاندا بلاْو بوونەتەوە.
سەیفەکانی –( ٥٠٠ ) خێزانێکن لە ژووروی خەلەکان.
سینان بەشێکن لە هۆزی – زازا – لە بۆژئاوای( خەرپوت ) دانەنیشن.
سیناچنلی – نزیکەی( ٣٥٠٠ ) خێزانێکن لە نزیك – مەلاگیە - ن هەموویان شیعەن.
سیلوکان – نزیکەی( ٩٠٠ ) خێزانن، کۆچەرین لە هاویندا لە دەشتی( موش ) هات و چۆ ئەکەن.

شادانجان - مەسعودی لەمروج الذهب - دا نووسیویەتی کە شۆینی ئەم تیرمیە ناوچە شاخاویەکانی جبال الاکراد - ە.

شادلو -( ١٨ ) هەزار خێزانن لە دە وروبەری( بیجنورد ) نیشتەجێن( ١٦ ) هەزاریان نیشتەجێن و دوو هەزاریان کۆچەرین و لە رەشماڵدا ژیان بەسەر ئەبن.

شادرلی - نزیکەی سێ هەزار خێزانن لە( ئازەربایجان ) هەموویان شیعەن و لە هۆزی - کورەشەلی - ن.

شاری - نزیکەی هەزار خێزانن ئازاو دلێرو شەڕ کەرن لە چیاکان و دەربەندی زابی گەورەدا جێگیرن لە ویلایەتی شوعلاباد. خەفتیان - یش هەن.

شاهجان - یا شاهی جانی - تیرمیەك بوون لە دینەوەر و هەمەدان - نزیکەی( ٥ ) هەزار تفەنگچیان هەبووە. ئێستا لە نێوان هۆزە کوردەکاندا بڵاو بوونەتەوە.

شاقوبادی - چەند خێزانێکن لە ناوچەی جوانڕۆ سنەدان.

شاهگانی - هۆزێکن لە ناوچەی فارس دا بڵاو بوونەتەوە.

شامەسووری - یا( شامنصور ) ی ١٠٠ خێزانێکن هاوینان لە ناوچەی گردە میدانی لە یلاخ و زستانان لە ناوچەی زەهاودان بەشێکیان کۆچەرین و بەشەکەی تریان دێ نشینن.

شاهۆنی - لە ناوچەکانی ولاتی فارس دا بڵاو بوونەتەوە.

شاهباری - ئەمانەش لە ناوچەی فارس دان.

شبان یا شوان - لە ناوچەی پشتکۆ دان لەوە ئەچی لە هۆزی شوان ی ناوچەی کەرکوك و خانەقین بن.

شەرەف بەیانی - نزیکەی( ٧٠٠ ) خیزانن لە نێوان کەرکوك و خانەقین و لە نێوان سواڵدر و سیروان لە ناوچەی قۆرەتو وە هۆزێن شێخانیشدا هەن. لە هاویندا دەچنە چیای بەمۆ.

شوکاك - بنەڕەتی وشەکە( شاه کاك ) یا( شەکاك ) ە. نزیکەی شەش هەزار خێزانن لە سەرووی سلێمانی و رۆژئاوای گۆمی ورمێ ) ماوەی سێ مانگ لە رەشماڵدا ئەمێننەوە نزیکی( ١٥٠٠ ) خێزانیان لە دەوروبەری سەلماس دان ئەمانەش بریتین لە( ٥ ) بنەماڵە( شوکاك، شەکەفتی، موکری، شادەلی، بۆتان ).

شەکرلی - ئەم تیرمیە لە ناوچەی( موش )دا جێ گیرن.

شەمسیکی – نزیکەی( ٩٠٠ ) خێزانن لە نزیک( دیزە، دزە ) دا ئەژین.
شوان – لە نێوان چەمی خاسەو زێ ی بچوک – دا و لە ناوچەی کەرکوک و خانەقین دانیشتون نزیکەی دوو هەزار خێزان ئەبن ئەم هۆزە بریتین لە دوو تیرە( شوان خاسە ) و( شوان بازیان ). دراوسێ ی شێخ بزەینی و بیبانیەکانن.
شوانکارە - پاشەبانکارە لقێکن لە هۆزی( رامان ) ی فارس ئەمانە(٥) بنەماڵەن( مەسعوودی، شاکانی، رامانی، کازۆیی. ئیسماعیل ) ئەستەخەری ئەڵێ لە کوردەکانی ولاّتی فارس ن.
شۆهان – لە لەکەکانن و لە ناوچەی پشتکۆ نیشتەجێن.
شەهراکی – شاراکی. هۆزێکی گەورە بوون لە ناوچەی فارس دانیشتا بلاّون.
شهراوی – شاراوی ئەمانەش لە کوردەکانی ولاّتی فارسن.
شیخ ئیسماعیل – یا شێخ سمایلی – نزیکەی( ١٤٠٠ ) خێزان ئەبن لە ناوچەی ئەسعەد ئابادی سنەدا ئەم هۆزە لە سەردەمی شاە فتح علی قاجار – دا بۆ ئەم ناوچەیە هاتوون
شێخ بزینی – نزیکەی شەش سەد خێزانن لە ناوچەی کەرکوک و خانەقین – لە خواروی زێ ی بچووکیشدا هەن. هەندێکی تریان لە ناوچەی ئەرزرۆم و نزیکەی بۆی ئابادا هەن.
شیخ ددانلی – نزیکەی دوو سەد سەر خێزانن لە ناوچەی رۆژهەلاّتی دیاربەکرن.
شێربەگی – بەشێکن لە هۆزی( زیریەکانلی ) و( ٢٠٠ ) خێزان ئەبن.
شیروان – لە ناوچەی رمواندوز جێ گیرن و نزیکەی( ١٥٠٠ ) خێزان ئەبن.
شیروانی – ئەمانەش لە کوردەکانی نێوان( دیجلە و فورات ) ن لەوە ئەچێ بەشێك بن لە هۆزی شیروان ئەمانەش دووو بنەماڵەن( کەرنی ) و( ئیروان ) ی.
شیسوەلی – لە رۆژ ئاوای کفری دا جێ گیرن و بەشێکن لە شوکاك.

-ص –

صالحی – نزیکەی( ٢٠٠ ) خێزان ئەبن لە کەرکوک و خانەقین و قەرەحەسەن هەندێکیشیان لە سامەڕان.
صباحی – پاسەباهی – بریتین لە هۆزی سەبایی کەباسمان کرد.
صۆفی وەندی – نزیکەی( ٢٠٠ ) خێزانن. لە( ماهی دەشت و جوانڕۆو کولیایی ).

-گ-

گابور ئۆغلی - یا تابور ئۆغلی - نزیکەی سێ سەد خێزان ئەبن لە ژوروی( قەرەشار).

گالەبانی - یا تاڵەبانی - وەك باسمان كرد.

گورعابدین - یا تۆعابدین نزیکەی( ٧٠٠٠ ) ئەبن لە ناوچەی تورعابدین ئەمانەش بریتین لە چوارده تیره " مومان، دوكان، دومانه، عەلیان، هارونه، سەلأمان فیریەزاج، فیریەداخ، گەرگەری، هاوارکا، محلەمی، داسیکان.

-ع-

عبدالرحمنی - یا ئەورەحمانی - چەند خێزانێکن لە ناوچەی ڕەوانسەری سنە.

عوسمالوەند - نزیکەی( ٥٠ ) خێزانن لە( فەیروز ئاباد هەلیلان ) دان.

عەشایری سەبعە - نزیکەی( ٩٠٠ ( خیزانن لە ناوچەی موسڵ لە بنەڕەتا حەوت بنەماڵەی گەوره بوون ورده ورده کەم بوونەتەوه تێکەڵ یەکتری بوون. لەئەنجامدا بە عەشایری سەبعە - ناوبراون.

عەمارلو - نزیکەی دوو هەزار خێزان ئەبن لە خواروی گێلان یانی لە نێوان ڕوباری ڕەحمەت ئاوا و( دیکان ). ئەم ناوچەیە بە( عەمارلو ) ناوداره. ناوی کۆنی ئەم شاره - خەرگام - بووه. پاش ئەوەی نادر شا هۆزی عەمار لوی هێنانە ئەم ناوچەیە بە عەمارلو ناوی دەرکرد ئەمانەش چەند تیرەیەکن - قەبەقرانلو، شمکانلو، بادزلو. شاه کلانلو[٧٢].

عەمرانلی - نزیکەی( ٨٠٠ ) خێزانن لە نزیك قەره شار.

عومەرلو - هەر هەمان هۆزی( عەمارلو ) لە ناوچەی خۆراسان دان.

عومەر مل - نزیکەی( ١٥٠ ) خێزانێکن لە ناوچەی کەرکوك و خانەقین هەندێکی تریان لە نێوان کوچەچیان و ئالشکێنان و سەرکەل - دان برێکی تر لەم تیرەیە لە ناو دەربەندی کرماشان دان.

عەلۆش - نزیکەی دووسەد خێزانن لە رۆژهەلاتی - حەران - کە بە زمانی عەرەبی گفتوگۆ ئەکەن.

---

[٧٢] کوردلر ل ٢٢ دانراوی دکتور فریج

عونیکی – ژمارەی خێزان و شوێنی دیاری کراویان نەزانراوە تەنها ئەولیا چەلەبی لە لاپەرە( ٧٥ ) بەرگی چواردا باسی کردوە.
عیسایی – یا عیسەوی – بەشێکن لە هۆزی( حسنانلو ) نەمانە نەوەی( عیسا کوڕی شهاب الدین – ن. لە نزیك گۆمی وان نیشتە جێن.

-غ-

غەدیری – لە شاری بەغداوە بەرە و ناوچەی( ئەسفەند ئاباد و لە یلاخ هۆباتۆ) هاتوون.

-ف-

فوراتی – بەشێکن لە کوردەکانی ناوچەی فارس کە لە دەورو بەری فورتەو بەرەو ئەو ناوچەیە هاتوون.

فەلەکەدینی – نزیکەی( ٢٠٠ ) خێزان ئەبن لە ناوچەی( خاوە ) لە نێوان( ئەهاوەند ) و( ئالشکر ) دا لە نزیکی( سیرە ) ش هەن.
فەیزوڵلابەگی[٢٣] – نزیکەی( ١٥٠٠ ) خێزانن لە دەوروبەری سابلاغ و هەندێکیشیان لە ناوچەی( سەقز - ) دان.
فیلەکەری – نزیکەی زیاتر لە( ١٠٠ ) خێزانن لە ناوچەی( سونقر و کولیاپی ) دان.

-ق-

قادر میر ومیسی – بەشێکن لە جافەکان لە ناوچەی – سنە - یشداهەن.
قادری – لە دەوروبەری سلێمانی دا ئەمانە جیاوازی هۆزی قادری دەروی( سنە ) ن. ئەم هۆزە لە بنەماڵەی قادر خانی دەرگەزێنین[٢٤].

---

[٢٣] تایفەی فەیزوڵلا بەگی لە بەشی مەهابادداا( بەگزادە ) یان پێ ئەڵێن و لە ناوچەی سەقز فەیزوڵلابەگی یان پێ ئەوترێ. بە زیرەکی و وریایی بە ناویانگن. ( وەرگێر )

قازانلو – له بنەماڵەیەکی باجەلانیەکانن.
قالقالی – زستانان له شێخ حەیدەر و گڵە سوور و دەباغ و دیوان دەرە ) دان. هاوینان ئەچنە چیاکانی ڕۆژئاوای گەنباخی.
قوبادی – بەشێکن له جافەکانی جوانڕۆ. ئەم هۆزە گەرمیان و کوێستان ئەکەن. زستان ئەچنە( ۆشگکۆ، و شێخان، و زەهاو ) هاوینان ئەچنە( بازان و یتگیز ) ئەمیر تەیمور ئەمانەی له خاکی عوسمانی عیراق دەرکرد و ناردنیە ئێران. بنەماڵەی( مەنووچەری و مستەفابەگی ) لەم هۆزەن.
قەرەنالووس – نزیکەی – دوو هەزار خێزان ئەبن له ناوچەی خانەقین و مەندەلی و ئاب ئەفت و تەنگ سۆمار). ئەمانە شەش تیرەن( گەش. کاتیون، ئەفتچی، کاکەوەند، چارماوەندی، گاووری ). ئەم هۆزە له گەڵ تیرەی( عەلوش ) دا یەك بنەچەیە.
قەرچۆللو – ئەم هۆزەش بەشێکن له کۆچەرەکانی ناوچەی خۆراسان.
قەرەحەسەن – سێ سەد خێزانێکن له ڕۆژئاوای( بیهسین دا )
قەرەبیادەیی – ئەم هۆزە له ویلایەتی( بەسقاد و دەربەندقەرائر ) بوون. بەشێك له ناوچەی( ئۆزبەگی ئازەربایجان ) له ژێر دەسەلاتیاندا بووە فەرمانداری ناوچەی قەرائر( سیف الدین کوڕی حسانلی ) بووە. پەیوەندیەکی بەتینیان هەبووە له گەڵ سوڵتانی میسردا. بەشی بەسقاوی نزیکەی( ٤٠٠٠ ) تفەنگچی یان هەبووە.
قەشەیی – چەند خێزانێکن له ناوچەی سیروان و چوانڕۆ دا ئەژین.
قەلابوند – نزیکەی هەزار خێزانن له چیای( تافە هەشت پالۆ)دان
قەلای – نزیکەی( ١٠٠ ) خێزان ئەبن له ناوچەی( کاکە ڕەزای پێشکۆ ) دا جێ گیرن.
قەلەخانی – له( ماهی دەشتی کرماشان ) دا جێ گیرن. هەندیکیشیان له - شاری سنە - دان.
قەیتولی – یا – قتولی – بەشێکن له هۆزی پشتکۆ -.

---

[٧٤] میرزا عەلی ئەکبەری خادق الملك خاوەنی کتێبی( مێژوی کوردستان ) و( حدیقەی ناصری ) لەم هۆزەیە.

كاجەتی – لە کوردەکانی ناوچەی فارسن.

کارتاوی – لە ناوچەی شارەزوور و شنۆی ئازەربایجان – دا جیٚ گیر بوون. بەلاٚم میستر( هۆخمان ) ئەڵێت لە زێی بچووکدا جیٚ گیر بوون.

کاك – ئەم هۆزە لە نەوەی( ئەمیر مبارز الدین کاك ) ن نزیکەی( ٥٠٠ ) خێزان ئەبن. بە ناوچەی( مازنجان و بیرە و سمە ) موبارزەدینی لە لایەن خەلیفەی عەباسیەوە پیٚ دراوە. ناوی خۆی( کاك ) بووە. هەر بەم بۆنەوە موبارزەدینی شیان پیٚ ئەڵێن.

کاکۆ – لە نێوان کولیایی و سنەدا جیٚ گیرن چەند دیٚ یەك هەیە بەناوی کاکۆیی یەوە لەوە ئەچیٚ پاشماوەی( کاسی ) یەکان بن.

کاکەیی[75] – یا( کالکوانلو ) یا( کانمانلو ) نزیکەی( ١٥٠٠ ) خێزان ئەبن لە دەوروبەری شاری کەرکوك. بەشێکی تریان لە ناوچەی حەویجە و زێ ی بچوك و قۆرەتو خانەقین دا جیٚ گیر بوون. ئەمانەش لە نەوەی( کاسۆ ) ن.

کاکەوەند – یا کاکۆ وەندی نزیکەی( ٢،٠٠٠ ) خێزانن لە رۆژئاوای( هەرسین، و چەمچەمال ). ئەمانەش لە هۆزی گەورەی( کاسۆ ) ن.

کامێرانی – بەشێکن لە هۆزی برا خۆی.

کەداك – نزیکەی( ٦٠٠ ) خێزانن لە ناوچەی ئازەربایجان( فەتح عەلی شای قاجار ) لە شیرازەوە کۆچی پیٚ کردون بۆ ئەم ناوچەیە.

کوردگەلی – ئەم هۆزە لە رۆژئاوای ئێرانەوە بەرەو – بلوجستان و هیندوستان ) کۆچیان کردوە برا خۆییەکان لەم هۆزەن.

کرمانج – یا کرماج هۆزێکی گەورەن لە ناوچەی کەرکوك و سلێمانی و شارەزور و کۆیە و هەولێر و سابلاغ و بانە و مەریوان ) زمانی تایبەتی ئەمانە کرمانجی یە.

کرمانی – کوایە ئەم هۆزە لە ناوچەی کرمان -- ە وە کۆچیان پیٚ کراوەبۆ ولاٚتی فارس[76]. " ئەستەخەری لە لاپەڕە( ٩٨ ) و ابن حوقل لە کتێبی – ایران ا الصداقە " دا لە ل ١٨٥ – ١٨٧ ناویان بردوون.

---

[75] بەشێکی دیکەی ئەم هۆزە لە هەورامانیش هەن و گوندی – هاوار – مەڵبەندی کاکەیی یەکانە. " وەرگێر "

کەرەم عەلی – نزیکەی سێ سەد خێزانن لە دەورو و بەری( خاوەری پشتکۆ ) دا جێ گیرن

کەرەندی – نزیکەی شەش هەزار خێزانن لە ناوچەی کرماشان و ناوچەی( کەرەند )دا جێ گیرن ئەمانەش چواردە تیرەن( کەرەندی، بێوەنجی، رەشید عەلی، جەلال وەندی، پاتاقی، باباجانی، ئاینە( ئاوێنە )، جۆزگەیی، سەرمیلی، هلتەیی، پەری، چەشی، سفیدی، خەسرە و بەهمەنی، ئەسر ئابادی، هەندێکی تریان لە ناوچەی پاتاق و پشێوە چەشمە سفیدی – دا جێ گیرن.

کەرەجك- تیرەیەکی کۆنی کوردن شوێن و جێگایان نەماوە و بڵاو بوونەتەوە.

کەرەشەی – یا( کورە شەلی ) لە ناوچەی ئازەربایجان و کەناری روباری فورات دا نزیکەی( ٦٢٦٠ ) خێزانن هەموویان شیعە مەزهەبن.

کرمیی – نزیکەی(٢٠٠٠ ) خێزان ئەبن لە ناوچەی سیدلان و کفری و دەوروبەری خانەقین. ئەمانەش. سێ بنەماڵەن( سەر کالا، سەعدوڵلا بەگی، کوێخا بارامی ).

کەوش زێڕین – یا زێڕین کەوش. تیرەیەکن لە نەوەی( توسی کیانی ). شاری سنە شوێنەواری باوو باپیریانە بەشێکیان لە ناوچەی تاران دان.

کلاشی – ئەم هۆزە لە ناوچەی( جوانرۆ و تەرخان ئاواو ماکوان و زهاو کرماشان ) دا بڵاوبوونەتەوە. هەندێکیشیان لە ناوچەی شارەزووردان.

کلاوکەر – ئەم تیرەیە لە نێوان سنە و کرماشان دا بڵاو بوونەتەوە.

کلاوکوك – ئەمانە لە ناوچەی رەوانسەر و ماهی دەشت دا جێ گیرن.

---

[٧٦] لە زۆر جێگەی ئەم کتێبە وشەی( وڵاتی فارس ) بەر چاو دەکەوێ. ڕەنگە بڕێ کەس لەو مەبەستە بە هەموو وڵاتی ئێران بزانێ، بەڵام مەبەستی مێژوو نووسانی کۆن ئوستان ی فارسەکە ناوەندەکەی شارە ڕازاوەکەی شیرازە کە بە هۆی سەعدی و تیرەی کرمانی پەڕیوەی هەوشار بوون و لە ناو هەوشاریەکاندا تواونەتەوە پیشەی شاڵ و قاڵی کردنیان برەو پێ داوە و فەرش و شاڵ و خورجین و کیسە حەمام و گۆرەوی هەوشار بۆ جوانی و دەوام بە ناو بانگن و تەنانەت لە گۆرانی فۆلکلۆری کوردی دا دەڵێ.

هەر بێوە ژنێ شاڵ کرمانی بێ

هەزار گەورە کچ بە قوربانی بێ. " وەرگێڕ "

کەڵهور – نزیکەی دە هەزار خێزان ئەبن لە ماهی دەشت و هارون ئاوا قولاشاینی و – دەورو بەری قەسری شیرین و کەرەند – دا بڵاو بونەتەوە.

مەلبەندیان شاری – گیلان – ە. نزیکەی دوو سەد خێزانیان لە رستمان و خوڕ و دەورو بەری سەقزدا، جێ گیرن. ئەم هۆزە نزیکەی( ٢٠ ) بنەماڵەن.( خالدی، شەیانی، سیاسیا، کاڤم خانی،خەمان، تەلش، گەرگا کەلەجۆ، شوان، قوچی، مەنصوری، ئەلومندی، ماهی دەشتی، هارون ئابادی، شاهێنی ، موش کیر، بەداق بەگی، زەینەڵە خانی،کەسەرە.

کولیایی – نزیکەی سێ هەزار خێزانن لە ناوچەی سونگوری کرماشان و دەورو بەری سەقزدا زیاتر لە( ١٦٥ ) دێ کولیایی تیا ئەژی. ئەمانە بریتین لەم بنەماڵانە( سۆفی وەلای، لوسیومندی، پەشم وەند، شیرازی، میلە کەری ).

کلیسی – ئەم تیرەیە - مەندی – شیان پێ ئەڵێن. فەرماندەرەکانیان بە مەندو ناودا بوون هەموویان لە نەوەی( مەند )ن لە دانیشتوانی کوردستانی رۆژئاوای یانی نێوان دیجلە و فورات.

کەمانگەر – چەند خێزانێکن لە شاری سنە و دەورو بەری پلنگان و ناوچەی سلێمانی جێ گیرن.

کولەیی یا کەندۆڵەیی – نزیکەی چوار سەد خێزانن لە سەروو ناو شاری کرماشان دا هەن.

کۆچەری – نزیکەی دە هەزار خێزان ئەبن لە ناوچەی سیواس و زازا و ئازەربایجان. بریتین لە چوار تیرە( ئینلۆلر، بارلۆلر، سارۆلر، کارۆلر ).

کواردات – نزیکەی سێ هەزار خێزانن لە ویلایەتی( کواردات ) ئەکەویتە رۆژئاوای چۆلەمێرگە وە لە ئینسکلوپیدیادا لە بریتی کواردات کرو نووسراوە.

کورا – کۆرە – تیرەیێکن لە رۆژئاوای( شەقلاوا ) لە چەند دێ یەکدا جێ گیرن.

کورتی – ئەمانە لە دەورو بەری کەرکوکدان. هەندێکیشیان لە نزیکی بۆتان ئەژین. ئەمانە لەهۆزە کۆنەکانی کوردن لە شاخەکانی زاگرۆس دابوون لە سەردەمی( تۆکۆلتی تیراری ) ئاشووردا. میستەر( دراواری ) رۆژهەلاتناس ئەڵێت : ئەم تیرەیە لە کوردەکانی ئاراراتن و لە نەوەی، شۆمێرو ئەکەد ) ی داگیر کەرن. یانی گوتی کۆنن. لە

پاشدا هاپونەتە ناوچەی زاگرۆس. بەلآم رای میستەر( سدنی سمیپ ) و هەندێکی تر وایە : ئەم کۆمەڵە کوردەکانی رۆژهەلآتی( ماد ) ن وردە وردە بەرەو زاگرۆس هاتوون. یانی لە کوردەکانی بەشی زاگرۆسن.

کورمشلی – ئەم تیرەیە لەوە ئەچێ هەر ئەو تیرەی( کەرەشەل ) ئە بێت کە باسمان کرد.

کوریان – نزیکەی( ١٨٠ ) خێزانن لە خاکی عیراقدا( لە نێوان دیجلە و فورات ).

کوزلیچان – لە بنەماڵەکانی( دمرسیم لی ) ن.

کۆساد – ئەم تیرەیە لە ئینسکلوپیدیای ئیسلامدا باسکراوە لەوە ئەچێ هەر هەمان هۆزی( لۆسە ) بێت.

کۆسەیە - نزیکەی( ٤٠ ) خێزانن لە دەورو بەری( سەقز و سیاکۆ ) دا.

کۆکۆیی – نزیکەی( ٣٠ ) خێزانێکن لە ناوچەی جانرۆ و هەندێ خێزانی تریان لە دەور و بەری شاری – هەڵە بجە - دان.

کۆکلۆیی – ئەمانە لە هۆزی لوری گەورەن. لە ناوچەی کرماشان و لورستان ) دا ئەمانەش( سێ لق ) ن. باوی، جەگی، ئاغاجری،ئاغاجریەکان لە ناوچەی( سنە ) شدا هەن. نزیکەی( ١٠ ) دێ یە ك ئەبن.

کولینی – ئەمانەش بەشێکن لە زازاکانی خواروی خەرپووت.

کۆلی وەندی – نزیکەی( ٢٥٠ ) خێزانن لە ناوچەی ئالستر و کەناری روابری( سیمرە ) بەشێکن لە هۆزی پشتکۆ.

کۆماسی –( ٢٠٠ ) خێزانن لە ناوچەی( کەرەوزی سنە ) دا نیشتەجێن.

کۆیان – نزیکەی( ٢١٠٠ ) خێزانن لە ناوچەی شەرناق – دا جێ گیرن.

کۆیەك – دەورەی( ١٥٠ ) خێزانن لە دەور و بەری ژاوەرۆی سنەدا.

کەکی – چەند خێزانێکن لە ناوجەی چۆڵەمێرگ دا.

کیچان – نزیکەی( ١٥٠ ) خێزانن لە رۆژئاوای کوردستانی عیراق بلآون.

کیکیان – تیرەیەکن لە - مرعش – دا. ئەستەخەری لە ل( ١١٥ ) دا باسی کردوە.

کیکیە - هەر هەمان تیرەی( چیچیە )ن کە باسمان کرد.

کێوانلو – بەشێکن لە هۆزی حسانلو کە شاعەباسی سەفەوی کۆچی پێ کردن بۆ ناوچەی خۆراسان.

کێوران – تیرەیەکن لە ناوچەی( گۆڕ ) دا.

- گ -

گاخۆر – یا گاخوار – نزیکەی( ٢٠٠ ) خێزان ئەبن لە قەهەر تەپەی کەرکوك و خانەقین.

گاوری – تیرەیەکن لە لوڕەکانی ناوچەی پشتکۆ.

گەردی – نزیکەی( ٦٠٠ ) خێزانن لە سەرووی هەولێرەوە.

گەرگەیی – چەند خێزانێکن لە ناوچەی کولیایی و ڕۆژهەلاتی سنە.

گەشکی – نزیکەی( ٥٠ ) خێزانێکن لە دەوری( بیلوار و زەهاو و خاچۆمان ) دا.

گەلالی – ئەمانە هۆزێکن لە جافی گەورەی عیراق. هەندێکیان لە ناوچەی( نتهاوەند ) ان ئەمانە تا ڕادەیەك هەڵس و کەوتیان گۆڕاوە. هندێکی تریان لە ناوچەی شارەزووردا جێ گیرن. زیاتر لە( ٦ ) دێ ئەبن.

گەڵباخی – نزیکەی( ٢٠٠٠ ) خێزانێك ئەبن لە( هۆیاتو )( سارالْ )و( تەومرە ) لە سەردەمی شا( تەهماسب ) دا لە شیرازەوە بۆ ناوچەی سنە و کۆچیان کردوە جارێکی تر لە سەردەمی ڕەزا شای پەهلەوی دا لە ناوچەی( سنە ) ش گوێزراونەتەوە بۆ( هەمەدان و سیادەومن و تاران ) بە هۆی ڕاپەڕینی گەڵباخیەکانەوە لەو ناوچەیەدا. ئەمانەش هەشت تیرەن( قەرەمەری گاملی، کاکسووەندی، مرادگۆرانی، چۆخەڕەشی، پیتوسەری، هەمزەیی، کولکنی ).

گوڵەفەرخی – لە نێوان دهۆك و زاخۆدا جێ گیرن.

گۆران – نزیکەی شەش هەزار خێزان ئەبن لە ڕۆژ ئاوای کرماشاندا جێ گیر بوون ئەمانەش( ٦ ) تیرەن( قەڵغانی، بێ بیانی، تیرێژی، گهوارە، کانیزنجیری، ڕیزە هو ). گهوارەکان دراوسێ ی هۆزی سەرەف بەیانی و سنجاوی و باجەلانیەکانن نزیکەی دوو

هەزار خێزانیان لە شاری سنە و هەورامان و ژاوەرۆ و پلنگان ) دا جیٚ گیرن، بە زمانی گۆران قسە ئەکەن وبە کشتوکاڵەوە خەریکن.

گۆرەك – یا گەورك نزیکەی دو هەزار خێزان ئەبن لە ناوچەی سەردەشت و موکریان دان.

گەڕوسی – تیرەیەکن دراوسیٚ ی( کۆلیٚن ) لە نزیکەی خەرپووت.

گوگرشانلی – نزیکەی( ٥٠٠ ) خێزانیکن لە سەرووی – مرعش – دان.

گیٚژی – تیرەیەکن لە دەوروبەری – کفری – دا ئەژین.

گیٚل تا گیٚلانی – تیرەیەکی زۆر کۆنی – ماد – ن لە نەوەی ماداتی کوڕی یا پژ کوڕی نوح – ن. لە بەر حەوری لە کوردەکانی رۆژهەلاٚتن. یۆنانیەکان بە( کاردۆس ) یا – کاردۆشی ) ناویان بردوون. ئەگەر ئەم وتەیە ڕاست بیٚ کە لە کاردۆیشەکەی( کەزنەفۆن ) ە وە هاتبیٚ ئەوا بە پیٚ ی ڕای مستر( درادار ) ن دکتۆر سپایزار ئەمانە لە کوردەکانی بەشی( ئارارات ) ن بەلاٚم بە ڕای( سدنی سمیث ) کاتی هاتنی مادو پارس بۆ ئەم شوێنەی ئیٚستایان( ئیٚران ) هۆزی کاردۆشی بەرەو رۆژئاواو کەناری دەریای خەزەر هاتوون. لێرەدا ئیٚمە وتەی یەکەم ئەسەلمیٚنین کە ل"ە کوردەکانی رۆژهەلاٚتن بەلاٚم هەر ئەم رۆژهەرلات ناسە ئەلیٚت کاردۆشیەکان زۆر لە پارسەکان کۆنترن. زمانی تایبەتی خۆیان هەبووە. کەهیچ پەیوەندیەکی نەبووە بە زمانی فارسی کۆنەوە. نیشتمانی ئەم هۆزە لە رۆژهەلاٚتەوە مازندەران و لای ژوورووەوە کەناری دەریای خەزەر دەست پیٚ ئەکات. تا سنووری ئازەربایجان و خەمسەو قەزوین دریٚژ ئەبیٚتەوە. پانتایی خاکەکە( ٢٢٥ ) کم بوە، بەگیٚلان ناودار بووە. لە کۆنا بە( وارنا ) بە ناوبانگ بوە " وەك لە ناویستادا نووسراوە ". وەك باسمان کرد ئەوەی – گیٚل و خەزەر دەیلەم )ن لە نەوەی( ماد )ن یانی کوردەکانی بەشی رۆژهەلاٚتن.

گیوران – تیرەیەکن لە سیوەرك و ناوچەی دەرسیم.

گیوەرەش – لە مەوبەر باسمانکرد.

- ل -

لاباز – مەسعودی لە مروج الزهب – دا ئەڵیٚ( ئەمانە لە کوردەکانی – جبال الاکراد – ن.

لاوین – یا لاوینان – له شارەزوور جێگایان بووە. ابن خلدون له( مێژووی بەربەر)دا ئەنووسیٚ( جەزائیر – جێگایان بوون. لەوە ئەچیٚ کاتی داگیر کردنی شارەزور لەلایەن مەغۆلەکانەوە ئەم هۆزە کۆچیان کردبێتە ولاٚتی جەزائیر"[77].

لالەیی – نزیکەی( ٦٠٠ ) خێزانێکن له - لەیلاخ – ی سنەدا جیٚ گیرن.

لوڕ – وەك له باسەکانی پێشوماندا چەند جار هاتوە ئەمانە هۆزێکی گەورەی دەسەلاٚتدار بوون له دوو لق پێك هاتوون ١- فەیلی، ٢- مام حەسەنی یا مامە سەنی، یا لوڕی گەورە و لوڕی

بچووك یا فچولیە. هەندێك لوڕ بە دوو بەش دائەنێن پشتکۆو پێشکۆ. هۆزی لوڕی گەورە یانی مام حەسەنی له( ٢٩ ) تیرە پێك هاتوون( فەیلی، کۆگلۆیی، لەك، بەختیاری، ماهەکی، ئەنبارلو، بەیات،بێراوەند، مامەسەنی، ساهی، ئارسان، ئارکی، بهی، دێرکەوەند، سەگوەند، بالاگرێوە، کیسەوەند، زازاوەند، بالاوەند، جەلیل وەند، باجلۆوەند، مانی، سەعدوەند، قەرەزنجیر،زەنگەنە ). هەموو دانیشتوانی ناوچەی لوڕ پشتکۆو پێشکۆ( لوڕی گەورە، لوڕی بچووك ) زیاتر له هەشتا هەزار خێزان ئەبن زۆربەیان مەزهەبیان شیعەیە"[78].

لەك – تیرەیەکن له هۆزی گەورەی لوڕ کە نزیکەی سەد هەزار کەس ئەبن ئەم تیرەیە له پێنج لق پێکهاتوون : -( سلسلەیی، لالەیی، دلفان، تەرهان، دالْوەند ) زۆربەیان شیعە مەزهەبن له ناوچەی( خانەقین و خورەم ئاباد و( ئالشتر ) لورستاندا جیٚ

---

[77] مامۆستا محمدمستەفا( حەمەبۆر ) لەم بارەیەوە ئەم ڕوونکردنەوەیەی نوسیوە" من لام وایە گەلیٚ لەوە کۆنترن.وله هەمان( لاوی ) و( لاوین ) و کانن کە له تەوراتدا باسکراون کە له سەردەمی حەزرەتی موسادا له دەوروبەری ڕۆژهەلاٚتی دەریای سپی ناوەندا جموجوٚلیان هەبوە و هەر لەو سایشەوە گەیونەتە جەزائر و بە پیٚ ی لێکۆلینەوەیەکی فراوانم لەسەر( بەربەرەکانی ژووروی ئەفەریقا ) ئەمانە بە بنەچە ئەگەنەوە بە( ماد ) یەکان وتاوەکوئێستەش له ناوچەی جەزائر هەر( نوماد )یان پیٚ ئەلێن بە واتا( میدی ) یامادی نویٚ.ئەك بە واتای وشەی نۆ مادی ئینگلیزی کە مەبەس له( خێلاٚتی ڕەوەند )ەو بەلگەو سەرچاوەی بەهێزم لەمەڕنەمە وە زۆرە کە شوێنی ئەو درێژە پیٚ دا نیە.

[78] یاقووتی حەمەوی له – معجم البلدان -، جودت پاشا له بەرگی یەکەمی کتێبەکەی ل( ٢٤٥ ) دکتور فریج له کتێبی( کوردلر ) و( سرمالکم لوریە هەساو براون ئینسکلوپیدیای ئیسلام له بارەی هۆزی لوڕو بەختیاری بە درێژی نووسیویانە کە هۆزێکن له نەتەوەی کورد

گیرن دیسانەوە لە کولیایی و هەمەدان و ئەسفەهان - دا هەن جگە لە مانەش هەندێکی تریان لە نێوان( دەولەت ئاباد و سولتان ئاباد و دەوری سنە و سەلماس )دا هەن.

لەکی کوردی - ئەمانەش بەشێکن لە تیرەی لەك لە نزیك( ئەگنە ) دا جێ گیرن.

لۆسەیی - کۆن لە شارەزووردا جێ گیر بوون لە پاشدا بەرەو میسرو شام کۆچیان کردوە لە ئەنسکلوپیدیادا کۆساد نووسراوە لە بریتی لۆسەیی.

لۆلانلی - نزیکەی( ٤٨٠ ) خێزان ئەبن لە سەروی رۆژئاوای( موش ) دا هەموویان شیعەن لۆلەرزی - بەشێکن لە هۆزی( مەندەمی )دا لە دەوروبەری( حسین ئاوا )ی سنەدا جێ گیرن.

لۆلۆ - ئاشوریەکان( لۆلۆم ) یان پێ وتون ئەمانە لە رەگەزی بنەڕەتیەکانی کوردن لە ناوچەی( شەنگار) داجێ گیرن ئەوەی ئەو هێزمن کە بەدە ستی ئەرامسین ی کوری سەرجۆن شکان.

لەیلانی - نزیکەی( ٥٠٠ ) خێزانێکن لە ناوچەی لە یلان ی پارێزگای دهۆك.

- م -

مابیر - ئەمتیرەیە لە ئینسکلوپیدیای ئیسلامی دا بە( باسیر ) یا( باسیری ) نووسراوە.

جوردان - یا ماگردان ئەمانە تیرەیەکی ئازاو دلێرن لە ناوچەی( گەنگاوەر )دا جێ گیرن.

مەسعودی لەمروج الزهب - دا باسی کردوە.

مەحالی[٢٩] - یاماحالی - بەشێکن لە کوردەکانی ناوچەی فارس( ئەستەخەری و ابن حوقل ) باسیانکردوە.

ماخانی- نزیکەی( ٣٠٠ ) خێزان ئەبن لە خواروی( یوزغاد ) دا لقێکن لە هۆزی( میللی ).

مادنجان - شوێنکەگای ئەمانە ناوچەی شاخاویە - جبال الاکراد - و مەسعودی باسی کردوە

---

[٢٩] لە مەلبەندی مهاباد دا ناوچەی مەحالْ هەیە کە زیاتر لە( ٨٠ ) گوندە.

مازنجان – یامازنجانی نزیکەی( ٥٠٠ ) خێزانێکن لە ناوچەی مازنجان کە ئەمانە( کاك ) یا( مبارزکاك ) یشیان پێ ئەڵێن.

ماڤی – ئەمانەش بەشێکن لە لەك لە بنەڕەتا لە چیاکانی ڕواندوز و سابلاغ – دا بوون لە پاشدا شا عەباس بەرە و ڕەیی و شهریار و ناوچەی قەزوین کۆچی پێ کردوون.

ماگەردان – هەمان تیرەی( ماجوردان ) ە کە باسمانکرد.

مامش – نزیکەی( ١٥٠٠ ) خێزانێکن لە دەوروبەری سابلاغ و موکریان دا. چەند خێزانێکیشیان لە ناوچەی( لاجانی تازە ) دایە.

مام حەسەنی – یا مامەسەنی – بەشێکن لە هۆزی لوڕی گەورە لە ئەنسکلۆپیدیای ئیسلام باسی

دوو تیرە کراوە کە لە( بلوجستان ) نیشتە جێن یەکێکیان مام هەسەنیە.

مامەکانلی – تیرەیەکن لە سەرووی مەلازگرد ەوە.

مانیان – یا مانایان ئەمانەلە کوردەکانی بەشی ڕۆژهەلات بوون ئێستا هیچ پاش ماوەیەکیان بەدی ناکرێ[٨٠].

مانۆرانلی – هۆزێکن لە نێوان مەلازگرد و الشگردا.

ماهەکی – یا ماهەکی – لە ناوچەی هەلیلان و دەوروبەری کرماشان دا جێ گیربوون. لە هۆزی لوڕی گەورەن.

موبارزکاك – هەر هەمان تیرەی مازنجانی یە کە باسمان کرد.

موبارەکی – یا موارەکی مقلسی و ئەستەخەری وابن حوقل – لە کوردەکانی وڵاتی فارس ناویان بردون.

محەمەد ئیسحاقی – ئەستەخەری لە کوردەکانی وڵاتی فارس ناوی بردون.

---

[٨٠] مامۆستا محەمەد مستەفا حەمەبۆر لەم بارەیەوە نووسیویە " هۆزی هەرکی کە بە پێ ی لێکۆڵەوەیەکی فراوانم لە سەر خێلە کوردەکان ئەچنەوە سەر( ماد )ی یەکان و ئەم هۆزەش سێ بەشی سەرەکین کە( مەندا ) یا( مەندان ) و( سیدا ) و( سەرهات ) ن و بۆم ساغ بۆتەوە ئەم( مامنیان – مانایان ) هەمان( مەند ) یا( مەندان ) ی بەشی یەکەم و مەزنی هەرکین. ئەم بەشە کە ئاغای هەرە گەورەی هۆزی هەرکی سەرۆکایەتی هەر سێ بەشەکە ئەکات لەم بەشی( مەندا ) یا( مەندان ) ە یە خۆیشم سەرەك لیژنەی سەر ژمێری ڕەسمی ساڵی( ١٩٥٧ ) ی هەرکیم کرد کە پتر لە نیو ملیون کەسن لە عیراقدا.

محەمەدباشار – ئەم تیرەیەش ئەستەخەری بە کوردەکانی وڵاتی فارس ناوی بردون.

محەمەدی – نزیکەی( ٣٠٠ ) خێزانن دراوسێ ی( مازنجانی ) و( حمیدیە ) ن. لە مسالك الابصار نووسراوە ئەم هۆزە( ٦٠٠ ) پیاوی شەڕکەری هەیە و بە ڕەگەز ئەچنەوە سەر( بەختی ) یەکان.

محمود جبرایلی – نزیکەی( ١٠٠ ) خێزانێکن لە ناوچەی لەیلاخ دا.

محمودی – هۆزێکی گەورە بوون لە رۆژهەلاتی( وان ) نزیکەی( ١٢٠ ) خێڵ بوون. دەوڵەتێکی سەربەخۆیان بوە هەمیشە نزیکەی شەش هەزار چەکداریان بوە ئێستا پەرش و بلاون.

مودەپر – ئەستەخەری ابن حوقل ئەڵێن لە کوردەکانی رۆژئاوای عیراق ئەمانەش سێ بنەماڵەن( پالو، چەرموك، ئاکیل – بلدوتانی.

مەرداسی – بەشێکن لە کوردەکانی رۆژ ئاوای عیراق ئەمانەش سێ بنەماڵەن ( پالو ، چەرموك ، ئاکیل – بلدوتانی .

مەریوانیی – نزیکەی هەزار خێزانن لە ناوچەی مەریوان یانی دەوروبەری گۆمی زرێبار.ن.ئەمانەش بەشێکن لە کرمانج لەبەر ئەوەی لە هەورامانەوە نزیکن زمانیان هەندێ گۆرانی تیایە لە کۆندا سەربەپارێزگای کەرکوك بوون. لە پاشا بوونەتە بەشێك لە دەسەلاتداریەتی ئەردەلان.

مەزدانەکان – مەسعودی لە مروج الذهب – دا بە کوردەشاخاویەکانی ناو بردوون.( جبال الاکراد ).

مزوەری – یا موسووری – یا مەی سوری نزیکەی( ١٧٠٠ ) خێزانن لە ناوچەی دهۆك.

مستەفابەگی – نزیکەی سی خێزانێکن لە ناوچەی چەمەنزار و زەلان نیشتەجێن بەشێکن لە هۆزی قوبادی.

موگلبی – ئەستەخەری ئەمانەش بە کوردەکانی وڵاتی فارس ناو ئەبات.

موگری – یا موکریان ئەم هۆزە بریتین لە سێ تیرە( مەنگوڕ، مامش، پشدەری). لە پاشماوەی مادەکانی ناوچەی موکریانن زمانیان لە زمانی ناویستاوە نزیکە.

موگری گورك –( ٢٤ ) دێ ئەبن لە ناوچەی موکریان.

موکری وبۆلاق – ئەمانە دوو هۆزن لە( ٢٩٧ ) دێ دا جێ گیرن. لە ناوچەی موکریان.

مەلا شتیکۆ – ئەم تیرەیە لە کوردەکانی ( مابین النهرین )

مەلکانیان – بەشێکن لە کوردەکانی رۆژئاوا. ئەمانە بەفەرمانڕەوایانی( حصن کیف ) ناودارن.

مەلەك شاهی – ئەم هۆزە لە دانیشتوانی پشتکۆن ئەمانەش( ١٦ ) لق ئەبن. خێلی( کەچی، بۆلی، خەزەل ) لەمانەن.

مەندەمی – نزیکەی( ١٢٠٠ ) خێزانن لە شارەزورو زههاوو دەورو بەری( حسین ئاوا ) ی سنە لە ناوچەی( بازیان و سەرخوار ) یشدا هەن. ئەم هۆزە لە پێنج تیرە پێك هاتووە محمد مرادی، لە شارەزوورو زههاو. تاری مرادی لە قرخلدو کانی درێژ. ئاخە سووری لە گەرمە سێری سنە. عەلی مرادی لۆلدەرزی لە ناوچەی حسین ئاوا[٨١].

مەنگوڕ – نزیکەی( ١٥٠٠ ) خێزانن لە ناوچەی سابلاغ( مههەبادی ئێستا ) ئەمانە لە( ١٤٨ ) دێ دا جێ گیربوون.

مەنوچەری – نزیکەی( ١٥٠ ) خێزانێکن لە( زهاو چەمچەمال و جوانڕۆ ) دا بەشێکن لە هۆزی قوبادی.

مودانلی – یا مودانلو ئەمانە لە ناوچەی مازەندەران – دا جێ گیرن.

مۆدەکی – یا مۆتەکیان ئەمانەش حەوت بنەماڵەن سێ تیرە لەمانە مۆتەکی ئەسڵن " زیدان،ئاریکلی، پیرموسا " چوارتیرەکری تر زازان و لە مۆدەکیەکانن،( بۆبالمی، رۆچایە، کەرسۆن، کێبوران ). ئەمانە هەموویان لە چیاکانی سەرووی بەتلیس نیشتەجێن.

مۆستاکان – شوێنیان ناوچە شاخاویەکانە.

موسی – یا موساییەکان ئەمانە لە کوردە رۆژئاواییەکانن و شوێنیان نادیارە.

موساوەند- نزیکەی( ٢٥٠٠ ) خێزانن لە خاکی – خاوە - دەورو بەری – دلفان – دان.

موشەك – هۆزێکن لە نێوان( سەعرد و دیاربەکر لە کەناری ڕوباری دیجلە - دان.

---

[٨١] نووسەر ئەم هۆزی بە پێنج تیرە دەست نیشان کردوە بەلام تەنیا چواریانی ناو بردوە. "وەرگێر"

موهاجرینی خۆراسان – ئەمانە بریتین لە حەوت تیرەکە( شاعەباس ) کۆچی پێ کردوون( زافرانلو، کیوالو، عەمارلو، شادالو، پێچناوەند، باوەنوور). هەموویان لە هۆزی گەورەی( حسانلو ) ن.

مەهراکی – ئەستەخەری ئەم هۆزەی بە کوردەکانی وڵاتی فارس ناو بردوە.

مەهرانی – لە فتح القسی – ی فتح القدس ل ١٢ ئەڵێت ئەم هۆزە لەگەڵ سەلاحەدینی ئەیوبی دا بوون و شوێن و جێگایان ڕوون نی یە.

میر – نزیکەی( ٥٠ ) خێزانن لە خاکی( ئالشتر ) لە هۆزەکانی پشتکۆ و تیرەی میر بابان- ن.

میران – نزیکەی هەشت هەزار خێزانی کۆچەرین بەزستان لە دەورو بەری( جزیرەی ابن عمر ) و بەهاوین لە دەورو بەری( سەعرەد )( سعرد ) دان.

میرسنان – بەشێکن لە کوردەکانی ڕۆژئاوا( مابین النهرین ).

میلان – هۆزێکن لە دەور و بەری ئازەربایجان و نێوان ئاراس و کێوی( سوکار ) و( ماکۆ ).

میللی- نزیکەی بیست هەزار خێزانن لە دەورو بەری( دەرسیم و قەرجەداخ و عوسمانجق ) دا ئەمانە بریتین لە( ٤٤ ) تیرە بەم شێوەیە :

( دانان، سەیدان، کیران، دویکاللی، خەلەجان، گلیش، مەندان، گۆمەڕەش، شەرکیان، عەلکەوان، داشی، مشکانلی، کالندەلان، حاجی بایرام، حەسنەکان، خەلەجاڕ، عولیا، ئایسپادات، تەرکان، ناصریان، چوان سارتان، نۆبەخان، ماتەمیە، چەمیکان، حەسۆیە، بارگەوان، چەپاڕەشی، زمبرونکان،

بۆجاق، تاغباشی، هۆشیان، بسکی، جاجم یانلی، کاسایی، حەقایی، مەردەس، عەترکێشی، جان بەگ، بەگلیان، دڕەجان، کانۆ، موکلیان، قەرەکێچ ).

تێ بینی : – زۆر لە هۆزو تیرەکانی کورد لە نەتەوەکانی دەور وبەردا تواونەتەوە هەروەها زۆر لە تیرە و هۆزەکانی نەتەوەکانی دەورو بەریش لە ناو کوردا تواونەتەوە، بەم شێوەیە تێکەڵ بوون.

– ن –

ناشادیرا – تیرەیەکن لە نزیک( مرعش ) ئەستەخەری لە ل( ١١٥ ) دا باسی کردوون.

ئاصرلی – نزیکەی( ٦٠٠ ) خێزانن لە خوارووی ئەنقەرە لە نزیک قەرە عەلی جێ گیرن.

ئامی وەند – نزیکەی( ١٠٠ ) خێزانێکن لە( رەحیم ئاوا ) ی ماهی دەشت و زەهاودان.

ئانەکەلی – نزیکەی( ١٥٠ ) خێزان ئەبن لە( دینەوەر ) و دەورو بەری( بیلوار ) دا ئەمانە( عەلی ئیلاهی )ن.

ئەدرلی – تیرەکی لە ڕۆژئاوای مرعش دا.

ئادری –( ١٠٠ ) خێزان زیاترن لە مێرگە سارو ئاودەلان و جوانڕۆی سنەو ماهی دەشتی کرماشان دا لەوە ئەچێ لە پاشماوەی( ئایری )یەکان بن.

ئادری – هۆزێکن لە دەورو بەری شەمدینان لە پاشماوە و بەڵگە کۆنەکاندا دەر ئەکەوێ کە لە پاشماوی( ئایری ) یەکانن.

ئەری – هۆزێکن لە دەوروبەری شەمدینان لە پاشماوەو بەڵگە کۆنەکاندا دەرئەکەوێ کە لە پاشماوەی ( ئایری )ەکانن .

نوورالی – نوورعەلی – نزیکەی هەزار خێزانن لە سەرووی( تەرهان و خاوە ) لە ناوچەی پشتکۆدان.

ئێرکارین – لە ئینسکلوپیدیای ئیسلامی شوێنی ئەم هۆزە لە( نێوان کەرکوک و تاوق دیاری کراوە ).

نوور وەلی – ئەمانە لە هۆزی جاف ی گەورەن و لە شارەزووردا جێ گیرن.

نێرێژی بەشێکن لە گۆران لە دەورو بەری کرماشان دا جێ گیرن.

- و -

وان – یا دانیان – تیرەیەکن لە دەورو بەری – وان – دا جێ گیرن.

ورمزیار – ئەمانە تیرەیەکن لە( گەڵباخی ) یەکان بەڵام خۆیان بە جیاواز و سەربەخۆ ئەزانن ئەمانەش دوو لقن ١- ١-ورمزیار ٢- رەمزینە، لە ناوچەی( دیواندەرە ) دا جێ گیرن.

ولیدبەگی – نزیکەی( ١٠٠ ) خێزانێکن لە دەوروبەری( جوانڕۆ و زەهاو ) دان ئەمانە بە ئازاو جەسوور

بەناوبەنگن بەشێکن لە جافی جوانڕۆ.

ولیانی یا ولیانلی – ئەمانە تیرەیەکی گەڕۆکن لە نزیکی( مرعش )دا.

–ه–

هازبەتی – مەسعوودی لە مروج الذهب – دا باسی کردوە لە دەورو بەری ئازەربایجاندا ئەژین.

هەرکەیی[82] یاهەرکی نزیکەی بیست هەزار خێزانن لە ڕەواندوزو دەورو بەری عەقرەو ڤان و ئەرزۆم – دان.

هەفتیان – هەر هەمان هۆزی( شاری ) یە کە لە ناوچەی هەفتیان دا جێ گیرن.

هەکاری – یا حکاری باسمان کرد.

هەلاج – نزیکەی نۆ سەد خێزانن لە خوارووی گۆمی وان دا هەندێکیشیان لە ناوچەی سنە دان.

هایلان – یا حایلان – بەشێکن لە ناوچەی پشتکۆ.

هەمارلو – ئەمبارلو باسمان کرد.

هەماوەندی – تیرەیەکن لە سەرووی ڕۆژئاوای خانەقین دا ئەم تیرەیە چ لە شەرەف نامەداو چ لە جوگرافیای ڕامیاری ئێراندا هەر( هەماوەندی ) نووسراوە. لەوە ئەچێ هەمەوەندی بێت.

هەمەوند – یاحمەوەند یا ئەحمەدوەند ئەمانە هۆزێکی ئازاو دلێرن لە دەورو بەری بازیان و ناوچەی سلێمانی و خانەقین و خوارووی ڕوباری گێلان و چەمچەماڵ و دەورو بەری کرماشان دان هەندێکیشیان لە ناوچەی شیرازدا هەن کە بە هەمەوەندی شیرازی بەناوبانگن ئەمانەش لە نۆ لق پێك هاتوون( چەلەپی، چنگانی، پیریانی، کافرۆشی، ڕەشەوەند، ڕەماوەند، سەفەروەند، دۆفی وەند، سیتەبەسەر ).

هەورامی یا ئەورامی – باسمان کرد.

– ی –

یەزیدی یا یەزدی – هۆزێکن لە سەرووی( وان و سنجار و جزیرەی ابن عومەر ) دا. کە یەزدان پەرستیان پێ ئەلێن( یەزدان ) کۆی( یزد )ە. بەهەڵە بە هۆزی دەرسیملی و سنجار ئەلێن( یەزیدی ). وەك لە پاشماوە دێرینەکاندا دەرکەوتوە ئەم هۆزە پێش یەزید بەڵکو پێش ئیسلامیش لەم ناوچەیەدا بوون. بە( یەزدی ) بەناو بانگ بوون. جگەلەوەی ئەمانە بە کوردی گفتوگۆ ئەکەن شەیتان پەرستن و نوێژیشیان بە کوردیە ڕایان وایە کە –( یەزدخوا ) یش هەر بە کوردی ئەدوێ[83].

---

[82] لە کوردستانی ئێرانیشدا عەشیرەتی هەرکی لە خوارووی گۆلی ورمێ دا هەن.

[83] سێر مارك سایکس لە لاپەڕە( ٥٥٢ ) تا( ٥٥٨ ) دەربارەی ئەم هۆزە ئەدوێ.

یەعحوبی – ئەم هۆزە لە دەورو بەری موسڵ و چیای گودی دا جێ گیرن لەوە ئەچێ لە پاشماوی گودی – یەکان بن وەك مەسعودی لە مروج لاژهب – دا وتویەتی.

یوسوومندی – یا یوسف وەندی نزیکەی(٥٠٠) خێزانن لە( ئالشتر ) دا جێ گیرن ئەمانە بەشێکن لە چوار هۆزەکەی پشتکۆ.

یوسو یار ئەحمەدی – یوسف یار ئەحمەدی – ئەمانە لە ناوچەی کرماشان دا جێ گیرن. بە پێ ی لێکۆڵینەوەیەکی لیژنەی( عصبە الأمم ) هۆزی( سارلی، با جۆران، شاباك ) یش کوردن، ل( ٦٠ ).

جگە لەمانەی، باسمان کرد لەم شوێنانەی خوارەوەش کۆمەڵێکی زۆر لە نەتەوەی کورد هەن :

ئەفغانستان، بلوجستان، سیستان، سندهند، بغداد، دیالی، کوت، قزرابات، شارەبان،سووریە ، شامات، فەلەستین، ئاسیای بچووك[84]

- وتەیەك –

---

[84] تێ بینی : بە پێ ی ژمارەی ئەو خێزانانەی کە لەم بەشی( هۆزەکانی کورد )ە داو بە پشت بەستن بە سەرچاوەی بە هێزەوە دیاری کراوە، جگە لەوەی کە بەدەیان هۆزیشیان ژمارەی خێزانەکانیان دیاری نەکراون کە ئەوانیش بەلای هەرە کەمیەوە چوار یەکی ژمارەی خێزانە دیاری کراوانە کە نووسەری ئەم مێژووە لەم بەشەدا جێ گیری کردوون بریتی یە لە( ) خێزان. ئەبی ئەوەش بزانین ئەم ژمارانە هی( ٧٠ ) ساڵێك بەر لە ئێستان. وە بە پێ ی ژمارەی خیزانی خێلە کوردەکانیش کە زۆر خێزانی وە هایان هەن ژمارەیان ئەگاتە پتر لە( ٣٠ ) کەس لەیەك خێزاندا. چونکە ڕەوشت و نەریتی خێلەکی لە کوردەواریدا وەهایە کە( کور ) یا( برا ) ژنیان هێناو کوڕی ئەوانیش کە ژنی هێنا لە یەکتری جیا نابنەوە. بو ئەوەی ژمارەی خێزانەکەیان زۆر تربێ و لەو زۆریەمایەی هێزو دەسەلات و توانایی و دارایی و شانازی و بەناوبانگی یە بەلایەنەوە بەمەش ئەتوانن ئاژەلەکانیان بپارێزن لە دەست درێژی کەسانی تر چونکە مایەی خێلەکی ئاژەلە. جا بەم شی کردنەوەیە ئەگەر ژمارەی مام ناوەندی کەسانی هەر تەنیا یەك خێزانی هۆزەکانی کوردبە( ١٠ ) کەس دابنێین، وەك لە سەرەتای ئەم مێژوەدا ڕاستی ئەمەوانانە ئەگاتە نزیکەی( ١٠ ) ملیۆن و نیو کەس. ئەمە جگە لە شارنشینەکان و ئەوانی ژمارەیان دیاری نەکراوە یا لەم مێژوەدا ناونوس نەکراون و ئەوانی لە کۆنەوە رواڵەتی هۆزایەتیان بەسەرەوە نەماوە یا ئەوانەی لە دەرەوەی کوردستانی کە ئەوانیش پتر لە دوو ئەوەندی ژمارە دیاری کراوەکان ئەبن کەواتە ئەگەینە ئەو ئەنجامە باوەرپێکراوەی کە بتوانین ژمارەی هەموو کورد بەکەمیەوە لە کوردستان و دەرەوەیدا بە پترلە( ٣٠ ) ملیون کەس دابنێین.

ئەگەر ئێمە بمانەوێ بە شێوەیەکی گشتێ دەربارەی هەڵس و کەوت وڕابووردووی کورد بنووسین. ئەوا ئەم کتێبە لە سنوور ئەچێتە دەرەوە. بەڵام تەنها ئەوەندە ئەڵێم ئەتەوەی کورد دەورێکی کاریگەرو سەرەکی دیوە لە پێش خستن و دامەزراندنی دەوڵەتی ئێران هەروەها لە پێشکەوتن و گەشە کردنی ئیسلام لە ناوچەکەدا یەکێك لە هۆ سەرەکیەکانی دەناسرێت. بەتاییەت زاناو فەرماندارەکانی کورد ڕۆڵێکی گرنگیان بینیوە لە بڵاو کردنەوەو گەشەدان بە ئاینی ئیسلام و لە دەسەلآت و هەیبەتی ئێران دا.

لە سەرەتای پەیدا بوونی دەوڵەتی عەباسیەو ئەتەوەی کورد و پیاوە ناودارەکانی هۆیەکی سەرکی بوون بۆ بڵاو کردنەوەی ئاینی ئیسلام لەوڵاتی فارس و عیراقدا. وەکو ناودارو خاوەن دەسەلآت( ابو سلمی خوراسانی ) کەبە یەکێك لە کوردەکانی خۆراسان ناو ئەبرێت بەدەستی دامەزمێنەری دەوڵەتی عەباسی( ئەبوجەعفەری منصور ) کوژرا. وەك( ابو دلآمە ) غولآمی حەبەشی لەکاتی کوشتنی( ابو مسلم ) دا ئەڵێت :

| | |
|---|---|
| ايا مجرم ما غير الله نعمتا | على عبده حتى يغيرها العبد |
| اخی دوله المنصور حاولت غدرنا | الا ان اهل الغدر ئباؤك الكرد |

پەیدا بوونی دەوڵەتی عەباسی بە تەواوی شێوازی وڵاتی ئێرانی گۆری و لە تیاچوون رزگاری کرد. کە دەسەلآت و هەیبەتی خۆی لە دەست دا بوو هەمووی بۆ گەڕایەوە. لە نزیك( زێ ) توانیان تۆڵەی تێك شکانەکەی( ئەهاوەند ) بسێننەوە.( ولیام مۆلبیێرو دۆزی) مێژوو نوسان ئەڵێن : لە سەردەمی خەلیفەکانی عەباسی دا. ئێران دەسەلآت و شەوکەتی لە دەست دابوو بەلآم زۆر بە ژیری و ئازایی توانیان دەسەلآت بگێڕنەوە دەست و فەرمانڕەوایەتی ناوچەکەیان کەوتەوە دەست توانیان یادی جەژنی نەورۆز بە ئازادی بکەنەوە.

زاناو ڕۆشنبیرەکانی کورد توانیویانە سامانێکی زۆر لە زانست و ئەدەب بنوسن وەك( نحو، صرف، فقه، اصول، حساب، هندسه، ئەستێرەناسی )... هتد، کە لە حوجرەو قوتابخانە ئاینیەکاندا تا ئێستاش سوودی لێ وەرئەگیرێ. هەروەك مێژوو نیشانمان ئەدات تاج و تەخت و دەسەلآتی سەردارانی ئێران لەلایەن بێچوە شێرانی کوردەوە بە دەست و بازوو کورزو خەنجەرو شمشێری ئەوانەوە پارێزراوە. وەکو( گیو، گودەرز، گۆرگین،

بەهرامی گوڕ، چۆپین، فەرهادە شیرین، حسین کورد)[85]... هتد، ئەمانە بەسەردارانی ناوداری کورد ناو ئەبرین کەبوونەتە هۆی شان و شکۆو دەسەلاَت و مانەوەی سەرداران و گەورەکانی کوردو پارس. کردەوە ئازاکانی( ئەحمەدی کوڕی مەروان) مەشهوور بە( نصر الدولە) دامەزرێنەری دەولەتی( مەروانیە) ی کوردی. خزمەت گوزاری فەرمانڕەوای( ئەخشیدیە) ی شام و تێکۆشانی( ئال خورشید) لە لوڕستانی بچووك. پاڵەوانیەتی( دیالمە)( ئالبویە) لە شیرازو بەغدا ئەمانە لاپەڕەکانی مێژووی کوردیان پرشنگدار کردوە.
ئەو بەڵگانەی باسمانکرد ڕێگامان پێ ئەدەن کە بڵێین " ئەتەوەی کورد هاوبەشی تەواوی کردوە لە پێش خستن و بلاَو کردنەوەی زانستی ئیسلام و پەرە پێ دانی. دیسانەوە کورد هۆیەکی سەرەکی بووە بۆ سەربەرزی و سەر فرازی دەولەتی ئێران ". ئەگەر سەردانێکی سەر تاسەری کوردستان بکەین و چاوی سەرنجی بدەینێ ئەبینین سەرتاسەری ئەم وڵاتە پڕە لە قەلاَو دیوارو سەنگەرو بورج و خەندەکی جەنگی. لە دامێن و لوتکەی چیاسەرکەشەکانی لە پانتایی دەشت و لەسەر
گردۆلکەکاندا. ئەمانە هەمووی نیشانەی سەربەرزی و سەربڵندی خەڵکی ئەم وڵاتەیە بۆ
پاراستن و لووت شکاندنی دوژمنان وداگیر کەرانی. زۆربەیان پاشماوەو شوێنەواریان تائێستاش لە کوردستاندا ماوەتەوە.( قەلاَی کەرەفتو) یەکێکە لەو پاشماوە دێرینانە( ئەم قەلاَیە ئەشکەوتێکی گەرەی موهەندیسیە کە تا ئێستا گەڕۆکەکانیش ئەیانتوانیوە بە تەواوی پێیدا بگەڕێن لە ناوچەی سەقزە)( وەرگێڕ).

---

[85] بنەماڵەی قارەمانی ئەفسانەیی ئێران( زاڵ) باوکی ڕۆستەم کوردن و هەروەك حاجی قادر ئەفەرمۆی گوردی شنامە پاکیان کوردن.

## بەندی یەکەم : - مادو وڵاتی مادەکان( مادستان )

ئەمانەوێ ئەوە روون بکەینەوە جیاوازی نێوان دوو وشەی کوردو ماد چی یە ؟ ئایا وشەی کوردو ماد بەیەك مانا دێت ؟ ئایا هەر یەکەیان مانایەکی سەربەخۆی هەیە ؟ زۆر کەس رایان وایە کورد یانی ماد. ماد یانی کورد، یاخود هەردوو ناومکە یەکێکیان بەمانای گشتی و ئەوی تریان بەمانای تایبەت دێت ؟ کورد لەمادە یاخود ماد لە کوردە ؟ گرنگ لامان ئەوەیە رەگەزی کورد باس کەین. ئەنجا پەیوەندی لەگەل مادا باس بکەین. وەك لە سەرەتادا باسمانکرد. کورد لە رەگەزی ئاری یە یانی لە هندو ئەوروپییەکان. بەپێ ی چەند بەلگەیەك ١- شێوەو قیافە( بەژن و بالا )، ٢- زمان ( زاراوە ٣- خووڕەوشت ٤- ناونیشانی بنەماڵە. کورد لە دێر زەمانەوە ناوی منالی ناوە( ئاری) هەر چەند کورد پەیوەندیەکی بەتینی لەگەڵ عەرەب و ئیسلامدا هەیە. بەلام ئاگاداری ئەم ناونیشانە هەر کراوە و ئەفەوتاوە. لەگەڵ ئەوەش دا ناوی عەرەبی و ئیسلامی هەر بەکار هاتووە. هەر چەندە لای زۆربەی خەڵك ناوە کوردیەکان زۆر بە نرخ بووە. وەك : " فەرهاد، گودەرز، فەرۆخ، شاپوور، ئاری، هۆشەنگ، جەمشید، فەرمیدوون، بەهتەن، پەروێز، بەهرام، سام، ئەردەشێر، ئەوشیروان، کەیخەسرەو، شەهریار، شیرین، نوش ئافەرین، ماهارۆخسار، گوڵ میهر، ئازەر، ماهی تابان، فەرەنگیز، نازەنین خورشید، ئافتاو، ناهید، گوڵناز ".

ناوی بنەماڵەکانیش وەکوو " زازا. کرمانج، لۆلۆ، بابان، گۆران، کەلهوڕ، مەنوچەری، کاکەوەندی، ئازادبەخش، تیراندوەند، جاف.( ٥ ) ئاین و پەرستنی کورد و زۆربەی ئەتەوە ئاریەکانی تریش هەر( ئاگر پەرستنی ) بووە ئاینی زەردەشتی ئاین و مەزهەبی پیرۆزی هەموو ئاریەکان بووە. وەك لە پێشدا وتمان( سامی یەکان ) ئاگر پەرست بوون. تاکو ئێستاش زۆربەی شوێنەواری پەرستگاو کوورە ئاگرەکانی کۆن لەگەلی جێگادا ماوەتەوە و بەدی ئەکرێت.

٦- شێوە و چۆنیەتی خانوو کردن لە کوردەواریدا، زۆربەی وەکویەك وایە و حەز ئەکەن هەمووی روە و رۆژ هەلات بێت. بە تایبەت ژووری نووستن بۆ ئەوەی کاتێ بەیانیان رۆژهەلدێ ئاگادار بن و هەر لە شۆینی خۆیانەوە بیپەرستن و سجدەی بۆ ببەن و ستایشی

بکەن[٨٦] وشەی( ئاریان ) یا( ئێران ) – هێرۆدۆت – بە وڵاتی رۆژهەڵات و رۆژئاوای و تووە یانی لەرووباری سەندەوە تا وەکو دەشتاییەکانی نێوان دیجلە و فورات کە کوردی بە جیاواز لەم سنوورە نەزانیوە،

ئەو بەڵگە نامەیەی لە سلێمانی دۆزراوەتەوە کە لە پێشا باسمانکرد بەتەواوی ئاگر پەرستێتی کوردەکان رۆشن ئەکاتەوە.

پاشماوە دێرینەکان و( علم الانساب ) بیبلوگرافیا و ئاپنوگرافیا ) بەڵگەیەکی روون و ئاشکران بۆ ئاری بوونی کورد. هەروەها لێکۆڵینەوە و خۆ خەریك کردنی رۆژهەڵات ناس و مێژووزانەکان بەڵگەی زانستی( ئەنترۆپولوجی و ئاپنولۆلجی )( خەڵك ناسی و رەگەز ناسی ) ئەوە روون ئەکەنەوە کە کورد لە نەوەی ئاری یە و ئاگر پەرست بوون و پەیوەندیەکی بەتینیشیان هەیە لەگەڵ ئاگرو رۆژدا، زۆربەی مێژوەکان بۆمان ئەگێرنەوە کاتێ( ئەسکەندەری فەیلەقوسی ) رێ ی هاتە شارەزوور( سێ سەدە و نیو پێش مەسیح ) دانیشتوانی کوردستانی رۆژئاوای مەجبور کرد کە بت پەرست بن، هەروها کوردستانی ئەردەڵان کە لە دوو لاوە پەیوەستی خاکی شارەزوورە ئەمانیش مەجبوور بە بت پەرستی کرد. بەڵام دانیشتوانی ژوورو رۆژهەڵاتی کوردستان بە ئاگر پەرستی خۆیان مانەوە و هیچ گۆرانێک لە نێوانیاندا رووی نەدا. بەڵام بەشی خوارووی کوردستان ماوەیەك بت

پەرست بوون لە پاشداو کۆتایی سەدەی پێنجەمی زاینی بوونە گاورو ئاینی مەسیحیان وەرگرت[٨٧]. ماوەیەکی زۆری پێ نەچوو لە ژێر سایەی سەرداریکی ئێرانی بەناوی( پاو ) گەراونەتەوە سەر ئاینی( مەجووس ) یانی ئاگر پەرستی. تا سەردەمی خەلافەتی خەلیفەی دەوم( عمر ) کە عێراقی داگیر کرد. پاش گرتنی عیراق هیچ ماوە نەمایەوە کە( یەزدی گورد ) شای ئێرانی لە( مەدائن ) دا بنیشێ بۆیە بەرەو عیراقی

---

[٨٦] موغەکان – پیاوی ئاینی، کاتێ رۆژهەڵ ئەهات و ئەیدا لە ئاوایی یەکسەر ئەچوونە سەربانی( هورمز دگاکان ) و پەرسگاکان و هاواریان ئەکرد. ئەی خەڵکینەن لە خەو هەستن، رۆژهەڵ هاتوە، هەمووتان رووی تێ بکەن و بیپەرستن، کاتی خەو بەسەر چوو. هەستن کاتی پەرستن و ستایشی هورمزدە.

[٨٧] مێژووی کلیسای کۆن ل ٢٠٠.

عەجەم کەوتە رێ تا گەیشتەوە دەورو بەری شاری کرماشان.( یەزدی کورد )سوپایەکی دوو هەزار کەسی بەهەموو کەل و پەلێکی جەنگەوە رووەو شارەزوور رێك خست لە ژێر چاودێری و سەرکردایەتی( پاو )[٨٨]. دا بۆ ئەوەی کوردەکانی ناوچەی شارەزوور بگەڕێنێتەوە ژێر چاودێری فەرمانڕەوایەتی یەزدی کوردەوە. بەم شێوەیە کوردەکانی ناوچەی شارەزوور داواکەیان پەسەند کردو گوێ ڕایەڵی فەرمانی( پاو ) بوون و بە هەموو کەرەسەیەکی جەنگیەوە ئامادەیی خۆیان نیشان دا. لەم کاتەدا هەواڵی چوونی یەزدی گورد بەرەو وڵاتی خۆراسان ئەبیێتەوە. پاو لەم هەواڵە زۆر دڵگران ئەبێت و ناچار نامەیەك بەم شێوەیە بۆ دانیشتوانی شارەزوور ئەنووسێ.( کورتەی نامەکەی پاو بۆ خەڵکی شارەزوور ) -( لەبەر ئەوەی شەهریار فەرمانڕەوای ئێران لەسەر داخوازی و دۆستایەتی خاقانی چین ڕوەو وڵاتی ڕۆژهەلات ڕۆیشتوە بۆ چاك کردنی سنووری خۆراسان( ماهووی سوور ) ئێوەش لە شوێن و جێگای خۆتان بمێننەوە تاوەکو خاوەن شکۆ ڕوەو نیشتمان ئەگەڕێتەوە ئەو کاتە لە فەرمانەکانی خاوەن شکۆناگادارتان ئەکەمەوە ).

" پاو شاپوور زاد "

پاش ناردنی نامەکەی پاو بۆ شارەزوور لەوبەری ڕوباری( سیروان ) ە وە مەنزڵێك ئەخەن لە دامێن چیایەك لە نزیکی دێ یەکی گەورەدا چادر هەڵئەدەن و بارگە و بنە ئەخەن خەڵکی دێ کە دێنە پیریانەوە و پیشوازیەکی گەرمیان لێ ئەکەن. پاوئەم میوانداریە بە هەل ئەزانێ و سوودی لێ وەرئەگرێ. ئەکەویتە گفتو گۆ کردن لە گەڵیانداو ئەیانخاتەوە سەر فەرمانڕەوایەتی ئێران و لە گاوری وازیان پێ دێنی و ئەیانگێڕێتەوە سەر ئاینی زەردەشت و لە دامێنی چیاکەدا پەرستگایەك و کورەیەکی ئاگریان بۆ ئەکاتەوە. ئەو چیایە بەناوی( ئاتەشگا ) وە ناودارە و دێ کەش بەناوی پاوە وە ناو ئەنێن( پاوە ) کە عەرەب پێ ی ئەڵێن( فاوج ). پاو ماوەی دوو مانگ لە ناوچەی پاوە ئەمێنێتەوە لە پاشدا بەرەو هەمەدان و ئەسفەهان ئەکەوێتە ڕێگا. بەهەر شوێنێدا تێپەڕی کردوە گێڕاونیەتیەوە ژێر دەسەلاتداری ئێران و پەیرەوی ئاینی زەردەشت. لە

---

[٨٨] پاو کوڕی شاپوور کوڕی کیوس برای ئەوشیروان کوڕی قوباد فەرمانڕەوای ئێران.

نزیك خۆراسان لەگەڵ( یەزدی گورد ) یەك ئەگرنەوە پاو ئاگاداری یەزد گورد ئەكات كە پێویست ناكات بچنە( خۆراسان ) لەبەر یەزدی ناكۆكی بەتین لە نێوان( ماهووی سووری ) و( پاو )دا لێرەدا یەزدی گورد ئەم و تەیە ئەگرێتە دڵ وكینە لە پاو ئەكێشێ ئەوەندەی پێ ناچێ سووپای ئیسلام لە خوزستان و كوردستان و عیراقی عەجەم نزیك ئەبێتەوە. یەزدی گورد بەرەو خۆراسان ئەكەوێتە رێگا و شاری ئەسفەهان جێ دێڵێت. پاو سەر پێچی لە فەرمانی یەزدی گورد ئەكات و بەرەونیشتمانی خۆی( مازەندەران ) ئەكەوێتە رێ.

وەك مێژووی ئێران و شانامە باسی ئەكەن یەزدی گورد شەهریار لە خۆراسان ئەكوژێ و سوپای ئێران بێ سەرپەشت ئەمێنێتەوە. ساڵی( ١٨ ) ی كۆچی ئیسلام بە فەرمانی خەلیفەی دووەم و لە ژێر فەرمانداری( ئیمام حەسەن ) و( عبدالله كوڕی عومەر ) و( ابی عبیدالله ی انصاری ) و چەند كەسێكی تر لە سەردارانی ئیسلام ڕوو ئێران ئەكەونە رێ. لە عیراقەوە. بەرەو ناوچەی كرماشان لێرەدا( ئیمام حەسەن )( حەزیفەی یەمانی ) و( قەیسەمی كوڕی عەباس كوڕی عبدالمگلب ) لەگەڵ سوپایەكی گەورەی چەند هەزار سوارەو پیادە ڕوەو( هەمەدان ) و( رەی )( تاران ) و مازەندەران ئەكەونە رێ.( عبدالله كوڕی عومەر )( ابو عبیدالله ی الانصاری ) لەگەڵ پێنج هەزار سواردا بەرەو شارەزور ئەكەونە رێ. لەم كاتەدا سوپای كورد كە خۆی ئامادە كردبوو بۆ بەرەستی لەشكری ئیسلام شەوێك لە ( سیروان ) ئەپەڕنەوەو بەرانبەر لە شكری كورد ئەوەستن. لە یەكەم هێرشدا( ابو عبیدالله ی انصاری ) ئەكوژرێ. هێرشی دوەم و سێ یەم كەسێ ڕۆژی خایاند سوپای موسوڵمانەكان سەرئەكەون. بەشێوەیەك كە شاخ و دەشت و دۆڵ بەخوێنی جەنگاوەرانی كورد سوور ئەبێ. لە ئەنجامدا هەموو دێهات و شارۆچكەكانی كوردستان كاول ئەكەن پەرستگاو ئاگردنەكان ئەروخێنن ژن و كچی كورد بەدیل ئەگرن و هەرچی سامان و دەوڵەت هەیە تالانی ئەكەن. ئەوانی مانەوە بوونە ئیسلام وازیان لێ هێنان لاشەكەی( ابوعبیدالله ) لە دامێنی چیای( شنروێ ) ئەنێژن لە نزیك شاری( هەڵەبجە ). كە ئێستا بۆتە دێ ی – عەبابەیلێ -.( عبدالله ی كوڕی عومەر )

چەند مانگێك لەو ناوچەیەدا ئەمێنێتەوە. تاوەكو لە جێگای ئاگردانی ئاگرو پەرستگاكان چەند مزگەوتێكی دروستكرد و یاساو فەرمانەكانی ئیسلامی لە خەڵكەكە گەیاند. لە پاشدا ڕوەو( هەورامان ) ئەكەوێتە رێ لە نزیك( پاوە ) تووشی شەڕو

کوشتارێکی خوێناوی دێت کە زۆربەی ئافرەت و پیر و منالی کورد بەدەستی سوپای ئیسلام ئەکوژرێ و لەناو ئەچن. عبدالله کوڕی عومەر لە شاری پاوە مزگەوتێکی دروست کرد. یەکێك لە کورەکانی( معاذ کوڕی جبل ) و چەند کەسێکی تری عەرەب جێ دێلێ. لە پاشدا ئەم عەرەبانە ژن و کچی کوژراوەکان مارە ئەکەن لەو ێدا جێ گیر ئەبن و منالێ ئەکەوێتە نێوانیان. بەم شێوەیە مانەوە کە تا ئێستاش گۆڕەکانیان لە نزیك شاری پاوەدایە عبدالله کوڕی عومەر پاش ماوەیەکی کەم توانی هەموو وڵاتی کورد بخاتە ژێر چاودێری ئیسلامەوە. لەبری کووره ئاگرو پەرستگاکان مزگەوتی دروست کرد و یاساو فەرمانەکانی ئاینی ئیسلامی بڵاو کردوە. هەرچەندە کوردەکان بەهۆی شەڕۆ شۆڕو کوشتارەوە دینەکەی خۆیان لەدەست داو ئاینی ئیسلامیان وەرگرت بەڵام لە ناوڕۆکدا مەیلیان بەرەو لای ئاینی باو باپیریان ئەچوو. لە سەرەتادا زۆر ئاگادارییان ئەکردو بە تەنگیەوە بوون بەڵام لە پاشدا وردە وردە بیریان چوەوە. شەڕەکانی سەردەمی خەلیفەی عەباسی هەموو شەڕی دینی بوو. لەو شەڕە خۆیناوییەی لە سالی( ٣٠٧ ) و( ٣٢٤ ) ی کۆچی لە ژووروی کوردستان ڕوویدا بۆ هەمان مەبەستی دینی بوو. دانیشتوانی ئیسلامیان هەرچەند موسولمان بوو بوون و نوێژوو یاساکانی ئیسلامیان بەجێ ئەهێنا بەڵام هێشتا هەندێ خوو ڕەشتی زەردەشتیان تێك نەدابوو تا سالی( ٨٤٢ ) ی کۆچی( مەولانا گشایش ) بابا گەورەی مەردۆخیەکان هات و دەستی کرد بە فێرکردنی قورئان و بڵاو کردنەوەی یاساکانی ئیسلام بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا لە ناوچەی هەورامانداا. سەرەڕای ئەوەی نزیکەی هەشت سەدەو نیو بەسەر ئەم گۆڕانەدا تێپەڕیبوو ئەیانویست لە ئیسلام هەڵگەڕێنەوە و پاخی ببنەوە و بگەڕێنەوە سەر دینەکە ی( پیر شەهریار )[89] کە بە یەکێك لە پیاوچاك و بڵاو کەرەوەی ئاینی زەردەشتیان زانیوە لە ناوچەکەدا( پیرشالیار وە پیرشەهریا لێرەدا هەر یەکێکن ). مەولانا گوشایش پیاوێکی چاوکز بووە بۆیە هەورامیەکان بە گوشایشە کوێر ناوی ئەبەن و هەوڵ و تێکوشانی ئەم کابرایە بۆ پەرەسەندن وناساندنی ئیسلام وای لە خەلکەکە کرد ڕەقیان

---

[89] ماریفەتی پیرشالیار – بریتی یە لە کتێبێکی گەورە لە چەند بەندێك پێك هاتوە. پڕە لە قسەی ئەستەق و وتەی بەنرخ. لە کۆتایی هەر بەندێکدا چەند پەندێك بە شێوەی هۆنراوە نووسراوە

لیٚ ی بیٚت و به گوشایشه کویٚر ناوی بەرن[90]. ئەگەر لە ریش سپی و پیاوە ئاقڵەکانی هەورامانت بپرسیایە ئایا قورئان کۆنە ماریفەتی پیر شرگریار ؟ لە وەڵامدا ئەڵێن : ماریفەتی شەهریار کۆنە قورئان دوێنیٚ گوشایشە کوێر هێنایە هەورامان لە کۆتایی هەر بەندیٚ لە کتێبەکەی پیرشالیار ئەم وتەیە بە هۆنراوە دووبارە بۆتەوە.

گۆشت جە واتای پیر شالیار بۆ هۆشت جە کیسا ستەی ر

یانی گۆیت لە وتەکانی پیر شالیار بیٚ و هۆشت بە لای پەیامبەری رەمز گۆوە بیٚت دانیشتوانی ئەمرۆی هەورامان وشەی( رەمزگۆ ) لە پەیامبەری ئیسلام ئەگیٚرنەوە. بەڵام پەیامبەری ئیسلام رەمزی نەبووە وبە ئاشکرا داوای پەیامبەری کردوە. واتای ریمزگۆ بریتی یە لە( زەردەشت ) کە بە( وحشور سپیماری ) ناوداره یانی( پەیامبەری رەمزگۆ )[91] ئەو کتێبەی باسمانکرد ئیٚستا لە هەورامان بە پیٚ ی وەسیەتی پیرشالیار ئەم کتێبە نابیٚ بدرێتە دەست بیٚگانە. هەموو پرە لە وتەی جوان و پەندی بەنرخ کە بەرزی و هوشیاری پیرشالیارمان بۆ دەرئەخات. ئەمەش وێنەیەك لە پەندەکانی : -

وەروێوە وارۆ وردە ورینە وەریسە برێو چوار سەرینە
کرگی سیاوە و هێلیش چەرمینە گوشلی میریو دوی برینە

واتە بەفریٚکی ئەبارێ بەفرە خۆرکەیە، گوریس کە بچرا چوار سەر پەیدا ئەکات،مریشکی ماڵی پەرەکەی رەشە، کەچی هیلکەکەی سپی یە. مە نجەڵ کە کونی تیٚ بو دوو سەر پیدا ئەکات لیٚرەدا مەبەست لە

---

[90] لە سەرەتای بەندی یەکەمی کتێبە کە لە بریتی( کیاستە ) کە بە مانای( نێرراو) دێت وشەی( روشت ) نووسراوە کە روشت بە مانای( دانای رەمزگۆ ) دێت. لەو ئەچی روشت دروست تریت

[91] کتێبی دبستان لامذاهب ل ١٠

بەر هەڵستی سوپای دوژمنە و بەرگری لە خاك و نیشتمان، ئەڵێت یەك گرتن و یەك بوون مایەی سەربەرزی و سەرکەوتنە. دیسانەوە لە پەندێکی تردا ئەڵێت : -

داران گیانداران جەرگو دڵ بەرگەن　　گانێ پر ئەرگەنگانێ بێ بەرگەن

کرگ جە هێلمێ هێلی جەکرگەن　　ڕواس جەڕواس ودرگی جە ودرگەن

یانی درەخت و گیانداران ڕەگ و ڕیشە و جەرگ و دڵیان جار جارێك بێ بەرگن یانی بێ گەلاو بێ بەرو تووکن، مریشك لە هێکەو هێلکە لە مریشك، ڕێوی لە ڕێوی، گورگیش لە گورگ، لێرەدا مەبەست ئەوەیەکە درەخت و گژو گیا هەستی هەیە و ئەژی و وەك گیاندار بێت وایە کەگەلا ئەکات – ئەخوات – لە پاشدا گەلاکەی ئەومرێ. یاخود هەر کەسە ئەچێتەوە سەر ڕەگەزو بنەمای خۆی. هەر شتە وەك خۆی لە خۆی پەیدا ئەبێ. لێرەدا ئەومان بۆ دەر ئەکەوێ کە ئاگر پەرستە کۆنەکان هەمان ڕای فەیلەسوفە یونانیەکانیان هەبوە کە ئەڵێن مرۆڤ سەرەتای نیەو ناتوانرێ سەرەتای بۆدیاری بکرێ. هەرگیز کۆتاییشی نایە. خاوەنی ئەو کتێبەی باسمانکرد( پیر شەهریار ) ئەم پیاوە( مەجووسی ) – ئاگر پەرستی بووە. بابا گەورەی پیر شهریاری دووەمە کە موسوڵمان بووە. ئەم پیرشەهریاری دوەمە شەوێك لە خەویا چاوی بە پێغەمبەری ئیسلام( محمد د. خ ) ئەکەوێ و بانگی ئەکات – کوڕم -. ئەمیش بۆسبەینێ ناوی خۆی ئەگۆڕێ بە( مستەفا ) و ئەڵێت من( سەیدم ). ئەم پیاوە لەناو هەورامان – دا بە( سەید مستەفا ) ناودار بووە. ئەم پیر شەهریاری دوەمە هاوچەرخی( عبدالقادر گەیلانی ) بوە و پەیوەندی هەبووە لە نێوانیاندا. ساڵی( ٤٨٠ ) ی کۆچی پیرشهریاری دووەم کتێبی( معرفت ) ی گۆڕیوە و ئەو شتانەی لەگەڵ ئاینی ئیسلامدا ڕێ ئەکەوتوە ئەم لایبردوە. ئێستا نوسخەی دوەمی ئەم کتێبە لە هەوراماندا ماوە.( مەولانا گوشایش ) کە باسمانکرد کوڕی( بابا مەردۆخ ) و ئەویش بابا گەورەی شێخ( محمد مەردۆخی ) یە کە دانەری ئەم( مێژوو )ە یە. لە ساڵی( ٧٧٥ ) ی کۆچی دا هاتۆتە هەورامان و لە ساڵی( ٧٧٨ ) ی کۆچی کچی شێخ شەهابەدینی دزاوەری هێناوە و لە هەوراماندا جێ گیر بوە. ساڵی( ٨٤٢ ) ی کۆچی بە هاوکاری( شێخ شەهابەدین ) دەستی بە ڕاگەیاندنی قورئان و بڵاو کردنەوەی یاسای ئیسلام کردووە. بەڵام مەبەستی بە تەواوی نەهاتۆتە دی و لەدنیا دەرچووە و( مەولانا گوشایش )ی کوڕی جێگای

گرتۆتەوە. لەو ڕوونکردنەوەیەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە کورد( ئاری ) نەژادەو ئاگر پەرست لەگەڵ پارس و هەموو نەتەوەکانی تری ئاری هاو ڕەگەزن تەنها خاڵێك لێرەدا دەستی بۆ ڕاکێشین ئەوەیە بزانین ڕەگەزی کورد لە کوێدا کۆتایی دێت و ئەگاتە کێ ؟ ئایا کوردو ماد یەکن یا جیاوازن ئایا کورد دوانزە هەم فیرقەیە لەو( ١٢ ) فیرقە ئاری یە ؟ ئایا کورد لە مادە یا ماد لە کوردە. لە زۆربەی مێژووەکاندا ناوی کورد مورادیفی ناوی( ماد ) ە و هەردووکیان بە یەك مانا دێن. لەمێژوە کۆن و تازەکاندا لە تەنیشت ناوی ماد یا مادا وشەی( کوردستان ) لە نێوان دوو کەوانەدا نووسراوە کە مەبەست وشەی( ماد ) یا ) مادا ) یە. لە کتێبی( عشق و سلگنت ) کە بە شێوەی ڕۆمان نووسراوە لە هەموو شوێنێکدا ناوی ماد و کوردی پێکەوە هێناوە. لە کتێبی( کلێسای کۆن ) دا ل( ٣٦٨ ) وشەی( پارت و مەدی و عێلاّم ) هاتووە. کە بەم شێوەیە خۆی لێکی داوەتەوە پارتیا – خۆراسانی ئەمڕۆ، مەدی کوردستانی ئێستا. عیلاّم – خوزستان، ئەگەر وابێت ئەوا وشەی( کورد ) و( ماد ) مرادفی یەکن و بەیەك مانا دێن و لەیەك جیا ناکرێنەوە، بۆ وێنە ئەگەر ویستمان بلێین( دەوڵەتی ماد ) ئەوا بەبێ دوو دڵی ئەتوانین بلێین( دەوڵەتی کورد ) یا نەتەوی کوردە. هەندێك لە مێژوو ناسان و ڕۆژهەلاّت ناسەکان وەك پرۆفیسۆر( ساپس ) و دانەری کتێبی ئاینەی ئەسکەندەری ل ٣١ و منگق ل ١٥... هتد مادیان بە کورد داناوە. وەك _ دیالە ) بەشێك کورد( سەلمانازار)( فەرمانڕەوای ئاشوریەکان وشەی( مادا )ی بە بەشێك لە کورد ناو بردوە نەك هەموو کوردی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا. وشەی ماد لە حەوت هۆزی کوردا دیاری ئەدات. ئەمەش ئەوە ئەسەلمێنێ کە ماد بریتین لە هۆزێکی کورد و بوونەتە حەوت لق، بەلاّم بەڕای مێژوو ناسە کوردەکان کورد بەشێکن لە ماد یانی کۆمەڵی کورد بەشێکن

لە نەتەوەی ماد. ئەڵێن بنەڕەتی کورد بە وشەی( کوردە ) یا( کوردۆ ) کۆتایی دێت. زۆربەی مێژوو ناسانی یونانی و فەرەنسی وشەی( کورد یا کاردۆ یا کارداك ) یا کاردۆکیان بەکار هێناوە، لە مێژووی هەورامان ل( ١٦ ) دا نووسراوە( کورد و دیلاّم - دیلم و گیل و خەزەر و نبط و گرموك - جرماف - جرامقە ) ئەمانە هەموو کوڕی( یابت کوڕی نوح ) ن لە تەورات دا بەشی دەیەم و لە زۆربەی مێژووەکان ئەم وتەیە دوبارە بۆتەوە. بەپێ ی ئەم ڕایە کۆمەڵی کورد بەشێکن لە نەتەوەی ماد یانی( کورد لە ماد ) ە دەوڵەتی کوردی کەیقوباد کە دەوڵەتی مادیان پێ وتووە پێك هاتووە لە هۆزەکانی ماد - کورد، لوڕ، گێل،

خەزەر، دەیلەم – ئەمانە بە هەموویان دەوڵەتی کەیقوبادی کوردیان پێك هێناوە و بە تایبەتی دەوڵەتی کورد نەبووە. بەڵام دەوڵەتی " گوتی، کاسی، لۆلۆ، میتانی، زەندیە، ئەخشیدیە، حەسنەویە، دیالە، لوڕی بچووك، ئال خورشید "، وتراوە دەوڵەتی کورد یان بە دەوڵەتی کورد ناو براون( هۆزەکانی دیکەی ماد زۆر بەشدار نەبوون لە پێك هێنانی ئەو دەوڵەتەدا ). لەبەر ئەوەی دامەزرێنەری دەوڵەتەکان کورد بوون نەك مادەکان. لێرەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە وشەی( مامد ) لە وشەی کورد بلاَوترە بە( کورد و دیلەم و خەزەر ) و.. هتد، ئەوترێ ماد. دیسانەوە جێگەی گومان نی یە لە قسەکانی هێرۆدۆت ی یونانی دا کە ئەڵیت "( کۆمەڵێك لە کوردەکان خۆیان ناو ناوە ماد ) وە ئەم ناوەیان بە هەر چۆنێك بێت گومان نامێنێت کە وشەی ماد زۆر گەورە ترو بلاَو ترە لە وشەی کورد یانی وشەی کورد لە ماد پێك هاتووە. بە کوردو هەموو ئەوەکانی( ماد ا ) ئەوترێ( ماد ). بەڵام وتەکەی هێرۆدۆت کە ئەڵی بەشێك لە کوردەکانی رۆژهەلاَت خۆیان ناو ناوە( ماد ). لێرەدا ئەبێت بڵێین کە وشەی( کورد ) زۆر لە وشەی( ماد ) بلاَوترە. یانی بە پێچەوانەی راکەی پێشوومانەوە. هەرچەندە بە بەشی رۆژهەلاَت ئەوترێ( مادستان ) یانی ولاَتی مادەکان. بە بەشی ئارارات و زاگرۆس ئەوترێ( کوردستان ). لێرەدا جیاوازی هەیە لە نێوان مێژوو نووسەکاندا لەسەر ئەم باسە، کە ئایا کورد لە مادە یا ماد لە کوردە ؟ جێ ی گومان نی یە کە وشەی ماد بە هەموو ئەوەکانی( مادای کوڕی یاپێت کوڕی نوح ) ئەوترێ. ئەو بەڵگانەی کە بە خەتی بزماری نووسراوون یاخود ئەو دەست نووس و شوێنەوارە مێژووییانەی لە کوردستان دۆزراونەتەوە وشەی( کوردراکان ) بەکار هاتووە کە بە مانای( کوردەکان ) دێت.( ئەسترابۆن )ی جوگرافیازانی یونانی ساڵی( ٦٠ ) پ ز ئەخشەیەکی کێشاوە لە سەر ئەخشەکە وشەی( کلادەکی ) داناوە( کارداك ). لە سەرەتای مێژووەوە لە چیاکانی سوریا جێ گیر بوون بە( گوتو ) بە ناو بانگ بوون. گۆتۆ بە واتای پاڵەوان، ئازا، شەڕانی دێت. بەم هەمان شێوە وەرگێڕانی وشەی گۆتۆ بۆ سەر زمانی ئاشووری " کاردۆ یا کارداك یا کۆردۆ " یە کە هەمان مەبەستی پێشوو ئەگرێتەوە. ئەگەر ئەو مەبەستە ڕاست بێت لەوانەیە لەبەر ئازایی و شەڕکەری پێ یان و تێ( کارد ) چونکە کارد لە زۆر شوێنی کوردەواری بەمانای چەقۆیەکی گەورەی بڕەو بەکار دێت. لەهەر شوێنێکدا وشەی( کورد ) بە فارس و وشەی( کورد ) بە عەرەبی هاتبێ. هیچ جیاوازی نی یە و هەردووکیان بە مانای

پاڵەوان دێن. کەڵهوڕەکانیش خۆیان بە نەوەی گودەرز نەزانن بر سەلماندنی ئەم قسەیەشیان ئەڵێن وشەی گۆدەرز لە وشەی( گۆتۆ ) یا( کۆدۆ )ە هاتوە وەك لە هۆزە کوردەکاندا باسمانکرد. لە مێژووی هەورامانی کۆنیشدا( گۆتۆ ) یا( ژۆتۆ ) یا( کۆدۆ ) وە یاخود( گودی ) نووسراوە،کە لە چیا جودی ژیابون بەم ناوەوە ناو براون . ئەم هۆزە کوردەکانن کۆتاییان بە دەسەلاتداریەتی ئەرامسین کوڕی سەرگۆنی یەکەم هێناوە. لە( حکایه الجغرافی ل ٦٠ ) نووسراوە کورد لە ڕەگەزی( کاردۆك ) لە سەر سەردەمی کۆن دا ئەم کاردۆکان لە چیاکانی جزیرە و ئەرمینیا و سەرووی ولاتی ئاشوور دانیشتوون. گەزنەفونی یونانی ئەڵێت – ئەوەکانی( کاردۆشیا = کورد لەکاتی گەڕانەوەی دە هەزار یونانی دا ڕێگایان پێ ئەگرن زۆر ئازایانە شەڕیان کردوە. ناوچەی( وان بەتلیس ) بە( کاردۆکیان ) ناودار بووە. لەبەر ئەوەی دانیشتوانی بەشێك بوون لە نەوەی کاردۆك. لە کۆتاییدا ئەتوانین بلێین ئەتەوەی کورد لە مادەکان بن. یاخود مودەکان بەشێك بن لە هۆزەکانی ڕۆژهەلات کە لەم دواییەدا لە سەدەی پێنك هاتنی دەولەتی( کیانی ) دا خۆیان ناو نابێ( ماد ) یاخود بە هۆی ئازایەتی و پاڵەوانییەوە ناو نراون کورد. بەهەر شێوەیەك بێت ئەم ئەتەوەیە بەشێکن لەڕەگەزی( ئاری ) و زیاتر لە پێنج هەزار ساڵ پ ز لە شوێنی ئێستایاندا بوون. بەو پەڕی ئازایەتی و لێ هاتووییەوە ژیاون و پەرەیان سەندوە ئەیان هێشتوە کەس سەرداریان بێت. هەندێ لە زانا ڕەگەز ناسەکان کورد بە نەوەی( کوردی کوڕی عومەری کوڕی مەزیقیاو ) پاشای یەمەن دائەنێن " کوردی عومەری مەزیقیاع کوڕی عامر ماع السماو – حارپ – امرئ القیس – ثعلبه - مازن – الاسد – غوپ – یفت – مالك – زمید – کهلان – سەبا – یشجب – یعب – قحگان – عابد – شالغ – فخشد، سام کوڕی نوح ". بە پێ ی ئەم وتەیە ئەبێت کورد لە عەرەب بێت ئانی ئەوەی سامی کوڕی نوح بن فەرمانڕەوایی یەمەن عومەری کوری مەزیقیاو لە یەمەنەوە ئاردونیە شام و کوڕی عومەری کوڕی مزیقیئو ناو نراون. ئەم هۆنراوەی خوارەوەش بەڵگەیە بۆ وتەکەیان : –

لعمرك ما لالکراد ابناو فارس و لکنهم کرد عمر ابن عامر

عبدالله ی کوڕی عومەر وتویەتی : یەکێك لە عەرەبەکانی ولاتی فارس ئیشارەتی کردوە کە( ئیبراهیم خلیل – بسووتێنن ). یەکێك لە مەجلیسەکەدا و تویە بۆچی ولاتی

فارس عەرەبی هەیە ؟ لە وەلامدا ئەلیٚ : بەلیٚ کورد لە عەرەبەکانی ولاتی فارسن[91]. ( تیٚ بینی، ئەم رایە پیٚچەوانەی رایٚ پیٚشووە چونکە عومەری مەزیقیاو گەلیٚ لەدوای سەردەمی ئیبراهیم خلیل - ە وە بووە ) وەرگیٚر

هەندیٚکی تر رایان وایە کە کورد لە نەوەی عومەرمزیقیاو ئن عومەریش بە کوڕی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم خەلیل دائەنیٚن. هەندیٚکی تر ئەلیٚن - کورد کوڕی ئیٚران کوڕی ئاشور کوڕی سام کوڕی نوح ە [92]"(لە تەوراتدا بەهیچ شیٚوەیەك باسی کوردو ئیٚران ئەبراوەتەوە سەر ئاشوور بەلکو وشەی کورد و ئیٚران لە تەوراتا نیە ( وەرگیٚر ). لە بری( کورد ) و( مادا ) وشەکانی( ئیٚران ) و( پارس ) هاتووە. لە کاتیٚکدا ئیٚران لەو سەردەمەدا بریتی بووە لە( مادو پارس ) و ناوی ئیٚران هەر نەبووە. پاش دەسەلاتداریەتی کورشی گەورە وشەی ئیٚران پەیدا بووە جگە لە( شیٚوەو قیافە و خو ڕەشت و ئاین و زمان و لەهجە ) بە پیٚ ی شوٚینەواری میٚژوویی و زانستی کورد لە نەژادی( ئاری ) یە. لە نیٚوان نەتەوەکانی ئاری دا کوردو پارس زوٚر لەیەك نزیك بوون و وەك دوو لقی یەك درەخت بوون، بە پیٚ ی ئەم خشتەیەی دروستمان کردوە کە بوٚ زیاتر شارەزا بوونە لە ڕاستی. بوٚمان دەرئەکەویٚ کە کورد لە ڕەگەزو زمانی فارسیەوە نزیکەو لە ئاری یەکان( گر بقاهر سایە عین نورنیست نور چندان دور نیشت لیٚرەدا بوٚمان دەرئەکەویٚ ئەو وشەو پیتانەی کورد و فارس بەکاری ئەهیٚنن زوٚر لە یەکەوە نزیکن، بەلام لەگەلٚ عەرەبی و تورکیدا جیاوازیەکی گەورە پەدی ئەکریٚ تەنانەت لە ڕووی زمانەوانیشەوە وەك پاش و پیٚش خستنی کردار و ناوەلناو. بوٚ

| وێنە کوردی | فارسی | عەرەبی |
| --- | --- | --- |

---

[91] میٚژووی کامل ابن اپیر ل ٣٤. ابو عمری کوڕی عبدالله لە کتیٚبی قصدالأمم فی انساب العرب و العجم - و فەیروز ئابادی لە کتیٚبی( قاموس )و( ابو الفچل شهاب الدین سید محمود ئالوسی بغدادی لە( روح المعانی ) دا تفسیر لە پەراویٚزی ئایەتی( ستدعون الی قوم اولی باس شدید ) وقازی ابن خلکان لە تەرجمەی( ملهب بن ابی صفر ) و سویدی بغدادی لە کتیٚبی( سبائك الزهب فی معرفە قبائل العرب ) ومەسعودی لە مروج الزهب و لە تەفسیری( سیل الترم ) دا. ئەو سەرچاوانە بەگشتی رایان وایە کە کورد نەوەی( عومەر مزیقیاو )ن و نەلیٚن هوٚزی ئەوس و خەزرەج یش لە کوردەکانن و لە نەوەی عومەر مزیقیاو - ن

[92] سبائك لاذهب - ل ١١.

زمیلد عومەری کوشت          زید عمر ازد          چرب زید عمر

ئەگەر سەیری فەرهەنگەکەی مەردۆخ بکەین بۆمان دەرئەکەوێ پەیوەندیەکی توندو تۆڵ لە نێوان کوردی و فارس دا هەیە. هەروەها لەگەڵ زمانەکانی دیکەی رۆژهەلاتی ناوەراست. لەو روونکردنەوەی سەرەوەدا سێ خاڵی سەرەکیمان بۆ روون ئەبێتەوە کە هیچ گومان و دوو دڵیمان ئامێنێ ١- کورد لە نەوەی( ئاری ) یە و لەگەڵ پارس دا لە رەگەزێکن و لە رەگەزەکانی دیکە جیاوازن. ٢- نەتەوەی کورد چەندین هەزار ساڵە لە کوردستاندا ئەژی داب و نەریت و خوو

رەوشت و هەڵس و کەوتی خۆی پاراستوە لە نەتەوەکانی دراوسێ وەك( ئاشور، کلدان، عیلام ) و لە سەر داب و نەریتی کوردەواری خۆی ماوەتەوە تاکو ئێستاش. بەو پەری ئازایەتی و لێ هاتووییەوە هێرش و پەلاماری دراوسێ بێگانەکانی بەر پەرچ داوەتەوە.

لە سەدەی( ٢٧ ) پ ز کوردە(گوتیەکان ) لەگەڵ نەرامسینی کوری سارگۆن بەشەرهاتوون و تێکیان شکاندوون کورد زیاتر لە دوو سەدە فەرنابرەوای کلدانیەکان بووە.

سەدەی هەژدەهەم یانی( ١٨٠٠ ) پ ز کوردەکان لەگەڵ جێ نشینەکانی( حامورابی بابلی ) دا جەنگیون و بەسەریاندا زاڵ بوون و تێکەڵیان بوون. ئەم تێکەڵ بوون وزاڵ بوونە بۆتە هۆی توانەوەی کلدانیەکان[94]. دیسانەوە لە سەدەکانی نۆهەم و هەشتەمی پ ز فەرمانرەوایانی ئاشوور لەسەر یەك چەندین هێرشیان کردۆتە سەر وڵاتی کورد، کوردیش بەو پەری ئازایی و لەخۆ بووردووییەوە بەر پەرچی هێرشکانی داونەتەوە. ساڵی( ٧٤٤ ) پ ز کوردو ئاشور دەستیان دایەوە یەك شەرێکی سەخت و خۆێناوی روویدا، هەردوولا قوربانیەکی زۆریدا و پاشەکشەیان کرد بێ ئەوەی بگەنە ئەنجام. دیسانەوە ساڵی( ٣٣٧ )پ ز کوردەکان هێرشیان کردۆتە سەر ئاشوریەکان بەلام بەهۆی یەك نەبوون و جیاوازیەوە هێرشەکەیان سەری نەگرت پەرش و بلاو بوونەوە.( مادی بچووك ) ئازەربایجان و کوردەکانی لورستان و عیراقی عەجەم( مادی گەورە ) یەکیان گرت هاوپەیمان لەگەڵ فەرمانرەوانیا بابل هێرشیان کردە سەر ئەینەواو تەخت و بەختی ئاشووریان بۆ هەمیشەیی لەناو برد.

---

[94] ملل قدیمە مشرق وەرگێرانی فەروخی ل ١٢٥

کاتێ ئەسکەندەری ڕۆمی هات و ئێرانی داگیر کردو بەسەریاندا سەرکەوت، کوردەکانیش هاوبەشی ژێر دەستەیی بون بەڵام شێوەیەکی ڕاستەوخۆ( ڕۆمەکان ) نەیانتوانیوە دەست بەسەر کوردەکانا بگرن. سەرداران و ئەمیرەکانی کورد تا ڕادەیەك توانیویانە دەسەڵات و سنووری خۆیان بپارێزن.

٣- کورد و ماد جیاوازنین /" - ڕای چەندین مێژوو نووسان ڕوونیان کردەوە کە وشەی کورد یا ماد لە یەك جیانین و هەردووکیان بەیەك واتا دێن. یاکورد لە مادە یانی مادا کە( کورد، دیلەم، گیل، ئبگ خەزەر، گەرموك ) ئەوەی مادابن یاخود ماد لە ئەوەی کورد بێت. لە کتێبی( عشق و سلگنت )دا نووسراوە( زمانی مادەکان زمانی کوردی بووە ). ئەمەش ڕای زۆربەی ڕۆژهەڵات ناسەکان( ابن خلدون ) و وزۆربەی مێژوو ناسە کوردەکان ئەڵێن پارسەکانیش کوڕی( مادا ) ن بەم شێوەیەدەبنە برای کورد ئەگەر کوڕی( کیومەرس ) بن ئەوا ئەبنە برازای ماداو ئامۆزای کورد. چەند مێژوو نووسێك ئەڵێن " پارس، خەزەر، سەقلاب سدسان، خلغال، غز، تورك، چین، بلقاری،بەرتاس " ئەمانە هەموو کوڕی یابپ کوڕی نوحن. ئەگەر وابێت پارس و ماداو گیو مەرس بران ئەوا ئەبنە مامەی کورد. ئەم ڕایە جێ ی بڕوا نی یە، بەڵام ڕاکەی دیکە زۆر نزیکە لە ڕاستی یەوە. کە پارس لە ئەوەی( گیومەرس ) ن کە عەرەب( عامر )ی پێ ئەڵێن. هەرچۆنێك بێت دیارە لەونە گەیشتووین کەنەتەوەی کوردو پارس هەردووکیانڕەگەزی( ئاری )ن. هیچ بەڵگەیەکی زانستی نی یە کە کورد سامی بێت و دوورە لە ڕاستی بۆ زیاتر ڕاست بوونی باسەکەمان سەیری ئەم سەر چاوانە بکە : - ١- ئینسکلوپیدیای ئینگلیزی ٢- مێژووی ئاوداران لە نووسینی شێخ سلگان ممدوح ٣- دائرە معارف الالمان ٤- دائرە معارف الفرنسی الکبیر ٥- ئەتەوە ئادیارەکان لە نووسینی( جیا مل ) ٦- مێژووی ١٩٠٠ )ی میلادی لە نووسینی( ژۆرف گرنیك ) لە شۆینگای کورد ٧- مێژووی( ١٨٦٦ ) میلادی ٨- جاماسنامە لە نووسینی پیر ساماسگ هەورامی باوکی پیر شالیاری یەکەم ٩- مێژووی کۆنی هەورامان لە نووسینی مەلا شەریفی یەکەم کوڕی مەسەعدی قاری.

## بەندی دووەم

### ولاَتی ماد : -

وەك باسمانكرد ماد بریتی یە لە دانزهەمم كۆمەڵی نەژادی ئاری كە بەرمو ناوچەی رەی ئازەربایجان هاتوون و لەوێدا جێ گیر بوون شوێنەكەیان پێ ی ئەوترێ مادستان یانی ولاَتی ماد. لە بارەی نووسینی شێوەی( ماد ) وە لە چەند سەرچاوەیەكی كۆندا هەریەكە و بە جیاواز نووسیویەتی. لە بەردە نووسراوەكانی سەردەمی داریوش دا وشەی( مادا ) یا( مادی ) هاتووە. یۆنانیەكان( ئاهی ) یان نووسیوە موسا خورنی( مدی ) ی نووسیوە. ئەستراپون ( مدیا )ی نووسیوە .سەلمانازاری دومم لە ناوەڕاستی سەدەی نۆهەمی پ ز( ئامادا ) ی نووسیوە. هێرۆدۆتی یونانی( مدر ) ی نووسیوە. لە ئاوێستا دا( رەگە ) یانی( رەی ) نووسراوە. هەر شێوەو شێوازێكی دانرابێت بۆ ئەم وشە، گرنگ ئەوەیە مەبەست لە( مادا ) ی تەورات و كتێبە كۆنەكانە. هێرۆدۆت ئەڵێ : مادەكان لە كۆندا ناویان( ئاریان ) بووە. لە پاشدا خۆیان ناو ناوە( ماد ).( مسیو برسی فەیروز ) ی مێژوو نووسی كلدانی ئەڵێ لە سەدەیەكی كۆنی پێش زایین مادەكان ولاَتی بابلستان داگیر كردوە و ماوەی( ٢٢٤ ) ساڵ تیا فەرمانڕەوای بوون.

### " سنووری ولاَتی ماد "

بە پێ ی دیاری كردنەكەی نجح الدولە لە كتێبی( كفایە الجغرافی ) سنووری ولاَتی ماد بەم شێوەیە : -١- لای ژوورو دەریای خەزەر – ٢- لای رۆژئاوا ولاَتی ئەرمەن( ئەرمەنستان ) – ٣- لای خواروو ولاَتی فارس و سوریان – خورستان – ٤- لای رۆژهەلاَت ئاری – ئەفغانستان لە كۆندا بە ئاریان ناوبراون.

دیسانەوە نجم الدولە ئەڵێت( ئاكیاتان ) پایتەختی مادەكان بووە لە سەرەتادا بریتی بوە لە قەلایەك كە( دژۆزس ) – توس لە ساڵی( ١٢٨٠ ) پ ئیسلام دروستی كر دومو

ورده ورده فەرمانڕەوایانی پارس گوێ یان داوەتێ تا بۆتە ئەم هەمەدان[95] – بەڵام( هیرۆدۆت ) و فیردەوسی ) بەم شێوەیە سنووری وڵاتی مادیان داناوە :

لە رۆژهەڵاتەوە ڕوباری جەیحون کە ڕوباری( ئەمەویە ) شیان پی وتوە. لە سنووری تورکستانەوە تێپەڕ ئەکات و ئەڕژێتە دەریای ئۆراڵ لە کۆندا ڕژاوەتە دەریای خەزەرەوە.

لە ڕۆژئاواوە ڕوباری( هالیس ) کە لە سنووری ئاسیای بچووکەوە تێ ئەپەڕێ وئەڕژێتە دەریای ڕەشەوە، لە کۆندا بە ڕوباری( قزل ئیرماق ) – هالیس – ناودار بوە. لای ژوورەوە گۆمی خەزەرو ڕوباری ئاراس و چیاکانی ئارارات تا ئەگاتە دەریای ڕەش لای خواروو سنووری وڵاتی پارس و خوزستان. بە پێ ی ئەم دیاری کردنە کوردستان لە بەشی وڵاتی( ماد ) دانراوە. هەندێکی تر سنووری وڵاتی مادیان بەم شێوەیە داناوە لای ژووروو ئەرمەنستان و گۆمی خەزەر و تورکستان. لای خوارو پارس و عیلام( خوزستانی ئێستا ) و عیراقی عەرەب – لای ڕۆژ ئاوا ڕوباری هالیس( قزل ئیرماق ) یانی سنووری دەوڵەتی ( لیدی ) لە ئاسیای بچووك و سنووری بابل. لای ڕۆژ هەڵات سنووری ئەفغانستان. لەم دیاری کردنەدا کوردستان بەشێکی وڵاتی( ماد )ە. ئەگەر ویستمان کوردستان لە وڵاتی ماد بپچڕین سنووری ماد بەم شێوەیەی لێ دێت.

لای ڕۆژئاوا ئەرمەنستان و کوردستان، لای خواروو خوزستان و پارس. لای ڕۆژهەڵاتەوە ئەفغەنستان. لای ژوورو تورکستان و گۆمی خەزەر و چیاکانی ئارارات. ئەوەی باسمانکرد بریتی بوو لە سنووری وڵاتی ماد ئەمەش ئەکرێت بە دوو بەشەوە

١- مادی گەورە( بریتی یەلە عیراقی عەجەم ) یانی کرماشان هەمەدان، قەزوین، رەی،

عیراق، ئەهاوەند، ئەصفەهان.... هتد، کە لوڕستان و مازەندەران و خۆراسانیش سەر بەم بەشەن. ٢- مادی بچووك – بریتی یە لە ڕوبەری خاکی( ئازەربایجان ) مەڵبەندی فەرمانڕەوایانی ماد شاری( ئەیسەفون ) بووە. کە( ٢٥ ) فرسەخ خواروی شاری بەغدا کەوتوە. یانی ڕۆژهەڵاتی دیجلە. ئەو سەردەمە بە( مادیان ) ناودار بووە لە پاشدا وردە

---

[95] مێژووی کۆچی تا میلادی( ٦٢٢ ) ساڵە ئەو ژمارەیە لە( ١٢٨٠ ) دەربکەین( ٦٥٨ )ی ئەمێنێتەوە یانی( ٦٥٨ )پ ز. توس( ٧٠٧ ) پ ز فەرمانڕەوایی وەرگرت یانی پەنجا ساڵێك بەسەر فرمانڕەوایی تووس دا تێپەڕ ئەکات.

ورده گۆڕاوه و بۆته( مەدائن ). پاش ئەوەی کەیقوباد دەوڵەتی مادی پێك هێنا پایتەختی لە( مادیان ) ە وە گواستەوە شاری( ئاگباتان ) – هەمەدان – کە( شاری سەوز ) یا( سەوزە شار ) یشیان پێ و توە. تا هاتنی( ئەژدەهاك بابا گەورەی دایکی کورشی گەورە ئەم شارە پایتەختی ماد بووە. لە سەردەمی کورشی گەورەیشدا هەمەدان سەردەمێك بە پایتەختی ماد مایەوە لە پاشدا گوێزرایەوە شاری( ئەحمتا ) یانی ئەصفەهانی ئێستا. لەو کاتەدا کورش فەرمانی تازەکردنەوەی( بیت المقدس ) ی دا وەك لەکتێبێکدا لە هەمەدان ئەم هەواڵە لەم دواییەدا دۆزراوەتەوە هەروەها لە( تەورات ) کتێبی( عەزرا ) عوزەیر فەسلی شەشەمدا بۆمان دەرئەکەوێ کە فەرمانڕەوایی کورشی مادی بووە نەك هاخامەنشینی وەك لە دواییدا باسی ئەکەین. پایتەختی مادی بچووکیشی( ورمیە ) بووە کە زادگای پێغەمبەری کورد زەردەشت بووە.( شەمسی ئاداد )ی چوارەم فەرمانڕەوای ئاشورەکان ساڵی( ٨٢٤ ) پ ز تا ساڵی( ٨١٢ ) پ ز وڵاتی مادی بەیەکێك لەو وڵاتانە ناو بردوە کە باج دەری ئاشوورەکان بوون. تەگلات پالازاری دوەم فەرمانڕەوای ساڵی( ٧٤٤ ) پ ز لەگەڵ مادەکان بەشەڕ هاتوە و خستونیەتی یە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. لەبەشی( ١٧، ١٨ )ی کتێبی ملوك دا بۆمان دەرئەکەوێ کە بەشێك لە وڵاتی ماد لە ژێر دەسەڵاتی سەلمانازارا بوە. بەشی سەرووی وڵاتی فارس[96] سەر بەوڵاتی ئاشوور بووە. لە پاشدا سەر بەخۆی بە دەست هێناوە و دەوڵەتی مادیان پێك هێناوە. دوای ئەوە دەوڵەتی( ماد و پارس ) لەژێر دەسەڵاتی کورشدا و بە ئازادی ژیاوە تا هاتنی ئەسکەندەری یونانی بۆ خاکی ئێران[97]. مێژوو نووسەکان هەندێ ڕای جیاوازیان هەیە لەسەر دیلیەتی ماد.

هێرۆدۆت ئەڵێ مادەکان ماوەی( ٥ ) سەدە یانی( ٥٠٠ ) ساڵ بەدیلیەتی ژیاون. بەڵام سەرچاوە ئاشوریەکان بە دوو سەدە یانی دوو سەد ساڵ ناوی ئەبەن. تا لە ئەنجامدا ساڵی( ٦٠٦ ) پ ز بۆ هەمیشەیی کۆتایی بە دەوڵەتی ئاشووری خاوەن دەسەڵات ئەهێنن و سەرنگوونی ئەکەن.

---

[96] بەشی سەرووی وڵاتی فارس مەبەست لە وڵاتی مادە

[97] کتێبی – نخبه الازهریه - ل( ٥٠٢ ).

## بەندی سێ یەم –

دەربارەی پێك هاتنی دەوڵەتی ماد : - هەر لە سەرەتای دروست بوونی مێژووەوە تاوەکو پێك هاتنی دەوڵەتی ماد( کوردو ماد ) یانی ئاراراتی و رۆژهەلاتی سەرووکاری تایبەتیان چ لە ڕووی دۆستایەتی و چ شەڕو و شۆڕەوە هەبووە، لەگەڵ دەوڵەتە کانی( کلدانی، ئاشووری، عیلام ) لەبەر ئەوە پێویستە هەندێ لە هەڵس و کەوتی ئەم سێ دەوڵەتە شارەزا بین ئەوسا بێینە سەر پێکهاتنی دەوڵەتی ماد.

## سەرنجێکی گشتی لە هەر سێ دەوڵەتی

## کلدان – ئاشوور – عیلام

لەو پاشماوە دێرینانەی شاری( بەغداد و کەناری عەرەبی ی دۆزراونەوە) ڕوون بۆتەوە کە( ٥ ) هەزار ساڵ پێش زایین یانی( ٧ ) هەزار ساڵ پێش نووسینی ئەم کتێبە دەشتێکی پان و بەرین کە دوو ڕووباری دیجلە و فوراتی تیا بەیەك ئەگەن و( شط العرب) دروست ئەکەن. بە دەشتی( شەنعار) بە ناوبانگ بوون. ئیستا بەو ناوچەیە ئەوترێ عیراقی عەرەب( سفر تکوین تورات فەسلی دەیەم). لەو سەردەمەوە کە بە سەردەمی سەرەتای مێژوو ئەژمێررێ لەو ناوچەیەدا دوو نەتەوەی( شومێر – سۆماری و ئەکەد – ئەژیان کە هەردووکیان سەربەخۆ جیاواز بوون. خاوەنی خەت و نووسین وپێشکەوتن بوون لە بەکار هێنانی کانزاو ئاڵتون و دروست کردنی کۆشك و تەلارو ئەخش و نیگارو کشتوکاڵ شارەزا بوون. ئەم دوو نەتەوەیە هەر چەند لە وڵاتی شوومێردا جێ گیر بوون یانی خواروی وڵاتی بابل. وەخەتی بزماری لە یادگارە شاکارە دێرینەکانی ئەو کۆمەڵەیە. ئەوانەی لە ژووروی وڵاتی بابل دا دانیشتبون پێ یان وتراوە( ئەکاد) یا وڵاتی( ئەکەد) هەموو وڵاتەکە یانی شوومێرو ئەکەد لە مێژوودا زۆر لە کلدانیەکان کۆنتر باس کراون. کلدانیەکان ئەوەی( سامی)ن و مێژوویان نوێ یە و لە دەورو بەری سەدەی نۆهەمی "پ ز".ەوە دەست پێ ئەکات بەلام مێژووی( شوومێرو ئەکاد) ەکان پتر لە چەند هەزار ساڵ پ ز ەوە دەست پێ ئەکات. هەر بەم بۆنەیەوە ناتوانین مێژووی( کەلدە) بە مێژووی شومێرو ئەکاد دابنێنین. وشەی کلدانی و بابل لە سەدەی نۆهەمی پ ز لە ناو ئاشووریەکاندا سەری هەڵدا. لە نێوان زاناو لێکۆڵەرەوەکاندا جیاوازی هەیە دەربارەی ئەوەی کام یەك( شۆمێرو ئەکاد) لە ناوچەی( شەنعار) دا بەر لەوی کەیان جێ گیر بووە. لەم دواییەدا ڕوون بوەوە پێش هاتنی ئەوەی سام بۆ ئەم ناوچەیە شۆمێرەکان لە ناوچەی کەنداوی عەرەبی دا ژیاوون[٩٨]. تا ساڵی( ١٨٤٢) زهیچ شتێ دەربارەی شۆمێرو ئەکاد ڕوون

---

[٩٨] ڕای میستر کینگ و حەسەنی پیرنیا لە لاپەڕە( ٥٤ )دا کە لەسەرچاوە کەدا بە( خلیج فارس) ناوی بردوە.

نەبوموە بەلاّم لەم دواییەدا وردە وردە لە پاشماوە دۆزراوەکانی( بابل و عیلاّم ) ە وە زانیاری دەستکەوت. ولاّتی شۆمێر بریتی بوە لە ویلایەتی( نور، نەریدۆ، ئارۆخ، لارسام، لاگاش ) و ئەو شوێنانەی سەر بەوان لە نزیکی کەنداوی عەرەب دا. ولاّتی ئەکاد بریتی بووە لە ویلایەتی( نەیپوور، سیپار. ئەگادە - بابیلو( بابل ) کە پایتەختی ولاّتی ئەکاد بووە وە ئەوانەی سەر بەوان بوون لە( زابولستان )دا. ئەم دوو کۆمەڵە هەمیشە لە هەڵچوون ودا چووندا بوون دژی یەکتر لە ژێر چاودێری و فەرمانڕەوایی سەرۆکی پەرستگاکان دا( پاتسی یان، ناوبردوون، ژیاون، هەر یەکێ لەم( پاتسی ) یانە خۆیان بە خاوەنی هەردوو نەتەوەی شومێرو و ئەکاد زانیوە.کۆنترین فەرمانڕەواییان فەرمانڕەوایی ( ئوور ) بووە کە ناوی ( نورنا ) بووە فەرمانڕەوایی ئەکادەکانیشی کردوەو خستوونیە ژێر دەسەلاّتی خۆیەوە.

هەر بەم بۆنەیەوە( ئوورنا ) یان بە پادشای شوومێرو ئەکاد ناوبردوە. وەك لە پاشماوە دێرینەکاندا دەرکەوتوە لەو سەردەمەدا چەند هۆزێکی ڕەسەنی کورد دوەك( لۆلۆ )، گوتی، کاسی، هۆری – سووباری[99] واتە کوردەکانی کۆمەڵی مەزنی زاگرۆز لە سەرومی رۆژهەلاّتی ولاّتی شوومێرو ئەکادا ژیاون کە بریتی یە لە کوردستانی ئەمڕۆ لە خوارووی رۆژهەلاّتیشدا کپمەڵەی عیلاّمەکان بوون. هەرچەندە عیلاّمەکان لە کۆمەڵەی زاگرۆزن بەلاّم لەبەر ئەوەی تا ئێستا ڕوون نەبۆتەوە کە پەیوەندایەتیان بووبێت لەگەڵ نەژادی کوردا ئێمە ناتوانین پێ یان بلێین کوردن. شومێرو ئەکاد چەند جار بە هاوبەشی و گەلێ جاریش بە تەنها لەگەڵ عیلاّمەکاندا بەشەڕ هاتوون تا لە کۆتاییدا ساڵی( ٢١٤٠ ) پ ز هەردووکیان یەکیان گرت و دوەڵەتی( کلدە )یان پیك هێنا یانی دەوڵەتی( بابل ) کە ناوی هەموو شارو دێهاتەکانی شوومێرو ئەکاد بەناوی( کلدە ) وە. ناو براوە. هەر شارێك خاوەنی خواوەندی تایبەتی خۆی بووە بۆ پەرستن، پەرستگایان بۆ دروست کردوە. کە – کاهن – رئسی –

---

[99] ناوی سووباری بۆ یەکەمجار لە تابلۆیەکی سەردەمی حکوومەتی( لوگەل ئانی مۆنرۆ ) لەسەدی( ٣٠ ) پ ز بە( سوبینز نووسراوە. لە پاشماوەکانی( ئەرامسین ) وشەی سووبارتیە هاتووە

فەرمانداری شارەکە بووە. هەرکاتێ( پاتسی ) یەکان یاخود فەرماندارە ئاینیەکان لەژێر دەسەلاتی دەولەتدا بوونایە فەرمانڕەوایان ئەووت( شاهەنشا ) یانی فەرمانڕەوای هەموو فەرماندارەکان( پاشای پاشایان ). فەرمانڕەوایی( کلدە ) زیاتر لە( ٢ ) هەزار ساڵ بەو پەڕی ئازایی و لێ هاتووییەوە فەرمانڕەواییان کردوە لەو ماوەیەدا سێ جار بەسەر بێگانەدا سەرکەوتوون. یەکەمجار لەسەدەی بیست و شەشەمدا یانی( ٢٦٠٠ ) پ ز بەسەر کوردەکاندا( گوتی ) یەکاندا سەرکەوتوون. دوەم جار لە سەدەی بیست و دوودا یانی( ٢٢٠٠ ) پ ز بەسەر عیلامەکاندا سەرکەوتوون( سەردەمی فەرمانڕەوایی( کودوز ئاخونتای یەکەم ). سێ یەم جار لە ناوەراستی سەدەی هەژدەهەمدا یانی ساڵی( ١٧٦٠ ) پ ز دیسانەو بەسەر هوزە کوردەکاندا زاڵ بوونەوە. بەناوبانگترین فەرمانڕەوایی گرتۆتە دەست و شاری( ئەگادە ) پایتەختی بووە. یانی( ٥ ) سەدە پێش کیومەرس یەکەم فەرمانڕەوای زنجیرەی پێشدادی کە زەردەشتیەکان بە( ئادەم ) باوکی مروڤ ناوی ئەبەن.

• سارگون( فەرمانڕەوایەکی ) زۆر بەدەسەلات و ناودار بووە. توانیویەتی ولاتی شۆمێر بخاتەوە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە. توانیویەتی دەولەتی( کلدە ) بگەیێنێتە ئەوپەڕی شکۆو دەسەلات. چەند جارێک بەسەر عیلامەکاندا سەرکەوتوو توانیویەتی ولاتی سووریاو نیمچە دوورگەی سینا داگیر بکات. هەروەها فەرمانی داوە هەموو نووسینێک دەربارەی ولات ئایین و جادو خوو ڕەوشت ئەستێرە ناسی، صرف، نحو، بەزمانی سامی بنووسرێتەوە لە پەرستگای( ئارووخ ) دا هەلگیراوە. شاری( ئارووخ ) بەشاری کتێب بەناوبانگ بوو[٠٠] لە تەورات دا( عەرك ) نووسراوە لە بریتی( ئارووخ )( سفر تکوین فەسلی دەیەم ). دەربارەی ڕەگەزی( شوومێر و ئەکاد ) لە نێوان رۆژهەلات ناس و مێژوو ناسەکاندا جیاوازی هەیە. هەندێك ئەڵێن لە ئەوەی حامی کوڕی نوحن. هەندێکی تر بە ئەوەی سامی کوڕی نووحی ناو ئەبەن. بەداخەوە ئێمە ئەگەر بڕوامان بە مێژووی( یەهودو مەسیحی و ئیسلام ) بێت، ئەوا لەکاتی فەرمانڕەوایی( کلدە ) شوومێرو( ئەکاد ) دا واتە

---

[٠٠] پیرنیا لە لاپەڕە( ٢٦ ) ی( ئێرانی قەدیم ) دا ئەڵێت ئەم کتێبخانەیە سارگونی دوەم دروستی کردوە ساڵی( ٢٨٠٠ ) پ ز( میسو سن بۆیس ) ی فەرانسایی لە ل ١٢١ تا ١٢٢ کتێبی( تاریخ ملل قدیمە مشرق ) وەرگێرانی فەروخی ئەڵێت : سارگونی یەکەم ئەم کتێبخانەیەی دروستکردوە.

ساڵی( ٣٨٠٠ )پ ز دا کە سارگۆنی یەکەم فەرمانڕەوا بووە هێشتا سام و حام لە دایك نەبوون. چونکە مێژوو نووسانی ناوبراو لە دایك بوونی( ئادەم بە( ٤٠٠٤ ) ساڵ پ ز ئەزانن[101]. هەندێکی تر ئەڵێن( ٥٥٧٥ ) پ ز و بڕێکی تر( ٥٥٠٨ ) پ ز لە هاتنە سەر زەوی ئادەمەوە تاوەکو لەدایك بوونی( سام ) بە پێ ی تەورات زۆربەی کتێبە مێژووییەکانی گەلان ئەڵێن( ٢١٥٢ ) ساڵ نێوانیان هەیە. ئەگەر ئەم ژمارەیە لە( ٤٠٠٤ ) دەربکەین( ١٨٥٢ ) ساڵی ئەمێنێتەوە ئەگەر هاتوو ئەم ژمارەیەش لە( ٣٨٠٠ ) دەربکەین کە ساڵی فەرمانڕەوایی

سارگۆنی یەکەم یانی( ١٧٥٨ )[102] ساڵ پێش فەرمانڕەوایی سارگۆن، سام لەدایك بوون. ئەم هەموو جیاوازی و پێکا چوویی و جیاوازیانە لە نێوان ڕای زاناو مێژوو ناسەکاندا بوونەتە هۆی ئەوەی کاتی هاتنی ئادەم یا دروست بوونی زەوی بە شێوەیەکی ڕاست ڕوون نەزانری.

بشەکی داند کە این باغ ازکی است کوبهاران زاید و مرگش دی است

( دێر لافواد دەمدگان ) دوو سەرۆکی( هیئەی اکتشافات )ی فەرانسان. ڕایان وایە عێلامەکان لە نەوەی عێلامی کوڕی سامی کوڕی نوحن. ئەڵێن عێلامەکان حەبەشین یانی لە نەوەی حامی کوڕی نوحن( ئەمەش ڕای چەند مێژوو ناسێکە ). پێچگە لەوەی کە باسمانکرد تاوەکو ئەو ڕۆژانە هێشتا سام و حام لە دایك نەبوون و بە پێ ی زۆربەی مێژووی گەلان و کتێبی کۆن( تەورات ) ئەڵێن عێلامەکان لە نەوەی سامی کوڕی نوحن حەبەشیەکان لە نەوەی حامن و ڕەش پێستن. هۆی دوو دڵی و ڕاڕایی زۆربەی مێژوو ناسەکان لەوە ئەچێ تیرەیەکی تر لە نەوەی حەبەش لە خاکی عێلامەکاندا ژیابن. پاشماوەکانیان بووبێتە هۆی سەر لێ شێواوی زۆربەی لێکۆڵەرەوەکان. بۆیە هێشتا ساغ بوونەوەیەکی تەواو نی یە

---

[101] کتێبی – زبد الصحائف – ل ٧ تەوراتی عەرەبی ل ١

[102] ئەك وەك نووسەر نووسیویە بەشکو ئەبێ ساڵی زاینی لە دایك بوونی سام لە( ١٨٥٢ ) پ ز لە ساڵی فەرمانڕەوایی سارگۆن دەربکری لە( ٣٨٠٠ ) پ ز تاکودەربکەوێ سام لە( ١٩٤٨ ) ساڵ پاش حام لە دایك بوە.

لەسەر عێلامەکان. هەرچەندە لەوە ئەچێ ئەو پاشماوەو ئاسەوارانە لە حەبەشەکانەوە بۆ عێلامەکان جێ مابێ یاخود لەوە ئەچێ لەکاتی فەرمانڕەوایی عێلامەکاندا حەبەشکان بەسەر بەشێك لەدەسەلاتدارێتی عێلامەکاندا سەرکەوتبن یاخود لە خاکی خۆیاندا دەریان کردبن. یاخود لەوە ئەچێ هەموویان خستبنە ژێر دەسەلاتی خۆیانەوە. دیسانەوە سەر لەنوێ عێلامەکان سەریان هەڵدابێتەوە و دەسەلاتیان پەیدا کردبێتەوە ڕای مێژوو نووسی فەرەنسی( دەمرگان ) وایە و ئەڵێت( زمانی بنەڕەتی عێلام زمانی( ئانزانی ) کۆنە کە( ٣٠٠ ) ساڵ پ ز بەکار هاتووە. لە پاشدا وازیان لێ هێناوە. زمانی شوومێری سامی سەریان هەڵداوەو برەویان پەیدا کردوە دیسانەوە ساڵی( ١٥٠٠ ) پ ز زمانی ئانزانی سەری هەڵداوەتەوە زیندوو بۆتەوە. لەسەرچاوە مێژووییەکاندا بۆمان ڕوون بۆتەوە کە سنووری ولاتی عێلام بەم شێوەیە بوون : - لە رۆژهەلاتەوە بەشێك لە ولاتی فارس. لای ژوورو ڕێگایەك لە هەمەدانەوە درێژ بۆتەوە تا بابل. لای ڕۆژئاوا ڕوباری دیجلە. لای خواروو کەنداوی عەرەب تا بوشەهر. ولاتی عێلام بریتی بووە لە خوزستان و پشتکۆو چیاکانی بەختیاری. شاری شوش پایتەختی ئەم ولاتە بووە. ئەم شارە یەکێك لە کۆنترین شارەکانی دنیا ئەژمێررێت. تا سەردەمی ئەسکەندەری مەقدۆنی ئاوەدان بووە. لە کتێبە کۆنەکاندا( شوشن ) نووسراوە یانی( سۆسەن ) کە گوڵێکی زۆر جوانە لە پاشماوە کۆنەکان و سەرچاوە دێرینەکاندا سێ خولی فەرمانڕەوایی عێلامان بو ڕوون بۆتەوە( ١ ) خولی پێش مێژوو یانی( ٨٠٠٠ ) ساڵ پێش زاین تا ساڵی( ٢٢٢٥ ) پ ز( ٢ ) سەردەمی پەیوەندی داری دەوڵەتی عێلام و بابل لە ساڵی( ٢٢٢٥ ) پ ز تا ساڵێ پ ز.( ٣ ) سەردەمێك کە دەوڵەتی عێلام هاوسێ ی ولاتی ئاشوور بووە. لەساڵی( ٧٤٥ ) پ ز تا ساڵی( ٦٤٥ ) پ ز پاش سارگۆنی یەکەم ئەرامسین ی کوڕی دەسەلاتی وەرگرتوە لە ولاتی کلدا( شوومێر و ئەکاد ) لە ساڵی( ٢٧٠٠ ) پ ز سەردەمی بە سەردەمی ئاوەدانی و دەسەلاتداری بەناوبانگ بووە. لەلایەن( مێجەر ئادسۆن لی ) پارچە تابلۆیەکی سەردەمی ئەم فەرمان ڕەوایە دۆزراوەتەوە. لە( دەربەندگاور ) لە نزیك چیای( قەرەداغ ) پارچەیەکی تر کە دەستی( دەموگان )[١٠٣] کەووتوە. دا دەرئەکەوێ ئەم فەرمانڕەوایە هێرشی کردووتە سەر ولاتی( لۆلۆ )و فەرمونڕەواکەی کە ناوی( شاتۆن ) بووەشکاندویەتی و ولاتی لۆلۆی داگیر کردوە.

---

[١٠٣] بریتی یە لە پارچە بەردێکی پان کە لە سەری چەند نیگارێك کێشراوە.

لەپاشدا گوتی یە هاو ڕەگەزەکانی لۆلۆ کە لە ناوچەی کەرکوکدا جیّ گیر بوون و لە کوردەکانی زاگرۆزن. هێرشیان کردۆتە سەر ولاّتی کلدانیەکان و سەریان بە نەرامسین شۆڕ کردوە کە فەرمانڕەوای خۆی لەدەست بدات. ئەم شکاندنە بوە هۆی سەر هەڵدانەوەی لۆلۆکان و ڕزگار بوونیان لە ژێر دەسەلاّتی کلدەو پێک هێنانی دوبارەی دەوڵەتەکەیان. پاش لەدەست چوونی دەسەلاّتی نەرامسین کلدانیەکان بوونە ژێر دەستەی دەوڵەتی( ئاریخ – نۆرۆخ ) پێنج فەرمانڕەوای( ئاریخ ) ماوەی( ٢٠ ) ساڵ لەم ولاّتە فەرمانڕەوا بوون"[104]. پاش ئەمانەش گوتیەکان جارێکی تر دەستیان بەسەر ولاّتی کلدەکاندا گرتەوە"[105]. زیاتر لە دوو سەدە دەوڵەتی( کلدە - شۆمێرو ئەکاد ) لە ژێر فەرمانڕەوایی گوتی دا بووە. تەنانەت فەرمانڕەوا بەدەستەلاّتەکانی( لاگاش ) یش باجدەری گوتیەکان بوون. بەلاّم شێوەی فەرمانڕەوایی گوتیەکان یا چەند کەس فەرمانڕەوییان کردوە یا ناویان چی بووە. تا ئێستا بەتەواوی ئاشکرا نی یە( پرۆفیسۆر سپایزار ) لە کتێبەکەیدا ئەنووسیّ دوا فەرمانڕەوای گوتیەکان لەولاّتی( ئەکاد ) تێریگان بوە وا دەرئەکەویّ بەپیّ ی ناوە هاوبەشیەکان لە گوتی یەکان تێکڵاوی شوومێرەکان بوون. بەهۆی ئەمانەوە دەسەلاّتیشیان بەسەر ئەکەدەکانیشدا گرتبێت"[106]. نووسەری کتێبی( مێژووی کۆن و ڕۆژهەلاّتی نزیک)( مستر هول ) لە جەدوەلی فەرمانڕەواکانی کۆندا ل(٢١٠) ئەڵێت( ئەناتوم)فەرمانڕەوایی گوتیەکان لە دوروبەری ساڵی( ٣١٠٠ ) پ ز یانی سەردەمی فەرمانڕەوایی( هۆشنگی ) پێشدادی لەگەڵ عیلاّمەکان جەنگیوە. ئەناتوم خۆی ئەڵێت " لەگەڵ عیلاّمەکاندا شەڕمان کردووە شکاندنێکی بیّ وێنەمان بەسەردا هێنان ". لە پاشماوە دێرینەکاندا ڕوون بۆتەوە کە عیلاّمەکان هێرشیان کردۆتە سەر( لاگاش ) و ئەناتوم شکاندونیەتەوە، ئەم کینەیە وردەوردە پەرەی سەندوە تا ئەکادەکان بوونەتە جیّ نشینی شۆمێرەکان، تا وای لیّ هات عیلاّم بووە باج دەری ( ئەکەدەکان )"[107]. پایتەختی( ئەناتوم ) شاری لاگاش بووە. لەبەر ئەوەی فەرمانڕەوایی( ئەناتوم ) پێنج

---

[104] مێژووی کۆنی ڕۆژهەلاّتی نزیک ل ١٨٩

[105] هەمان سەر چاوەی پێشو

[106] هۆزەکانی میزوپوتامی ل ١٩

[107] مێژووی گشتی ڕضا ئەخوی ل ١٩٥

سەدە پێش شکاندنەکەی( ئەرامسین ) بووە ئاتوانین ئەناتوم بەیەکەم فەرمانڕەوای گوتیەکان دابنێین ئەناتوم ی دووەم ساڵی( ٢٠٠٠ )پ ز جارێکی تر هێرشی عیلامەکانی پەرچ داوەتەوە کە کردوویانەتە سەر شاری لاگاش و بەرودوا شکاندویانەتەوە. نووسراوێك کە( کاهن – ربه النوع نین مار – بۆ یەکێ لە هاورێکانی نووسیوە بە تەواوی ئەم رووداوەی تیا دیاری کردوە[١٠٨]. ( لوگاڵ زاکیس ) ی گوتی لە ساڵی( ٢٩٠٠ ) پ ز دا فەرمانرەوای( ئارۆخ شومێر ) بووە کە فەرمانڕەوایی کلدەکانی خواروشی کردوە[١٠٩] بە پێ ی ئەو نووسراوە کە لە ناوچەی( لولوم ) ی نێوان سلێمانی و بەغدا

دوزراوەتەوە لە دەوروبەری ساڵی( ٢٨٥٠ ) پ ز( ئانۆبانینا ) ی فەرمانڕەوای گوتی فەرمانڕەوای شومێرو ئەکادیشی کردوە و شاری لاگاش پایتەختی بوون. ئەو بەردە ئەخشینراوانەی لە زەهاو دۆزراوەتەوە مێژوویان بۆ سەردەمی( ئانۆبانینا )ئەگەرێتەوە، پاش ئەوەی عیلامەکان لە هێرشەکانیاندا بۆ سەر شۆمێر تێك ئەشێکێن رێگە ئەگۆرنە سەر کلدەکان و هێرشیان بۆ ئەکەن. ( مانیشتوو ) ی سەرۆکی هۆزی( کیش ) و فەرمانڕەوای ئاینی( ئەکادە ) لەشەرێکی خۆیناویدا لەگەڵ عیلامەکان تێکی شکاندوون و فەرمانڕەوای عێلامەکانی بەدیلی بردۆتە شاری( ئەکادە ) ولاتی عێلامەکانی کردۆتە باج دەری ئەکادەکان. گوڵدانێکی ئەخشدار کە لە شاری( ئەبیوور ) دۆزراوەتەوە لە شاکاری عێلامەکانە وەك مێژوو نیشانمان ئەدات لەم سەردەمەدا( جەمشیدی ) پێشدادی تازە لە سەگستان ) دەسەلات و فەرمانڕەوایەکی تر هاتۆتە کایەوە ناوی( گوتا – یا گۆدا بووە لە شاری لاگاش دانیشتوە و بۆتە فەرمانڕەوای کلدە =( شۆمێرو ئەکاد ) کە بە پێنجەمین فەرمانڕەوای گوتی ناو ئەبرێت. ئەم( فەرمانڕەوایە زیاتر سەرگەمی شەڕو شۆر بووە. ئاتران یانی( عێلامەکان ) ی خستۆتە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە.( مسیو دۆ سارزك ) ی فەرنسی لە کەولاوەکانی( لاگاش ) دا لە پاشماوەی کۆشك و تەلارەکانی دا ناوی ئەم فەرمانڕەوا کوردەی لەسەر خشتێك دۆزیوەتەوە کە هەڵکەنرابوو ساڵی( ٢٨٠٠ ) پ ز سارگۆنی دوەم فەرمانڕەوای ئەکەدەکان لە شەرێکی سەختدا( شارلاك )ی فەرمانڕەاوی

---

[١٠٨] پیدینا ل ٢٦

[١٠٩] مێژووی کۆنی رۆژهەلاتی نزیك

گوتیەکانی شکاندوە. بۆ هەمیشەیی کۆتایی بە دەسەلاتی گۆتی هێناوە[١١٠]. پاش ئەم سەرکەوتنە گەورەیەی( سارگۆن ) هەستا دەستی کرد بە گێڕانەوەی گوتیەکان لە بابلستانەوە بۆ لای زاگرۆس، یانی شوێنی باوباپیریان " لوڕستانی ئەمڕۆ ). هەندێك لە مێژوو نووسان ئەڵێن لەلایەن( ئۆیۆهگەل " ی فەرمانڕەوای ئوور دەوڵەتی گوتی لە ناو چووە. سارگۆن وردە وردە ولاتەکەی پەرە پێ داوە. لای ڕۆژئاواوە تا ولاتی شام ڕۆیشتوە. لای سەرەوە تا پشتی چیاکانی زاگرۆس یانی کرماشانی ئەمڕۆ دەسەلاتی خۆیان سەپاندوە لە ئەنجامدا ولاتی مادیشیان داگیر کردوە. ماوەی سێ سەدە کوردەکان باج دەری بابلیەکان بوون و سەرانسەری خاکی کوردستان لەژێر چاودێریاندا بووە. پاش سارگۆن ڕوداوێکی وا گرنك ڕووی نەداوە کە شیاوی باسکردن بێت. تا سەدەی( ٢٥ ) ی پ ز یانی( ٢٦٠٠ ) پ ز زوحاك سوپایەکی گەورەی هێنایە سەر پێشدادیەکان( پارس و ماد ). لە سەردەمی بابلیەکاندا دەوڵەتی جەمشیدی لەناو بردوە کۆمەڵی مادو پارسەکانی خستۆتە ژێر دەسەلاتی خۆی یانی دەسەلاتی کلدانی. ساڵی( ٢١٩٢ ) پ ز فەرەیدوونی پێشدادی بە هاوکاری( کاوەی ئاسنگەر )ی کورد ئەسفەهانی کە لە نەوەی مادەکانە هەڵساو ولاتی پێشدادیەکانی لەدەست فەرمانڕەویی و دەسەلاتی کلدانیەکان ڕزگار کردوە. پاش ئەم ڕووداوە لە ساڵی( ٢٤٥٠ ) پ ز( دونگی ) فەرمانڕەوای شۆمێرەکان پایتەختی لە شاری لاگاش – ە وە گواستەوە بۆ شاری ئوور. لەم سەردەمەدا عێلامەکان و لۆلۆکان لەژێر دەسەلاتی شۆمێرەکاندا بوون.

---

[١١٠] مێژووی کۆنی ڕۆژهەلاتی نزیك

## پێك هاتنی

# دەوڵەتی ئاشوور

ساڵی( ٢٣٥٨ ) پ ز ئاشوور ناوێك لە نەوەی ئاشووری کوڕی سامی کوڕی نوح لە کەناری ڕوباری دیجلە تۆزێك خوارتر لە( نەی ینەوا ) یانی بەرانبەر شاری موسڵی ئێستا شارێکی دروست کرد. بەهۆی دروست کردنی لەلایەن ئاشوورەوە هەر بەو ناوە ناوی دوکرد. لە پاشدا( نینەی کوڕی بلوز ) ئەو شارەی گواستەوە و شاری نەینەوای دروست کرد. لە کتێبی نەتەوە کۆنەکانی ڕۆژهەلات چاپی دوەم ل( ١٢٥ ) و مێژووەکەی حەسەنی پیرنیا ل( ٣٥ ) دا نووسراوە ئاشوور یا ئالاشکار کە ناوی خودای( رب النوع ) ی ئەو شارە بووە بۆیە بە ئاشوور ناودار بووە. هەر چۆنێك بێت ئاشووری ناو براو دەوڵەتی ئاشووری پێك هێناو ناوچەی سەروی کلدەو کوێستانەکانی سەروو ڕۆژهەلاتی خستە ژێر فەرمانڕەوایی خۆیەوە. پەیدا بوونی ئەم دەوڵەتە بوە هۆی لاواز بوونی دەوڵەتی کلدە بۆیە عیلامەکان هەوڵیان دا کە لە کۆیلەیەتی کلدانەکان ڕزگار بین. دەوڵەتی ئاشوور بە دوو خولدا تێپەر ئەکات(١) – ساڵی( ٢٣٥٨ ) پ ز تا ساڵی( ١٥٩٣ )[111] ی خایاندوە پێك هێنەری هەمان ئاشوور بووە کە باسمانکرد.

دوا دەسەلاتداری ئەم خولە( ساردانە پال ) ی کوری سەلمانازار بووە لەم خولەدا( ٣٠ ) شا بەشداریان کردوە. ٢- لە ساڵی( ٧٤٥ )ڕ وە دەست پێ ئەکاتەوە و تا ساڵی( ٦٦٠ ) پ ز کە( ٨٥ ) ساڵ ماوەی بووە.( ٧ ) کەس فەرمانڕەواییان تیا کردوە. یەکەم دەستەلاتداری ئەم خولە( تەکلات پالازار )ی دوەم بوە. دوا فەرمانڕەوای ئاشوور( ساراکۆس ) بوە کە قەلاکەی خۆیانی ئاگرداو هەموویان سووتان وەك باسی ئەکەین. لە ساڵی( ٢٢٨٠ ) پ ز( کرور ناخنتای یەکەم( فەرمانڕەوای شوش ی پایتەختی عیلام، لەگەڵ شوومێرەکاندا بەشەڕ هاتووە بەسەر دەوڵەتی بابل دا سەرکەوتوو کۆتایی پێ هێناوە و شاری( ئور )ی داگیر کردوە. پەیکەری( نینە )ی لە پەرستگای( ئاروۆخ )ە وە بردۆتە ولاتی خۆی و ماوەی( ٦٠ ) ساڵ شومێرەکان لەژێر سایەی عیلام دا ژیاون. دیسانەوە لە ساڵی( ٢٣٢٠ ) پ ز شومێرەکان دەسەلاتیان پەیدا کردوە، خۆیان لەژێر چنگی عیلامەکان ڕزگار کردو زنجیرە پاشایەکی نوێ یان بەناوی( نی سینی دامەزراندو توانیان دەسەلاتێکی باش پەیدا بکەن و زیاتر لە

---

[111] بە سەرنج دان دەرئەنجامەکەی کە ژمارەی ساڵی(١٥١٢ ) کە هەڵەیەو ڕاستیەکەی(١٦١٢ )ساڵە کە درێژی خولی یەکەمە ( وەرگێر )

سەدەیەك فەرمانڕەوایی بکەن. تاکو ئێستا ناوی( ١٦ ) کەس لە فەرمانڕەواکانیان زانراوە. هەر لەم سەردەمەدا یانی( ٢١٩٢ ) پ ز فەرەیدوونی پێشدادی کەخەڵکی وڵاتی ماد بوومبە یارمەتی کاوەی ئاسگەری مادی کە خەڵکی ئەسفەهان بووە ڕاپەڕیون و وڵاتی پێش دادیەکانیان لەژێر چنگی کلدانیەکان ئازاد کردوە و دەوڵەتی( ئاجام ) یان پێك هێناوە.

هەندێك لە مێژوو ناسەکان پەیدا بوونی فەریدون بە هەڵەسالی( ١٢٧٨ )پ ز دیاری ئەکەن. یونانیەکان فەریدون بە( ئارباس ) ناو ئەبەن. لە کۆتاییدا شوومێرەکان لەگەڵ ئەکەدەکاندا پەیمان ئەبەستن دژی عیلام، پاش ئەوەی( ریمین )ی شای عیلام ئاگاداری ئەم پەیمانە ئەبێت سالی( ٢١١٥ )پ ز سوپایەکی گەورە ئەهێنێتە سەر( شومێر و ئەکەدەکان ) و بەسەریاندا زاڵ ئەبێت و بۆ هەمیشەیی لەناویان ئەبات و توانای سەر هەڵدانەوەیان نابێت. تا لە ئەنجامدا لە ناو ئەتەوەکانی دەورو بەردا توانەوە و تێکەڵ بوون. حامورابی کە لە سالی( ٢١٢٣ – ٢٠٨٠ ) ی پ ز پاشایەتی کردووە خۆی لەژێر دەسەلاتی عیلامەکان کێشاوەتەوە و لەیەکەم شەڕدا لەگەڵ( ریمسین )ی عیلامدا توانی تێکیان بشکێنێ وبەسەریاندا زاڵ بێت. تۆڵەی شکاندنەکەی شوومێرو ئەکەدی لێ کردنەوە. ئەم پیاوە مەزنە دەستی کرد بە ئاوەدان کردنەوەی وڵات و پەرەسەندنی دەسەلات لە وڵاتەکەیدا. حامورابی بەیەکێك لە پادشا دەسەلاتدارەکانی مێژووی دنیا ئەژمێرێ.( دستوور )ە کەی گەواهی ئەم ڕایەمانە. ئەم دەستوورە بە کۆنترین دەستوور ئەزانرێ تا ئەم سەردەمە کە لە کەلاوەکانی شاری شوش دا دۆزرایەوە و ئێستا لە مۆزەخانەی( لورە ) لە شاری پاریس[١١٢]. سالی( ٢٩٣ ) پ ز ریمسین ی عیلامی سەر لەنوێ خۆی ئامادە کردۆتەوە و سەر پێچی لە دەسەلاتی حامورابی کردۆتەوە. حامورابی فەرمانی دەرکردنی ریمسین ی دا. لە شاری لارسام دەری پەڕاند. عیلامەکان سەر بەخۆیی خۆیان هەر لەدەست نەدا( خۆنیان نۆمینا ) ئاوێك پەیدا بوو بوە هۆی گەشە کردن و پەیدا کردنی دەسەلاتی سەر لەنوێ ی عیلامەکان و فەرمانڕەواییان دەست پێ کردەوە.( شمشۆ ئایلونای کوڕی حامورابی ) دیسانەوە دەستی کردەوە بەشەڕ کردن لەگەڵ عیلام و توانی بەسەر( کرۆر مابۆك ) ی عیلام دا سەرکەوێ دوای ئەوەی( شمشونایلونا ) لە دنیا دەرئەچێ جێ نشینەکانی بەهۆی گوێ نەدان بە دەوڵەت وردە وردە والاتی بابل بەرەو بێ دەسەلاتی چوو. ئەگێڕنەوە لە سالی( ٢٠٢٨ ) پ ز کورد ئاشور، یونان فەرمانڕەوایانی ئاشور و کلدان ی

---

[١١٢] وا چاکترە بلێین کۆنترین دەستوورە کە لە شاری شوش دۆزراوەتەوە. ئەگینا دەستوورەکەی سارگۆنی یەکەم کە لە ئاروخ دۆزرایەوە لەم کۆنترە.

خستۆتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە و بەسەر هەردوو دەوڵەتی کلدانی و ئاشووری فەرمانڕەوا بوون. پاش مردنی خۆی( نینە )ی کوڕی کە یونانیەکان( نینۆس ) ی پێ ئەڵێن مێردی( شمارمێ – سەمێرامیس )ی مەلیکەی بابل فەرمانڕەوایی وڵاتی ئاشوور و کلدانی کردوە بۆ ماوەیەك[113]. وڵاتەکەی لە جزیرەی عەرەبەوە تا هندستان و لە سنووری بەسرەوە تا چیاکانی قەفقاز پەرە پێ داوەو داگیری کردوە. ئەم پاشایە لەگەڵ( ماد ) ە کانیشا شەڕی کردوە و بەسەریاندا سەرکەوتوە[114]. ئەم سەرکردە گەورەیە شاری( بەلخ ) یشی ماوەیك ئابڵووقە داوە بەڵام بەهۆی ئەو سوپا زۆرەوە کە لە قەڵای بەلخ دا هەبووە نەیتوانیوە داگیری بکات.( شمارمی – سەمێرامیس ) کە ژنی یەکێ لە سەرکردەی سوپاکەی( نینە ) بووە، ئەم ژنە قارەمانە توانی لە لایێ یەکی سەختەوە لەگەڵ چەند کەسێ لە چەکدارانی سوپاکەی دزە بکاتە ناو قەلاکەی شاری بەلخ و ڕێگەی کردەوە بۆ داگیرکردنی، هەر ئەم قارەمانیەتیەی( شمارمێ – سەمێرامیس ) وای کرد کە( نینە ) دڵی پیا چوو وە بەزۆر لەخۆی مارە کرد، لەئە نجاما سەرکردەکەی مێردی هیچی پێ نەکراو لە داخا خۆی کوشت. نینەشاری ئاشووری گۆڕی، چەند کیلۆمەترێك لە سەرووترەوە شارێکی تری دروست کرد کوردەکان بەهۆی ئەوەوە کە نینە دروستی کردوە پێ یان وتوە( نێ ئاوا ) کە لە ئە نجامدا بە( نەینەوا ) ناوی دەرکردوە[115]. پاش ئەوەی نینە ئەمرێ( نیناس ) ی کوڕی منداڵ ئەبێت، توانای بەڕیوە بردنی کاروباری وڵاتی نابێت بۆیە سەمێرامێس کاروباری وڵات ئەگرێتە ئەستۆ. بۆ ئەوەی بەتەواوی چاودێری وڵاتی کلدان بکات لە خوارووی ڕووباری فورات شارێکی تازەی بەناوی( بابل )ە وە دروست کردو کردیە پایتەختی خۆی کە ئەڵێ لە شاری نەینەوا گەورەتر بوو، دیوارێکی پانی گەورەی بە دەوری شارا دروست کرد کە( ٧٠ ) هەزار مەتر ماوەی درێژی بووە، ئەو دیوارەی بە شێوەیەك پان دروست کرد کە شەش عەرەبانەی پەهلەوی بە ئاسانی هاتووچۆی پیا ئەکرد .ڕوباری فورات بە ناوەراستی شاردا تێپەڕیوە، پردێکی لەسەر بەستووە گەلێ کۆشك و باخچەی جوانی دروست کردوەو شارەکەی ڕازاندۆتەوە. ئەم خاتوونە دەستی کردوە بە گەڕان بە وڵاتەکەیدا ،گەلێ شارو دێهاتی زۆری ئاوەدان کردۆتەوە لە کوێستاندا ، لە کوێستاندا

---

[113] سەمێرامیس کچی بێلرس ی ئەستێرە ئاسەکە بە یەکێك لە زاناکانی ئەستێرە ناسی کلدانی ناوئەبرێت.

[114] ئەتەوە کۆنەکانی ڕۆژهەلات ل ١٣٠. مێژووی کۆنی هەورامان ل ٩٦، ل ١١٥ جاماسنامە، ئاوێنەی ئەسکەندەری ل ١٠٥.

[115] ) لاشەکەی نینە لە شاری نەینەوا لە ژێر هەرەمێکدا نێژراوە کە زیاتر لە هەزار مەتر بەرزە

گەلێ ڕێگاو بانی دروست کردوە زوربەی کۆشك و تەلارو پاشماوە دێرینەکانی( ئاسیا ) بۆ سەردەمی ئەم خاتوونە ئەگەڕێتەوە. لەوانەیشی( باخچە هەڵوسراوەکانی بابل ). کە بە یەکێك لە حەوت دروستککراوە سەیرەکانی دنیا ئەژمێردرێ نووسراوەکەی سەمیرامیس کە لە دەشتی دەریاچەی ئورال بە ئاوبانگە باسی هەڵس و کەوت و کارە گرنگەکانی خۆی ئەکات و ئەڵێت : -( سروشت تەن و لاشەی ژنانەی بەمن داوە بەڵام کارەکانم هاوتای کاری گەورە پیاواتی دنیایە ). خاتو سەمیرامیس سوپایەکی گەورەشی بردۆتە سەر وڵاتی هیندو لە ڕووباری( سەند ) یش پەڕیوەتەوە. بەڵام فەرمانڕەوایانی هیند خاوەنی فیلی شەڕانی زۆر بوون توانیان بەهۆی مو فیلانەوە سوپاکەی تێك بشکێنن[116]. کاتی گەڕانەوەی لەم شەڕەدا تووشی( زاملیەکان ) ئەبێت و شەڕێکی خوێناوی لە نێوانیاندا ڕوو ئەدات و سەمێرامیس بریندار ئەبێ. بە برینداری ئەگەڕێتەوە شاری بابل. لەبەر کاریگەری برینەکەی دست لە فەرمانڕەوایی هەڵئەگرێت و نیناس ی کوڕی ئەبێتەفەرمانڕەوای بابل ئیناس گوێی نەئەدایە کاروباری وڵات هەمیشە خەریکی ڕابواردن و پارە خەرج کردن بووە. لە پێناوی خۆشی خۆی و خێزانەکەی لە بەزمی دەربارو دیوەخان ئەکەوت بۆیە پاش سێ ساڵ پاشایەتی لەلایەن( رامس ) ی فیرعەونی میسرەوە[117] وڵاتەکەی داگیر ئەکرێت و وڵاتی ئاشوور کلدە دەبنە باج دەری میسریەکان. لە دەورو بەری سەدەی( ٢٠ ) ی پ ز دەوڵەتی ئاشوور بریتی بووە لە چەند دەوڵەتێکی بچووك و لاواز کە زۆربەیان ژێر دەستەی شاخ نشینەکان یانی( کوردەکان ) بوون. ماوەیەکیش لەژێر چاودێری و دەستەلاتی( میتانی ) یەکان بوون. یەکەم فەرمانڕەوای ئەم دەوڵەتە لەوە ئەچێ لەسەدەی( ٢٣ ) پ ز دا بووبێت کوڕی( ئایاکولابا ) بووە کە ناوەکەی نزیکە لە ناوی گوتیەکانەوە( ئۆشپیا ) و( کیگا ) دوو فەرمانڕەوای کۆنی ئاشوورەکانن کە لەو سەردەمەدا ژیاون وا دەرئەکەوێ میتانی بوون. یەکێ لە پاشایانی ئاشوور لە سەدەی( ١٩ ) پ ز دا ناوی ئاداسی بووە گوایە ئەم فەرمانڕەوایە زاگرۆس بومەوە. پاش ئەویش(

---

[116] ملل قدیمە مشرق ل ١٢٠، ئاینە ئەسکەندەری ل( ١٠٢، ١٠٥،١٢٥ ) تاریخ قدیم هەورامان ل ١١٢، ١١٧، جاماسنامەل ١٢٨

[117] بە( رامسس ) ئەڵێن – سنروسترس ی گەورە وەك ئەگێڕنەوە رامسس پێش سەدەی( ١٦ ) پ ز ژیاوە. بەڵام لە کتێبی – ملل قدیمە مشرق – دا لە خشتەیەکدا سەدەی( ١٦ ) تا( ١٢ ) پ ز دیاری کراوە. لەوە ئەچێ وانەبێت.

لولولای ) ناوێك فەرمانڕەوای ئاشورەکان بووە. بە ناوەکەیدا وا دەرئەکەوێ لە( لومو ) کان بووبێت.

لە دوای لاواز بونی فیرعەونەکانی میسر دەورو بەری ساڵی( ١٧٦٠ ) پ ز یاخود بە پێ ی و تاری( پرۆفیسۆر سپایزار ) ی رۆژهەلات ناسی ساڵی( ١٧٤٦ ) پ ز کوردەکان( کاسی ) یاخود بەوتەی ئەکەدیەکان کاسۆ کە لە شاخەکانی زاگرۆس بوون نزیك کرماشان و بە کوردە رۆژ پەرستەکان ناودار بوون. بە هاوکاری کوردە هاو رەگەزەکانی خۆیان( گوتی و لۆلۆ ) و لەژێر سەرکردایەتی ) خاندیژ( یا( کاندیژ ) ی سەرۆکی هۆزی کاسی دا بەسەر کلدانیەکاندا سەر ئەکەون و ئەو ناوچەیە ئەگر ئەدەست، بە هاوکاری هەرسێ هۆزە گەورەکە دەوڵەتێکی بەهێز پێك ئەهێنن لە بریتی دەوڵەتی کلدەکان( شۆمێرونەکاد ) کە بە دەوڵەتی( کادۆنیا ) یا( کاردۆنیاش ) بەناوبانك بووە. ماوەی شەش سەدە ئەم دەوڵەتە فەرمانڕەوایی کردوە لە ساڵی( ١٧٤٦ تا ساڵی ١١٧١ ) پ ز کە هیچ دەوڵەتێك بەم ڕادەیە نەیتوانیوە لە بابل دا ئەوەندە زۆر فەرمانڕەوایی بکات. پاش ئەوە دەوڵەتی ئاشوور دوبارە سەری هەلدایەوەو توانی دەسەلات و هێز پەیدا بکاوتەوە و میسریەکان دەربکەن.( بلوزی دوەم ) لە ئەوی سەمێرامیس دەسەلاتداری ئاشوور وەرئەگرێتەوە و کاروباری دەوڵەت ئەگرێتەوە دەست بە هاوکاری( ئاتوسا )ی کچی. پاش ئەوەی بلوز ئەمرێت

( ئاتوسا ) ی کچی فەرمانڕەوایی ئاشور ئەگرێتە دەست. پاش ئەمیش( بلتوز – بعلتوز - ) ناوێك لە کەس و کاری ئانوسا ئەبێتە فەرمانڕەوا لە ساڵی( ١٢٨٠ ) پ ز بنەماڵەی بلتوز فەرمانرەوای ئاشوور ئەکەن. لەسەدەی( ١٢ ) پ ز دا ئاداد نێراری فەمانڕەوای ئاشوور لە پاشماوە کۆنینیەیەکدا نووسیویەتی( کە سوپای کاسی و گوتی و لۆلۆکانم تێك شکاندوە و بەسەریاندا زاڵ بووم ). ساڵی( ١٣٨٠ ) سولامانازاری یەکەم فەرمانڕەوایی ئاشوریەکانی گرتۆتە دەست و سوپایەکی بەهێزی ئاراستە کردۆتە رای ئارارات و خانی گالبان –( دەوروبەری ئەسیبەین ) و لەگەڵ گوتیەکاندا بەشەڕ هاتووە. خۆی لە یادگارێکیدا ئەڵێ " گوتیەکان لەم سەردەمەدا وەك ئەستێرەیەکی پرشنگدار بە ئاسمانی ئەم دەورەوە ئەدرەوشانەوە وەك تەنها بەهێزو توانا. بەڵکو پیاوەتی زەنگ و فرو فێڵی شەڕو تێك دان ئاژاوە بەناوبانگ بوون بەرامبەری من یاخی بوون و خۆیان گرت و دوژمنایەتی خۆیان درێژە پێ دا ". لە ئەنجامی ئەم شەڕە سەختەدا ئاشووریەکان بەسەر گوتیەکاندا سەر ئەکەون و کارەساتێکی دژواریان بەسەردا ئەهێنن. وەك( سەلمانازار )

خۆی ئەڵێت : - " لە سنووری ئورارتیەوە تا کەموخی لەم سەر زەویە فراوانەدا خوێنی گۆتیەکان وەك ئاو ئەڕژا " لەم وتەیەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە ناوچەی یاخی بوونی گۆتیەکا لە ئەرمینیاوە تاکو چیای تۆرعابدین بووە. ساڵی( ١٢٧٨ ) پ ز تەگلات نین – ی فەرمانڕەوای ئاشور دیسانەوە بابلی داگیر کردەوە. جارێکی تر دەسەڵات و هێزی ئاشووریەکان پەرەی سەندەوە. بەڵام دەوڵەتی کاسی یانی( کاردونیا ) تا ئەو کاتەش سەربەستی خۆیان لەدەست نەدابوو. لە شاری( لاگاش ) سەرگەرمی فەرمانڕەوایی خۆیان بوون وڵاتی پارس( زابل و کرمان ) کە فەرمیدوون لە چنگی عمالقەکان ڕزگاری کردبوو. خاوەنی سەربەستیەکی تەواو بوون باجیان بە ئاشوورەکان نەئەدا[118]. بەڵام مادەکان لەبەر ئەوەی هێشتا لە ژێر فەرمانڕەوایی ئاشوورەکاندا بوون باجدەری دەوڵەتی ئاشور بوون تەنها دەوڵەتێکی بچووك نەبێت لە - بەلخ – لە ژێر فەرمانڕەوایی( توسە - دیوکس ) باجی نەئەدا. ئیتر هەموو هۆزەکانی مادو پارس باج دەری ئاشوریەکان بوون. ساڵی( ١١٩٠ ) پ ز( شوتروك ناخۆنتا )ی فەرمانڕەوای عیلام هێرشی کردۆتە سەر بابل دا و تالانی کردوە. هەرچی شت و مەکی نایاب و نەختی تیا هەبووە بردویەتیە شاری( شوش )، لەو شتە بەنرخانە( پەیکەری مەردوخ ) بوە کە پاش حەفتا ساڵ جارێکی تر ئەو پەیکەرە ئەگێڕنەوە بابل[119] لەسەردەمی فەرمانڕەوایی( شیل خاخین شوشناخ ) بەناوبانگترین فەرمانڕەوای عیلام هونەری کۆشك و تەلار دروست کردن و ویژەو پیشەسازی عیلام زۆر لە برەودابووە دەستیانکردوە بە کردنەوەی خانوو بەرەی تازەو کردنەوەی کۆشك و تەلار کۆنەکان بۆ هەر دروست کراوێك نووسراوێکیان نووسیوە کە ئەم دروست کراوە لە سەردەمی ئەم فەرمان ڕەوایەدا دروست کراوە یاخود هەر شاکارێك لە چ سەردەمێکدا بووبێت ئەمان

---

[118] عمالقە- مەبەست لەو عەرەبانەیە کە لە خاکی کلدانیەکاندا بوون( زوحاکیەکان ) یشیان پێ وتون یاتی مەلیکەکانی حەمیر کە فەرمانڕەوایانی میسر لەوانەبوون. یانی نەوەی عوملاق یا عملیق ی کڕی لاو ئەکوڕی نوح. لە کۆتایی فەرمانڕەوایی جەمشید لە فورات و بابلەوە هێرشیان کردە سەر ئێران داگیریان کرد. لای سویەوە هێرشیان کردۆتە سەر میسرو ئەویشیان داگیر کردوەو ماوەی( ٥٥٠ ) ساڵ فەرمانڕەواییان کردوە. لەبەر ئەوەی بیابان گەڕو ئاژەڵ بەخێوکەر بوون میسیەکان پێ یان و توون – هێکس – یانی فەرمانڕەوایانی شوان لە زمانی میسری کۆندا هیك بە مانای سگان دێت.

[119] پیرینا – لە لاپەڕە ٣٢ دا ئەڵێت پاش ٣٠ ساڵ ئەم پەیکەرە براوەتەوە بابل.

هاتن نووسراویان بۆ نووسیٚ و دیاریان کرد یاخود هەر دروست کراونێک خۆی نووسین بووبێت ئەمان وەریان گێڕاوەتە سەرزمانی( ئانزانی – عیلاّم ) بەم شێوەیە خزمەتێکی زۆریان بە رۆژهەلاّت ناس ومێژوو نووسەکان و زانایانی ئاساری کردوە. سالّی( ١١٨٤ ) پ ز زنجیرەی( یاپاش ) دا بابل پەیدا بوو لە سەردەمی ئەم پاشایەدا سالّی( ١١٧١ ) پ ز لە سەردەمی فەرمانڕەوایی( تەگلانی نین ) ی ئاشووردا کوردە کاسیەکان لە ئەنجامی ڕوداوێکی تا ئێستا نەزانراودا فەرمانڕەوایی( ٦٠٠ ) سالّەیی( کاردوین ) ی خۆیان لە دەست ئەدەن و بۆ شوێنی بنەڕەتی خۆیان یانی ناوچەی لوڕستان زاگرۆس ئەگەڕێنەوە. پاش ئەوەی ماوەی( ١٥٠ ) سالّ بەسەر فەرمانڕەوایی تەگلات نین ی ئاشوردا تێپەڕی، هەر چەندە فەرمان ڕەوایش بوون دووچاری لاوازی و کەم هێزی ئەبن تاکو سالّی( ١١٢٨ ) پ ز پالازاری یەکەم پەیدا ئەبێت سەر لەنوێ دەستێک بە ولاّتی ئاشووردا ئەهێنیٚ و خۆیان بەهێز ئەکەن و لە چەند لاوە پەل بلاّو ئەکەنەوە. ئەتوانین بلێین جارێکی تر سەر لەنوێ دەولّەتی مردوی ئاشووری زیندوو کردەوە. لەگەلّ دانیشتوانی( بابل – ماد – لۆلۆ ) چەند جارێک جەنگیوە پایتەختی لە نەینەوا گواستۆتەوە شاری( کالاخ )[١٢٠]. ئەم( تەگلات پالازارە )ی باسمان کرد بەیەکێک لە نازاترین و ناودارترین فەرمانڕەوای ئاشور ئەناسرێت، بانگەوازی فەرمانڕەوایی خۆی بەسەر هەموو فەرمانڕەواکانی جیهاندا بلاّو کردەوە لای ڕۆژ ئاوا ( کۆ مازن )ی داگیر کردووە کە یەکێک بوە لە و یلایەتی ڕۆژهەلاّتیەکانی شام و تا سەرچاوەی دیجلە هاتووە. لە ئەرمەنستانەوە تا دەریای ڕۆژئاوا( دەریای سپی )داگیر کردوە لە خوارەوەش تا کەنداوی عەرەب هاتووە. گومان لەوەشدا نی یە کە کوردەکانی ڕۆژ ئاوایش باج دەریان بوون. لەگەلّ( نایری ) یەکاندا بە ئاشتی ژیاوە و دۆستایەتی لەگەلّدا کردوون وەك ڕاگوزین ئەلێت لە راستیدا دۆستایەتی ڕەفتاری برایانەی تەکلات پالازار لەگەلّ نایریەکاندا زۆر چاك بووە. ئەم هەلّکردن و بە ئاشتی پێکەوە ژیانەی تەگلات پالازار بە پێچەوانەی فەرمانڕەوایانی تری ئاشوور بووە، وەك دەرئەکەویٚ ئەم شێوە گۆڕانکاریە لەگەلّ نایریەکاندا تەنها بۆ ڕەخساندنی هەلێك

---

[١٢٠] لە تەورات دا وشەی( کالەم ) هاتووە. هەروەها لە بەشی حەفتەمەمی مەلیکە کاندا( حلم ) نووسراوە.

بوە بۆ ئەوەی لە فرسەتێکدا دەستیان بەسەردا بگرێت. ئەم پاشا بەدەسەڵاتە هەموو سەرکەوتنەکانی خۆی لە تابلۆیەکدا تۆمار کردوە، ئەنووسێ " منم تەکلات پالازار فەرمانڕەوای بەدەسەڵات و سەرۆکی سوپای کەس بەسەردا سەرنەکەوتوە، فەرمانڕەوای هەر چوار گۆشەی جیهان. سەرداری هەموو سەردارەکان، خواوەندا هەموو خواوەندەکان شای هەموو شاهان،سەرداری بەدەسەڵات و داگیرکەری گەورە، منم وەکو لافاو هەموو وڵاتیەك داگیر ئەکەم و بەسەریاندا سەر ئەکەوم لە سایەی خواوە هاو دەست و هاوڕێم نییە لە فەرمانڕەوایانی ئاشووردا. هەموو دوژمنانی ئاشوور ئەخەمە( ژێر دەسەڵاتی خۆمەوە ". لە ساڵی( ١١١٨ ) پ ز( بەخت ئەسر )ی یەکەم( ئابوکوت ئەزەر ) فەرمانڕەوای کلدان لە زنجیرەی پاشاکانی بابل پەیدا بووە. هەندێ لە مێژوو نووسان( ئاسوردانیل ) یشی پێ ئەڵێن. ئەم فەرمانڕەوایەی بابل تا کەناری دەریای سپی ئاوەڕاستی داگیر کردوە. پەیکەری مەردۆخ کە( ٧٠ ) ساڵ پێشتر لە لەیەن عیلامەکانەوە برابوە شاری شوش، سەندیەوە و گەڕاندیەوە شاری بابل لە سەروی رۆژهەلاتی عەرەبستانیشەوەکلدەکان هێرش ئەبەن زۆربەی شارو رێکانیان کاول کردووە. وازیان لە تالان و برۆو کاولکاری نەهێناوە تا( بابل ) یان لاواز کردوە. ئەم بێ هێزی و بێ دەسەڵاتیەی بابل بوە هۆی خۆ گرتن و بەهێزی و دەسەڵاتی( ئاشور ) تا کو سەدەی نۆهەم یانی( ٩٠٠ ) پ ز پیاوێکی بەهێز و توانا پەیدا بوو بە ناوی( ئاسور ئازیرپاڵ ) زۆر بە ئاشور و لێ هاتوویییەوە توانی سەر لە نوێ برەو بداتەوە دەوڵەتی ئاشور و گەشەی پی بدات. لە ساڵی( ٨٨٥ ) پ ز هێرشی کردۆتە سەر ئەرمەنستان و داگیر کردوە و فەرمانڕەواکەیانی زنجیر کردوە و هێناویەتە( ئاربل ) و پێنستەکەی گوریوە و بە دیواریی قەڵاکەدا هەڵی واسیوە"[121]. چوار جار لەگەڵ کوردەکانی زاگرۆس بە شەڕ هاتوە جاری یەکەم ساڵی( ٨٨٤ ) پ ز سوپایەکی هێناوەتە سەر خاکی( لۆلۆ ) بەسەر کردایەتی( ئورئاداد )ی بابلی لێرەدا بۆمان دەرئەکەوی لەم کاتەدا لۆلۆکان ژێر دەستەی بابلییەکان بوون. جارێکی تر لە(

---

[121] پێست گوورین :- لە کۆندا لەنێو پاشایاندا بەتایبەتی باو بوە کە رق و کینەیان سەبارەت کەسێ بووبێ گرتوویانە و بۆ ئەشکەنجەی زۆرو لە توانا بەدەر پێستی لەشیان چەشنی پێستی حەیوان گوورییوە و پڕیان کردوە لە( کا ) و بۆ عیبرەتی خەڵك ماوەیك بە دیواری قەڵا یا لە شوێنێکی بەرز دایان ناوە. ( وەرگێر )

دەربەندبازیان )ە وە سوپای ئاشوور دێتە خاکی( لۆلۆ ) و چەند شارێك داگیر ئەکەن مەڵبەندەی لۆلۆکان لەم کاتەدا شاری( زێمری یمری ) بووە، داگیریان کردوە و( ئامێخا )ی فەرمانڕەوای لۆلۆ پەنا دەباتە بەر کوێستانەکان و ڕا دەکات. ئامێخا و چەند کەس لە سەردارانی سوپاکەی پەنا ئەبەنە بەر قەڵای( ئەیسیر - کینبا )( پیرەمەگرون ) و لەوێدا سەنگەر بەندی ئەکەن. سوپای ئاشوور لەژێر چاودێری شازادە( سەلمانازاری کوری ئاسورنایرپال ) هێرش ئەکەنە سەریان بەڵام ئەم هێرشە بێ ئەنجام بووە، نەیانتوانیوە زەفەر بە کوردەکان بەرن و لە ئەنجامدا پەیمانی ئاشتی ئەبەستن[122] فەرمانڕەوایانی ئاشوور دیوارێکی سەرکەوتن دروست ئەکات و چۆنیەتی ڕوداوەکە ئەنووسێ چیرۆکی خوێن ڕێژی و دڵ ڕەقی ئەم کابرایە لە مێژوودا بەناوبانگە پایتەختی ئاشووری لە ئەینەواوە گواستۆتەوە بۆ( کالاخ ) و ماوەی( ٢٥ ) ساڵ فەرمانڕەوایی کردووە. لە دەوروبەری ساڵی( ٨٦٠ ) پ ز پاش فەرمانڕەوایی ئاشووری گرتۆتە دەست و( کلدان و بابل ) یشی خستۆتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە( نبی یونس ) لە سەردەمی ئەم فەرمانڕەوایەدا بووە لە شاری ئەینەوا. جولەکانە سوپایەکی گەورەی هێناوەتە سەر فەلەستین و لەکاتی ئابلوقە دانی( بیت المقدس ) - ئۆر شەلیم - بریندار ئەکرێت و ساڵی( ٧٨٢ ) پ ز گەر هەربەو برینداریە ئەمرێت[123]. سەلمانازار جارێك ڕوەو کوردستان هاتووە لەم هەتنەیدا شەڕێکی بەرپا کردوە لە یاداشتەکانی دا ناوی دوو ئەتەوەی( پارسوا - ئامادا ) ی هێناو و ئەڵێت " کۆمەڵی یەکەم لە کوێستانەکانی نێوان( زەهاب ) و( دەیالە ) دا بوون کۆمەڵی دوەم لە نزیك و دەورو بەری ئەواندا ئەژین ". ئەم پاشایە ساڵی( ٨٥٩ ) پ ز هێرشی بردۆتە سەر( زامۆئا[124] و تا نزیك شاخی( نیکدیم ) و( نیکدی ئارا )ی داگیر کردوە[125]. ساڵی( ٨٤٤ ) پ ز سوپای هێناوەتە سەر ویلایەتی( ئامری ) یانی ناوچەی پشدەرو سەردەشتی ئێستا.

---

[122] ڕا پۆرتیکی سێر ئولمستر - مێژووی ئاشوور ل ٨٨، ٨٩

[123] بەڕای هەندێ لە مێژوو نووسان( سەلمانازار ) کەسی لە پاش بەجێ نەماوە. بەڵام لە پاشماوەکانی ئەینەوا دا دەرئەکەوێ کە( شەمشی ڕامان )ی سێ یەم کوڕی ئەو بووە. پاش باوکی لە ساڵی( ٨٨٥ ) پ ز بۆتە فەرمانڕەوای ئاشوور و هەمەدانی داگیر کردوە و بەربەرکانی ی ئێرانیەکانی کردوە.

[124] دکتور سپایزار لە کتێبەکەیدا ئەڵێت مەڵبەندی زامۆئا( ئانراکری ) بووە.

[125] ئەم دوو شاخە ڕەنگە تاسلوجە و گلەزەردە بێت.

نێرراوی فەرمانڕەوای( یامری ) کە ناوی( مەردۆخ ) مۆدامێغ ) بووە ڕایکردوە و پەنای بردۆتە بەر شاخ.( ئاموری بە واتە ناوچەی پشدەرایەتی ) یە.

سەدەی هەشتەمی پ ز ساڵی( ٨٠٠ ) پ ز ئەم سەلمانزارە بە دەستی فەرمانڕەوای ئارارات( سازدۆنیس ) ئەشکێ و ویلایەتی ئۆلۆ ماوەیەك لەژێر دەسەلاتی ساردۆنیس دا ئەمێنێتەوە. لەناوەراستی سەدەی هەشتەمی پ ز دا ویلایەتی زامۆنا ئەکەوێتە ژێر چاودێری( ئاپلیا )ی فەرمانڕەوای یاخی ئاشوورەوە. لە کۆتایی سەدەی هەشتەمدا ئەم ویلایەتە بە( ئۆلۆم ) لەلایەن. ئاشووریەکانەوە ناو براوە[١٢٦]. پاش ساڵی( ٧٨٥ ) پ ز سەلمانازاری سێ یەم بە دوا فەرمانڕەوای بەشی یەکەمی ئاشوور ئەزانری. بەلام بە پێ ی مێژووی( یونان- ئاشوور – کورد )( ساردا ئاپاڵ ) ی کوری بە دوا فەرمانڕوای بەشی یەکەم ئەناسرێ کە لە سەرێکدا لەگەڵ کەیقوبادی کوردا خۆی ئەسووتێنێ. کەیقوباد کە یونانیەکان بە( ئارباس ) ناوی ئەبەن لە ساڵی( ٨٥٣ ) پ ز لە ئەسفەهان لە دایك بووە. لە باسەکانی پێشوواندا باسمان کرد کە کەیقوباد داگیر کەری ئەینەوا بوە. لەناو بەری دەوڵەتی ئاشور کواکساری کوری فەریبەرزیماد بووە

---

[١٢٦] مێژووی ئاشوور ل ٢٤٥ ئولمستێر.

## زنجیرەی دووەمی

## فەرمانڕەوایی ئاشوور

لە ساڵی( ٧٥٤ ) پ ز زنجیرەی بەشی دوەمی فەرمانڕەواکانی ئاشور لە( تەگلات پالازار ) ی دوەمەوە دەست پێ ئەکات[127] ماوەی( ١٥ ) ساڵ بە شەڕوشور و پەل بڵاو کردنەوە خەریك بووە کلدانیەکان و بابلی خستۆتوژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. شاری دیمەشق و وڵاتی سووریای بە تەواوی داگیر کردوە لەگەڵ مادەکانیشدا بەشەڕ هاتووە. نزیکەی( ٦٠ ) هەزار کەسی بەدیل گرتوە و لەگەڵ دەسکەوتێکی زۆری تالانی بردویەتیەوە شاری کالاخ ی پایتەختی. هەندێ لە شارەکانی وڵاتی مادی داگیر کردوە. یەکێك لەسەرداره سەربازیەکانی ئەم فەرمانڕەوایە تا چیای دەماوەند ڕۆیشتوە، ڕای وابوە ئیتر ئەم شوێنە ئەو پەڕی دنیایە. ئەم تەگلات پالازارە کوڕی گەورەی( بلەزیسی ) کلدانیە لە داگیر کەرانی ئەینەوایە بە هاوکار لەگەڵ کەیقوباد دا. ساڵی( ٧٣٠ ) پ ز کوڕی ئەم داگیر کەرە ناودارە( سەلمانازاری چوارەم ) بۆتە فەرمانڕەوای ئاشوور[128]. ساڵی( ٧٢٥ ) پ ز یانی ساڵی پێنجەمی فەرمانڕەوایی هێرشی کردۆتە سەر( شومیرۆن – سومار) ی مەڵبەندی لەدنیا دەرئەچێ.سوپاکەی( سارگۆنی سێ یەم ) بە فەرمانڕەوا هەڵئەبژێرن. کە فەرماندەی گشتی سوپاکە بووە. ئەم سارگۆنەی دوەم کوڕی بلەزیس بووە. مامەی سەلمانازاری مردوو بوە، هەندێ لە مێژوو ناسەکان بەهەڵە( سارگۆنی دوەم ) ناو ئەبەن[129]، پاش سێ ساڵ ئابڵوقەدان و سەرماو گەرماو برسیەتی و دەردی سەری ئەم فەرمانڕەوا تازە توانی( شومیرون – سومار ) داگیر بکات و( هوشع ) ی سەرداری جولەکەکان بەدیل بگرێ. جولەکەکانی( بنی اسرائیل ) ی کۆچ پێ کردوە بەرەو( کەلاخ ) و دەورو بەری( خاپور)و شارەکانی مادو ساڵی( ٧٢٢ ) پ ز لەم شوێنانەدا جێگیر بوون( ٤ ).

( سارگۆن ) دو جار لەگەڵ مادەکانی سەرووی ڕۆژهەڵاتی ئاشور یانی کوردەکانی ئارارات شەڕی کردوە لە جاری یەکەمدا سەرۆکی کوردەکان( دخۆ – دیاکۆ – دیاناکۆ )ی ناو

---

[127] پیرنیا لە لاپەڕە( ٣٧ ) دا بە چوارەم و لە لاپەڕە( ٤٩ ) دا بە سێیەم ناوی ئەبات.

هەندێ لە مێژوو ناسەکان بەهەڵە بە پێنجەم ناوی ئەبەن.

[128] پیرینا لاپەڕە ٣٧، ٤٩، ٦٠

[129] کتێبی دوەم ملوك فەسڵی ١٧، ١٨. پیرنیا، ئێرانی کۆن( ملل قدیمه مشرق ).

بوون. فیردەوسی( غو – دنو ) ی ناو بردوە بەدیل گرتوە ڕووەو شام ناردوویەتی ساڵی( ٧١٥ ) پ ز( ٤٨٢٠ ) کەس لەناو داران و پیاوماقوڵانی کوردی ڕووەو شام ڕاگوێزاوە. جاری دووەم هێرشی هێناوەتە سەر خاکی کوردستان و کوردەکانی خستۆتە ژێر چاودێری خۆیەوە ساڵی( ٧١١ ) پ ز( ٤٥ ) کەسی لە سەرداران و سەرۆك هۆزەکانی کورد چوونەتە دەرباری سارگۆن و بە خواوەندی خۆیانیان داناوە. بڕیاریان داوە کە باج دەروملە کەچی ئاشوور بن و چی تر سەر بۆ فەرمانڕەوایانی ماد دانەنەوێنن.( هەمبانیگاس ) ی فەرمانداری شاری شوش کە لە ژێر سایەی سارگۆندا ئەژیا لێ ی هەڵگەڕایەوە بەنیازی سەربەخۆیی، سارگۆن لەم هەڵوێستەی( هەمباسنیگاس ) شێت گیر بوو، هێرشی کردنە سەرو جارێکی تر گەڕاندنیەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی. هێرش و پەلامار دانی ئەم کابرایە بۆ سەر فەرماندارەکانی دەورو بەری بەردەوام بوو. دۆستی بۆ خۆی نەهێشتەوە. هەوڵی دروست کردنی قەڵایەکدا لە( ١٥ ) کیلومەتری( نەینەوا ) لە کە ناری ڕووبارێکی بچووکدا بەناوی خۆیەوە( دورساریگونی ) دروست کرد. ساڵی( ٧٠٦ )پ ز هەموو دەربار و سەرداران ودەست و پێوەندی خەزێنەی بردە قەڵاکە. پاش ساڵێك پشوودان لە قەڵاکە پاش کوژرانی سارگۆن( سەنحەریب ) ی کوڕی لەلایەن باوکیەوە کرابوە فەرمانداری بابل. گەڕایەوە وڵاتی ئاشووری فەرمانڕەوای کرد ساڵی( ٧٠٥ ) پ ز. سەنحاریب بە پیچەوانەی باوکیەوە دەستی کرد بە دروست کردنەوە و ڕازاندنەوەی شاری نەینەوا، دیوارێکی بە دەوری شاردا دروست کرد و لە پشتی دیوارەکەیشەوە خەندەقێکی پان و قوڵی لێ دا بۆ پاراستنی شار. مێژوو ناسەکان ئەڵێن ئەم دیوارە( ٢٠ ) فرسەخ ماوەی بووە، پانتایی دیوارەکە( ١٦ ) مەترو بەرزایی( ٥٠ ) مەتر بووە. گەلێ کۆشك و تەلارو باخی تیا ڕازاندۆتەوە. لەبریتی کۆشکە کۆنەکەی سەرڕووبار کۆشکێکی تازەو فراوانی دروست کرد کە ماوەی( ٢٠ ) هەزار گەزی چوار گۆشە بووە. لە کتێبی هۆزەکانی ڕۆژهەڵات ل( ١٥٣ ) دا چاپی دووەم هاتووە " سەنحاریب لەگەڵ پاشای( کاردۆنیا ) کە کلدانیەکانیشی لەژێر دەستا بووە شەڕێکی سەختی کردوە و بەسەریاندا سەرکەوتوە. دیسانەوە هێرشی کردۆتە سەر بابل و داگیری کردۆتەوە و دانیشتوانەکەی بە دیلی لەگەڵ خۆیدا بردوە.

لەوەو پێش باسمان کرد کە دەوڵەتی کاردۆنیا لەسەردەمی( تەگلات نین ) شاهەنشای بابل و ئاشوور لەناو چووە،کوردەکانی کاس گەڕانەوە بۆ زاگرۆس.لێرەدا بۆمان دەر ئەکەوێ کە جارێکی تر( کوردەکان ) دەوڵەتی( کاردۆنیا ) یان زیندوو کردۆتەوە. پاش گەڕانەوەی سەنحاریب لە بابلەوە بۆ ئاشوور دیسانەوە دەوڵەتی کاردۆنیا بابل داگیر

ئەکەنەوە[130]، داگیر کردن و پەل بڵاو کردنەوەی ئەم پیاوە لە میسری خواروو سوریاو بابل و عیلام بەناوبانگە. سەرداران و پیاو ماقوڵانی عیلام( کرۆر ناخونتا ) بە پاشایەتی عیلام هەڵئەبژێرن.کاتێ سە نحاریب هێرش دەباتە سەر عیلامەکان – ناتوانێ بەرگری ئەم هێرشە بکات و لە ترسا هەڵدێت و خۆی لە کوێستانەکاندا حەشار ئەدات. ئەم هەڵوێستە ترسنۆکانەی( کدۆرناختنا ) کار دەکاتە سەر دانیشتوانی عیلام و ڕقیان هەڵدەستێنێ. بۆیە هێرش دەبەنە سەری ئەیگرن و لە ساڵی( ٦٩٢ ) پ ز دەیکوژن و ناومان میناتو ) لە شوێنی دائەنێن. ئەم سەرکردە تازەیەی عیلام پیاوێکی ئازاو بە سەلیقە بووە دەستی هێناوە بە سوپای عیلامدا و بە هێز و دەستەڵاتی کردوە. هاو پەیمانێکی دۆستایەتی و سوپایی لەگەڵ بابلیەکاندا بەست دژی ئاشووریەکان( ئارساهادون ) ی کوڕە بچووکی سە نحاریب ساڵی( ٦٨١ ) پ ز[131] دەبێتە فەرمانڕەوای ئاشوور. لەم سەردەمەدا میسریەکان هەوڵی ڕزگاری ئەدەن. ئاشکرای سەر پێچی فەرمانداریە ئاشووریەکان بڵاوئەکەنەوە لێرەدا( عیلامەکان ) یش سوود لەم سەر پێچیە وەرئەگرن.( خومبان کالداش ) ی دووەم فەرمانڕەوای شوش ساڵی( ٦٧٤ )پ ز دەستی بەسەر بابلدا گرتوە تا شاری( سیپ بار )ی داگیر کردوە، لەگەڵ خۆیدا هەرچی دەسکەوتی ئەختینە بووێت بردوویەتیەوە بۆ شاری( شوش ). پاش ماوەیەك ئەمیش ئەمرێت و " ئورتاگو " دەبێتە فەرمانڕەوای عیلام.( تارسا هادون ) لە ساڵی( ٦٧١ ) پ ز والآتی میسر داگیر ئەکات، خۆیشی ناو ئەنێ( فەرمانڕەوای فەرمانڕەواکانی میسر ) و لە نێوان( ٢٠ ) پاشادا دا بەشی ئەکات ئەوانیش مل کەچی ئەبن. ئەم( تارساهادون ) ە دەوڵەتی ئاشووری گەیاندۆتە ئەوپەڕی دەسەلآت و هێز، جگە لە دەوڵەتی عیلام دەوڵەتێك نەبووە لە ڕۆژئاوای ئاسیادا لە ژێر سایەی ئاشووردا نەبوو بێت. لەم سەردەمەدا گشت فەرمانڕەوایانی وڵاتی ئێران دەست نیای وڵاتی ئاشوور بوون. پاش ئەوەی لەژێر دەسەلآتی ئاشوور دەرچوون بونەتە ژێر دەستەی دەوڵەتی( ماد )، یانی فەرمانڕەوایانی هاخامە نشینیەکانیش دەست نیای مادەکان بوون[132].( ئورتاگو )ی فەرمانڕەوای عیلام بە ناچاری پەیوەندی دۆستایەتی

---

[130] ( لەبەشی ١٨، ١٩ کتێبی دووەم ملوك ) و کتێبی دوەم مێژوی ایام مشرق قدیم – بەشی ٢٢ چاپی دوەم( ٤٤، ١٢٦، ١٥٢، ٢٩٠، ٢١٢ ) دا بە درێژی باس ژیانی سە نحاریب ئەکات.

[131] پیرینا لە لاپەڕە ٣٩ تا ٤٩ ی ئەم باسەدا ساڵی( ٦٧٤ ) پ ز نووسیوە.

[132] پیرینا لاپەڕە( ٦٠ )

لەگەڵ ئاشوور بەستووە بەڵام هێندەی پێ ناچێ لە دنیا دەرنەچێ براکەی( تیومان ) بۆتە جێگری. ئەمیش ساڵی( ٦٥٩ ) پ ز لە شەڕێکی گەورەدا کە بە شەڕی( تولیز ) بەناوبانگە لەگەڵ ئاشوورییەکاندا بریندار ئەبێت و ئەگیرێ. لە پاشدا سەری ئەبڕن و کەللە سەرەکەی ئەبەنەوە شاری نەینەواو بەسەرە نێزەکەوە بە یەکێك لە دروازەکانی شاردا هەڵی ئەواسن[١٣٣]. پاش کوژرانی( نورتاگو ) کورە گەورەکەی( خومبان ئایگاش ) لەلایەن فەرمانڕەوای ئاشوورەوە دەکرێتە فەرمانداری عیلام. پاش ئەوەی( ئارسا هادون ) پیر ئەبێت و کەڵکی فەرمانڕەوایی لێ ئەبڕێت ئەچێتە شاری بابل و فەرمانڕەوایی ئەداتە دەست( ئاشور پانیپال ) ی کوڕی کەبەدوا دەسەڵاتداری ئاشورییەکان ئەژمێررێ لە مێژوودا. ئاشوربانیبال ساڵی( ٦٦٨ ) پ ز دەسەڵاتداریەتی وڵاتی ئاشوور لەباوکی وەرئەگرێ ساڵی( ٦٤٥ ) پ ز هێرشی کردۆتە سەر عیلام و دەستی بەسەرا گرتوون.( خومبان ئایگاش ) و( تام ماریتو )ی ڕا ئەکەن و پاش هەوڵ و گەڕانێکی زۆر هەردووکیان ئەگرن و ئەیانبەستن بەدوای عەرەبانەی ئەسپی یەوە تائەمرن. دەوڵەتی عیلام بەم داگیر کردنە بە تەواوی تێك ئەشکێ و بۆ هەمیشەیی لە لاپەڕەکانی ڕۆژگاردا ناویان ئەسڕێتەوە لە کۆشکەکەی( ئاشوربانیبال )دا بە نیگار شێوەی داگیر کردنی شاری شوش هەڵکەنراوە کە چۆن دیلەکانیان بەزیندوویی پێست کەند کروە. هەر بەزیندوویی چاو و نینۆکیان دەرهێناون و لە پاشدا گوێچکە و ڕیشیان بڕیون. ئاشورپانیپاڵ جگە لەوەی کۆتایی بە دەوڵەتی عیلام هێناوە چەندین شوێنی تری داگیر کردوە. دەستی لە جوانکردن و ڕازاندنەوەی شاری نەینەوا هەڵ ئەگرتوە کۆشکەکەی سەنحارییی تازە کردۆتەوە و چەندین تەلاری تری تیا دروست کردو نووسینەکانی سەردەمی( سارگۆنی یەکەم ) کە لە پەرستگای( ئاروخ )دا جێ مابوو هەموو ئەخشەکانی تازەکردەوە. هەرچی تابلۆی تری ئاشورییەکان هەبوو تازەی کردەوە. ئاشورپانیپال – کتێبخانەیەکی گەورەی لە کۆشکەکەی( سەنحاریب ) دا دروست کرد. کە زیاتر لە سەد مەتر پان بووە. ئەو نووسینانەی لەسەر خشتەکان نووسراون نزیکەی( ٥٠٠ ) بەرگ کتێبی ئەمڕۆ ئەبن بە مەرجێك هەر بەرگێك( ٥٠٠ ) پەڕە بێت. پاش( ئاشورپانیپال )( ساراکوس ) ی کوڕی بۆتە جێ نشینی. منداڵێکی تازە پێگەیشتوو بوە. هێشتا چاو و گوێ ی بە جیهانی شەڕدا نەکرابوە و کەوتە بەر هێرش و پەلاماری( کواکسار )ی فەرمانڕەوای ماد.

---

[١٣٣] ملل قدیمە مشرق ل( ١٥٥ ) چاپی دوەم. پیرینا ل ٤٠.

## فەرمانڕەوایی

### تازەی کلدانیەکان

( تاپۆپۆلاسار ) ی فەرمانڕەوای بابل کە لە لایەن دەوڵەتی ئاشوورەوە دانرابوو لە ساڵی( ٦٢٦ ) پ ز دەست بەسەر تەخت و تاج و فەرمانڕەواییدا ئەگرێت. فەرمانڕەوای بە دەسەلاّت خاوەن هێزی( ماد )( کواکسار ) لە ساڵی( ٦٢٢ ) پ ز وڵاتی مادی گەیاندۆتە ئەو پەڕی هێزو توانا ودەسەلاّت ئەم پاشایە پەیمانێکی ئاشتی و دۆستایەتی لەگەڵ (ئاپۆپۆلاسار ) ی کلدانیدا ئەبەستێ و( ئامیَ تس ) ی کچی ئەدا بە( ئابوڵد نزر )( بەخت ئەسر ) ی کوڕی. هەردوو سوپای مادوکلدانی ساڵی( ٦٠٩ ) پ ز ڕوو ئەکەنە وڵاتی ئاشوور و پاش سێ ساڵ شەڕو ئابلۆقەدانە لە ساڵی( ٦٠٦ ) پ ز دا شاری ئەینەوا داگیرو ویران ئەکەن پاش ئەوە( ساراکوس ) ی کوڕی ئاشورپانیبال )ی ئاشووری ئەزانێ تازەکار لەکار ترازاوە و سوپای دوژمن ئەینەوای کاو لکردوە ئەمیش بە خۆی و دارو دەستەو خاو و خێزانەوە ئاگری بەردایەە قەلاّکە و هەموویانی تیا سوتاو کۆتایی بەشەڕ هات. داگیر کەرانی وڵاتی ئاشوور خاکەکەی بەم شێوەیە لە نێوان خۆیاندا بەش ئەکەن : بەشی ڕۆژهەلاّت و سەرووی دیجلە بەر مادەکان ئەکەوێت ئەوی تری ئەمێنێتەوە بۆ کلدانیەکان.( ئاپۆپۆلار ) ی کلدانی نێوان دیجلە و فورات و هەموو ویلایەتەکانی دەوروبەری داگیر ئەکات فەرمانڕەوایانی( فینیقی و سووریا ) ئەخاتە ژێر دەستی خۆی، کوڕەکەی بە سوپایەکەوە ئەنێرێتە ئەو ناوچانە بۆ سەندنی باج و دەست بەسەرا گرتنی کۆشك و تەلارەکانی بابل بەلاّم لەبەر پیری و تەمەن درێژی ئەیتوانیوە هەموو کارەکانی بە ئەنجام بگەیێنێ لە ساڵی( ٦٠٤ ) پ ز لە دنیا دەرچووە. باوکی( تابوە کەدنەزەری ) دوەم زاوی( کواکساری مادی ) ئەبێتە فەرمانڕەوای بابل. لە کاتی مردنی باوکیدا لەگەڵ( ئەخانو )ی فەرمانڕەوای میسردا ئەبێتە شەڕیان و لەنزیك فورات تێکی ئەشکێنێ و بەسەریدا زاڵ ئەبێت. ئیتر بە پەلە ئەگەڕێتەوە شاری بابل و کاروباری دەوڵەتی کلدانی ئەگرێتە ئەستۆ[1].ئازایەتی ئەم پیاوە وەك داگیرکردنی وڵاتان و سەرکوت کردنی هۆزەکان و وێران کردنی( بیت المقدس ) و ڕاگۆیزانی جولەکەکان لە ساڵی( ٥٩٧ )دا پ ز لە

---

[1] دانیال پێغەمبەر هاوچەرخی ئەم فەرمانڕەوایە بووە.

کارەمێژووییەکانی ئەمێرێت. ئەم شاهەنشایە لە ئاسیادا بە داگیر کەر ناوی دەرکردبوو، یونانیەکان ئەڵێن.( تابوکەدنەزەر) بە هێزو توانای سوپاکەی توانیویەتی ئەوروپا داگیر بکات و تاوەکو( هەرکول) یانی( جبل گارق) ڕۆیشتووە. هەندێ سەرچاوەی مێژوویی ئەڵێت( بەخت نەسر - تابوکەدنەزەر) - فەرماندەی سوپاکەی بەهمەن بووە، یاخود ئەڵێن فەرماندەی سوپای کەیقوباد[۱۳۵] بووە. لەوە ئەچێ( کوردنەزەر) بە( گۆدەرز) تێکەیشین. چونکە( مێژووی تەبەری) چاپی لێدن بەرگی دووەم ل ٦٤٩ و سرجان ملکم بەرگی یەکەم ل ٢٥، ٢٦، ١٠٥. گۆدەرز بەکورد نەزەر ناو ئەبەن یانی کوڕی کورد نەزەر[۱۳٦] جگە لەوەی بابل یەکێك بووە لە شارە هەرە ناودارەکانی جیهان بەخت نەسر بە پەرەپێدان و ئاوەدان کردنەوەی ولاتی کلدەوە خۆی خەریك کردووە. بابل بەسەر هەردوو بەری فوراتدا بەش بووە دیوارێکی چوار گۆشەیی کە درێژی( ٦٠ ) کیلومەتربوە. درێژی هەر لایەکی( ١٥ ) کم بوە بە چوار دەوری شاردا کێشراوە دەورەی دیوارەکەش بە خەنەکێکی قووڵ و پان دەورە دراوە کەس توانای چوونە سەر دیوارەکەی نەبووە، ئەو گڵەی لە خەندەقە ە دەریان داوە لەگەڵ قیر تێکەڵیان کردوە و خشتیان پێ دروست کردوە و دیوارەکەیان پێ هەڵچنیوە. بەرزایی دیوارەکە( ٩٥ ) مەتر بووە. پانتاییەکەی( ٢٥ ) مەتر بووە. دوو عەرەبانە بە ئاسانی بەسەریا هاتوچۆی کردوە. ئەم دیوارە( ٢٥٠ ) بورجی لەسەر دروستکراوە هەر دوو بورج بەیەکەوە دروست کراون[۱۳۷].شاری بابل( ١٠٠ ) دەروازەی گەورەی تیا بووە هەمووی لە( برونز) دروست کراوە ڕوباری فورات بە ناوەڕاستی شارەکەدا ڕۆیشتووە. چەند سەدێکی گەورەی بەخشت لێ دروست کراوە، پردێکی گەورەیان لەسەر رووباری فورات دروست کردوە. لەداری گەورەی چوار پالۆ.

---

[۱۳۵] ابن خلدون لە( العبد) داو مەسعودی لە مروج الذهب دا وابن اپیر لە تاریخ الکامل وتاریخی سیستان ل ٢٤ و هتد.

[۱۳٦] دەربارەی ژیانی بەخت نەسر لە کتێبی دوەم ملوك فەسلی سێ( ٢٤، ٢٥ ) بە درێژی باسکراوە.

[۱۳۷] وەك باسمانکرد دیواری. ناوبراو لە سەردەمی( شمارەمێ )ی فەرمانڕەوای بابل دا بە( ٧٠ ) هەزار مەتر دەورە دراوە پانتایەکەی( ٦ ) عەرەبانەی پەهلەوی بووە.( ملل قدیمە مشرق )ل ١٣.

هەموو شەوێك سەقفی ئەم پردەیان بەرز کردۆتەوە و بە ڕۆژ دایان داوەتەوە. یانی بەشەو هاتو چۆی ئەمبەرو ئەمبەری فورات نەبووە. باغ و بێستان و میوەی زۆر لەشاردا بووە، لە کاتی ئابلووقەدانی شار لە لایەن دوژمنەوە بەشی دانیشتوانی شاری کردووە. کۆشکی فەرمانڕەوای شار لای چەپی فوراتەوە بوون. بەخت نەسرلە دەست نووسێکی خۆیدا ئەڵێت : " لەبەر ئەوەی مەردوخ خوای منە، منی بە فەرمانڕەوایی گەیاندوە، منیش زۆر بە دەوڵ و کۆشش توانیم دەست بکەم بە دروستکردنی شارو ئاوەدان کردنەوەی بابل. وەك گلێنەی چاوەکانم پارێزگاری ئەکەم. توانیم کۆشکێکی تیا دروست بکەم کە جێگای سەر سوڕمانی هەموو خەڵکی ئەم دنیایە بێت. مەڵبەندی فەرمانڕەواییم بردە بابل ئەو کۆشکەم لەسەر سەکۆیە دروست کرد، کەوتۆتە کەناری فوراتەوە. شارەکەی باوکم( ناپوپولاسار) کۆشکەکەی لە خشت دروست کراوە بەڵام بەهۆی لافاوی گەورەی فوراتەوە ئەم کۆشکە لە بنەڕەتەوە تێك چووە، توانیم کە لاوەکانی پاك بکەمەوە و گەیشتمە بنەڕەت و کەناری فورات ئەو کاتە بەربەستێکی بەرزم لە خشت و گل و قیر دروست کرد. ئەم بەستەم وەکو بەرزی چیایەك دروست کردوە ئەو کاتە کۆشك و تەلارەکانم لەسەر دروست کرد ". لە نزیك کۆشکەکەو. لە کەناری ڕووباری فوراتدا باخچە هەڵواسراوەکانی دروست کرد. ئەڵێن شاژنی کورد( ئامێ تس) دڵی بە وڵاتی گەرم دانەئەهات.( بەخت نەسرا)[138] لە سەر ئاستی وڵاتی کوردان ئەو باخچەیەی ڕازاندەوە تەنها بەجێ هێنانی ئارەزووی شاژن بەخت نەسر لە ساڵی( ٥٦١) پ ز لە دنیا دەرچووە. پەرستگای( مەردۆخ) کە بە گەورە ترین پەرستگای بابل ئاسراوە لە دروست کراوەکانیەتی.

---

[138] وەك لە باسەکانی پێشودا وتمان لەلایەن( شەمیرامێ)وە دروست کراوە. دیارە بەخت نەسر تازەی کردبێتەوە وەك کۆشك و تەلارەکانی تر.

# لەناو چوونی دەوڵەتی بابل

پاش لەدنیا دەرچوونی( بەخت نەسر ) ئەو کەسانەی فەرمانڕەواییان کردوە، کارەکانیان ئەوەندە گرنگ و بایەخدار نەبووە کە جێگای باس و خواستی مێژوو نووسان بێت چوارەمین جێ نشینی( بەخت نەسر ) کە لەبنەماڵەی ئەوان نەبووە. پیاوێکی بازرگان بووە بە ناوی( نابونائید – نابو ناهید )ساڵی( ٥٥٥ ) پ ز فەورمانڕەوای بابلی وەرگرتوە و چەند پەرستگایەکی ئەو شارەی تازە کردۆتەوە. کورشی گەورە ساڵی( ٥٣٨ ) پ ز هێرشی کردۆتە سەر بابل و بەسەر( نابونائید )دا زاڵ بوە و بەدیل گرتویەتی. شاری بابلیەی وەك شاری نەینەوا کاول کردوە و وڵاتی کلدانی کردوە بە بەشێك لەئێران. ئەوە بەشێکی کورت بوو لە مێژووی کلدان و ئاشوور و عیلام کە پەیوەندیان بە مێژووی کورد و مادو پارسەوە بووە.

# پێك هاتنی دەوڵەتی ماد

جیاوازی لە نێوان ڕای مێژوو نووسەکاندا دەربارەی پێك هاتنی دەوڵەتی ماد زۆرە. هەندێکیان( ئاریاس ) یانی کەیقوباد بە دامەزرێنەری دائەنێن و هەندێکی تر( کواکسار). بەشێکی تری مێژوو نووسان( دریائاکو ) وچەندی تریان( دیوکس ) بە دامەزرێنەری ئەناسن. بەڵام ئەوەی تاکو ئێستا گەیشتۆتە دەستمان و زیاتر جێگای باوەڕە و زۆربەی مێژووەکانی وەك( ملل قدیمه مشرق، مێژووی هەورامان، جاماسنامە، مێژووی ئاشوور، یونان، کوند ) هەموویان دان بەوەدا ئەنێن کە( نینە )ی فەرمانڕەوای کلدان و ئاشورلە سەدەی( ٢١ ) پ ز لەگەڵ دەوڵەتی ( ماد )دا بەشەر هاتوە و بە سەریاندا زاڵ بووە. لێرەدا ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێ کە( ٢١ ) سەدە پێش زاین دەوڵەتی ماد بوە و فەرمانڕەواییان کردوە دەوڵەتی ماد پێش لە دایك بوونی( توس و دخو کواکسار و کەیقوباد ) هەبوە و خاوەنی دەسەڵات و پادشای خۆی بووە. لێرەدا گومان نامێنی کە دەوڵەتی( ماد ) زۆر پێش سەدەی( ٢١ ) پ ز پێك هاتووە. لەگەڵ فەرمانڕەوای کلدان و ئاشور بەشەڕ هاتوە و بەسەریا زاڵ بوون. ئەو پرسیارەی خۆی ئەسەپێنی : ئەی کێ یە دامەزرێنەری دەوڵەتی ماد ؟ کەی ئەم دەوڵەتە پێك هاتووە ؟ ئەگەر تۆزێك بە وردی سەرنجێکی سەردەمی سارگۆن بدەین ئەبینین لەسەردەمی ئەودا یانی( ٢٨٠٠ ) پ ز دەوڵەتی ماد بوون. کەوابوو مادەکان پێش سەدەی( ٢٨ ) پ ز بوون و لە وڵاتی مادا جێگیر بوون. لەو ئەچێ ئەو فەرمانڕەو مادیانەی کە باسمانکردن هەر یەکەیان بە دەوری خۆی دەستی لە تازەکردنەوەی دەوڵەتی مادا بووبێت. ئەوەی گرنگە ئەوەیە بزانین بە تەواوی کام یەك لەمانە بە تازەکەرەوەی دەوڵەتی ماد ئەژمێررێ. لە سەدەمی فەرمانڕەوایی( تەگلات نین ) فەرمانڕەوای ئاشوور ساڵی( ١٢٧٨ ) پ ز( توس یاتوسە ) یاخود وەك یونانیەکان ئەڵێن( دیوکس ) فەرمانڕەوای بەشێك لە مادەکان بوو لە ناوچەی( بەڵخ ) دا. باقی مادەکانی تری وڵاتی ماد باج دەری دەوڵەتی ئاشوور بوون. هەموو وڵاتی عێلام و بەشێك لە پارسەکان و هەموو کوردەکانی زاگرۆس و ئارارات لە ژێر چاودێری دەوڵەتی ئاشووردا بوون و باجیان داوە. بەم شێوەیە ناتوانین بڵێین نوسە تازەکەرەوەی دەوڵەتی مادە. بەڵام( دخو یا( دگو ) یا( دیاکۆ ) سەرۆکی بەشێك لە کوردەکانی زاگرۆس بووە لە سەردەمی سارگۆنی سێ یەم لە ساڵی( ١٧١٥ ) پ ز لەگەڵ ئاشووریەکاندا شەڕی کردوە و تێك شکاوە و بەرەو( شام ) دوور

خراوەتەوە پاش دوور خستنەوەی هیچ دیاردەیەکی پیاوەتی لەم کابراوە نەبوە تاوەکو بە تازە کەرەوەی دەوڵەتی مادی. ئەمێنینەوە سەر( کواکسار ) و( کەیقوباد ) ئەبیت یەکێك لەم دوو سەردارە تازەکەرەوەی دەوڵەتی ماد بن.( نابۆپولاسار ) ی فەرمانڕەوای بابل بە هاوکاری کواکسار هێرشیان کردە سەر دەوڵەتی ئاشوور و لە ناویان برد. لێرەدا ئەتوانین بڵێین پێش کواکساریش دەوڵەتی ماد خاوەن دەسەلاّت و هێز بوە بۆیە بابلیەکان پەیمانیان لە گەڵدا بەستوون و بڕوایان پێ ی هەبووە بۆ لەناو بردنی ئاشوور. ئەمەش لەوە ئەچێ پاش ڕووخاندنی دەوڵەتی ئاشوور سەر لە نوێ دەوڵەتی ماد تازە کرابێتەوە و برەوی پێ درابێ. کەوابوو ناتوانین کواکسار بە تازەکەرەوەی دابنێین. چونکە پێش ئەم( فەرییەرزی ) باوکی پادشا بووە. بە ویراسەت پاشایەتی وەرگرتوە بۆیە بە تازەکەرەوە ئەژمێررێ. تەنها کەسێك کە پێویستە تۆزێك بە وردی سەرنجی بدەین بەچاوی ژێریەوە لێ ی بکۆڵینەوە( کەیقوباد ) ە. کە لە چەندین شوێنەوار و مێژوودا باس کراوە وەك مێژووی کورد و یونان و.. هتد. جێ ی گومان نی یە( هێردۆت ) ئەڵیت کەیقوباد دامەزرێنەری دەوڵەتی( کیان ) ی یە کەوابوو ئەتوانین بڵێین پێش ئەوەی مادەکان لە ڕۆژهەلاّتەوە بەرە و ژووروی ڕۆژئاوای ئێران بێن و لەم شوێنانەدا جێ گیربن لە سەرەتاوە تا دەورو بەری سەدەی( ١ ) پ ز ئەمانە بە کۆمەڵ ژیاون. هەر کۆمەڵەش خاوەنی سەرۆکێکی تایبەتی خۆی بووە. کەبە ئاژەڵ داری و مەڕ و ماڵاّت بەخێو کردنەوە خەریك بوون. تا سەرەتای سەدەی( ٢١ ) پ ز هیچ دیاردەیەکی ڕامیاری و یەك بوون لەمانەوە دیار نی یە. ج لە پێش سەردەمی( پێش دادیە کانەوە ) یانی( ٣٢٤١ ) پ ز و ج لە دوای ئەمانیشەوە تاوەکو سەردەمی( نینە )ی فەرمانڕەوای کلدو ئاشوور یانی سەدەی( ٢١ ) پ ز بەلاّم کوردەکانی بەشی ئارارات( ٣٧ ) سەدە پێش زایین یانی( ٣٧٠٠ ) ساڵ پ ز دەستیان کردوە بە جوڵاندنەوەی سیاسی لەگەڵ( شومێرونەکەد ) و( عیلام ) بەگژ یەکدا چوون لێرەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە تاوەکو ئەم کاتە( ماد )ەکان بەرەو ڕۆژ نەهاتوون. ئەگەر هاتبێتیشن خاوەنی فەرمانڕەوایی نەبوون. لەوانەیە لەژێر چاودێری پێشدادیەکاندا بووبن. یاخود بەشێوەی خێڵەکی ژیاون و جیا جیا سەرۆکی تایبەتی خۆیان هەبووە.( ئەم ڕایە لە ڕاستی یەوە نزیکترە )، بۆیەکە مجار لە سەدەی( ٢١ ) پ ز ناوی( ماد ) پەیدا بووە لە سەدەی( ١٣ ) پ ز لەژێر فەرمانڕەوایی( توسە ) لە شاری بەڵخ ) دەوڵەتێکی بچووکی مادی هەبووە کە

باجی بە ئاشووریەکانیش نەداوە. لە سەدەی نۆهەمی پێش زاینیدا بەرە بەرە ناوی ماد کەوتە ناو نووسینەکانی ئاشوورەوە، وشەی( ماد ) دوو دڵی و ترسی خستە دڵیانەوە پاش لەدنیا دەرچوونی( گرشاسب ) ی فەرمانڕەوای پێشدادیەکان ساڵی( ٩٠٢ ) پ ز وردە وردە ئاشووریەکان دەستیان کرد بە پەلامار و هێرش بردنە سەر وڵاتی( مادوپارس ) ئەمانیش ناچار بوون کە دەوڵەتێکی یەک گرتووی بە دەسەڵات دژی ئاشووریەکان پێک بهێنن. وەکو باسمان کرد تاکو ئێستاش هەردوو نەتەوەی مادوپارس بە شێوەی کۆمەڵی گەورەو بچووک بە جیاواز هەر یەکەیان لەژێر چاودێری سەرۆکێکدا ژیاون. مێژوو نووسی یونانی بەناوبانگ( ئەکترس یاس ) ناوی فەرمانڕەوایانی مادی بەم شێوەیە باس کردوە( ئاریاس - کەیقوباد ). ٢- ئاستی باراس ٣- هەشتی پورش ٤- ماندوسس - ماندوشی کە پیرینا لەل ٥٠ ی کتێبی ئێرانی کۆن( مانوداکس )ی نووسیوە ٥- مەنچییک ٦- سوزار موسی ٧- ئەسپادا( ئەسپاداس( پیرنیا ئەسپەنداسی نووسیوە ) ٨- ئارتیکا( ئارنیکاس ) ٩- ئاشکەش( پیرینا ئەستیکاس ی نووسیوە ١٠ - ئاریبان - ئاریبانس ١١- ئارمی - ئارمیس ١٢- ئارتوز - ئارتوس پیرنیا ئارتابوس ی نووسیوە ١٣- پارسوەند - پارسوناراس ١٤ - ئارتین - ئارتینیس ١٥ - ئارزەنگ. ئەمانە زیاتر لە( ٥٠ ) ساڵ بەشێوەی( ملوك الگوائف ) ژیاون. هەروەها( هێرۆدۆت ) ناوی هۆزەکانی( پارس ) ی بەم شێوەیە بردوە : ١- پاسا کاردی ٢- مەرخی ماراخی ٣- ماسپیانی ٤- پانتالی ٥- دروزی ٦- ژەرمەن ٧- ساگارتی ٨- مەردی( ماردی ) ٩- دروپیك ١٠ - داران.

تێ بینی : - لە ژمارە یەکەوە تاوەکو حەوتەم ئەمانە هەموویان شاری دێ نشین بوون لە حەوتەمەوە بۆ دەیەم هەموویان چادر نشین و کۆچەر بوون. کرشاسب کوری وێشتاسب کوری تەهاسب کوری مەنجور کوری فەرمیدوون. کوری ئەپەتیان کوری جەمشید دوا فەرمانڕەوای پێشدادیەکان بووە. پاش لەدنیا دەرچوونی ئەم گرشاسبە دەوڵەتی مادو پارس بێ سەرپەرشت و سەرگەردان مانەوە کەسێك شیاوی فەرمانڕەوایی بوویێت لە زنجیرەی پێشدادیەکاندا نەبووە تەنها( ئەفراسیاب ) نەبێت ئەویش لە وڵاتی( توران ) دا بوو. بەهۆی کرداری ناشیرین و بەد خوویییەوە هۆزەکانی( زابلستان و کابلستان ) بە فەرمانڕەوایی قایل نەبوون و نەفرەتیان لێ کرد. لێرەدا هۆزەکانی مادوپارس دەستەوسان نەوەستان بڕیاریان دا کەیەك بگرنەوە بۆ ئەوەی کەیقوبادی کوردیان

هەڵبژارد بە فەرمانڕەوا کە پیاوێکی زیرەك و ئازا و ژیر و لێ هاتوو بوو. لەئەنجامی ئەم ڕاپەڕینە شۆڕشگێڕانەدا کۆتایی دەستی بە دوازنجیرەی پێشدادیەکان هات . لێرەوە زنجیرەی ( کەیانی ) لە سەر بە دەستی کەیقوبادی کوردەوە دەستی پێ کرد. زۆربەی مێژوو ناسەکان زنجیرەی( کەیانی ) بە دووەم بەشی فەرمانڕەوای ئێرانی دائەنێن لەبەر یەك گرتوویی و هاوپەیمانیەتی مادو پارس. بەلأم لە ڕاستیدا زنجیرەی کەیانی زنجیرەیەکی کوردی مادی یە کە بە درێژی باسی ئەکەین.

## بەندی چوارەم

### دەربارەی فەرمانڕەوایانی ماد

### فەرمانڕەوایی کەیقوباد: -

پاش ئەوەی گرشاسب دنیای بەجێ هێشت، ولآتی مادو و پارس بێ سەرکردە و سەرپەرشتکار مایەوە. ماوەیەك هێرش و پەلاماری یەك لە دوای یەکی(سەلمانازار)ی ئاشوری و چاو برینە خاکی مادو پارس هانی ئەم دوو نەتەوە گەورەیەی دا کەمشوورێکی خۆیان بخۆن و لە ژێر سایەی سەردارێکی ژیر وکارامەدا یەك بگرنەوە. هەموو سەرکردەو سەردار و ریش سپی و پیاو ماقولانی( مادی گەورە و مادی بچووك) هەموو سەرۆك هۆزەکانی( پارس و گێل و خەزەر) لە کۆبوونەوەیەکی فراوان و دوور و درێژدا کە گەلێ بیروڕای جیاوازی تیا هاتەکایەوە. لە کۆتاییدا بە یەك دەنگ بڕیاریاندا کەیقوبادی کورد – کە یونانیەکان بە ئارباس ناوی ئەبەن[139] و سەرۆکی هۆزێکی ماد بووە[140]. بکەن بە فەرمانڕەوای ولآتی ماد وپارس وئازناوی( زالْ)[141] ی دراوەتێ. لەم کۆبونەوە فراوانەدا( ئەفراسیابی تورانی) ئامادە نەبوو بەڵکو بە نامەیەك ئاگاداری کردن بە فەرمانڕەوایی کەیقوباد ڕازی نی یە، بەڵکو پێویستە خۆی بێتە فەرمانڕەوا: هەرچەند ئەم خەڵکی( تووران)ە بەلآم لە دایکەوە دەگەڕێتەوە سەر پێشدادیەکان و ئەم شایستەی فەرمانڕەواییە بە ویراسەت. ئافراسیابی کوری پشتك کوری زادشم کوری تور کوری فەرمیدون کوری ئاپتین کوری جەمشید ی پێشدادی، بەم شێوەیە ئەیویست بچێتە فەرمانڕەوایی مادیەوە

---

[139] یونانیەکان بە فەرمیدونیش ئەڵێن – ئارباس – بەلآم بە کەیقوباد ئەڵێن( ئارباسی کورد)

[140] ئەو هۆزە مادی یە( بوس – بوز) بوە کە لە ناوچەی مازەندەراندا جێ گیر بوون، لەوە ئەچێ کێوی( ئەلبورز) لە( البوز)ە وە هاتبێ. عەرەبەکان( ئەلف و لآمی تەعریفیان بۆ زیاد کردبێ) و بووبێتە( البوز)( هارا) بووە کە لای مادەکان زۆر پیرۆوز بوبە ڕێز بووە. بەیانیان کە ڕۆژهەڵئەهات و ئەیدا لە کێوەکە هەموویان ڕوویان تێ ئەکردو دڵخوش ئەبوون کەخێرو خۆشی ڕووی کردۆتە ولآتی ئێران.

[141] هەر سەرکردە و فەرمانڕەوایەکی بە دەسەلآت کاتێ تەمەنی ئەگەیشتێ و سەری سپی ئەبوو چەند کوڕ و کوڕەزای چاکو ناوداری ببوایە پێ یان ئەوت زالْ. زالْ ئێستاش بە کوردی واتا سەرکەوتوە.

وسەرپێچی کرد[142]. بەڵام لەبەر ئەوەی پیاوێکی بەدخوو بێ سیاسەت و لێ نەهاتوو بووە هەموو هۆزەکانی( مادستان، زابلستان، کابلستان ) بەوە ڕازی نەبوون کە ببێتە فەرمانڕەوا. بۆیە بەیەکجار فەرمانڕەوایی( کەیقوباد ) یان پەسەند کرد. لێرەدا شەڕی( توران ) و( ویران ) دەستی پێ کرد. مەبەست لەئێران( مادەستان، زابلستان، کابلستان ) ە. ئەم شەڕە بەیەکەم شەڕ دادەنرێ کە ڕۆستەم بەرپای کرد[143]. پاش ئەوەی کەیقوباد فەرمانڕەوایی ئەگرێتە دەست بە سوپایەکی گەورەوە ڕوو ئەکاتە وڵاتی( توران ) لەگەڵ سەرداری زابل ڕۆستەم و سەرداری کابل( مهراب ) بە دوو سەرداری مادی یەوە( قارن – کشواد ) بەرابەرکێ ئەکات. پاش شەڕێکی درێژ خایان لە ئەنجامدا پەیمانی ئاشتی ئەبەستن و کەیقوباد[144] لە( بەلخ )ە وە بەرەو ئەسفەهان ئەگەڕێتەوە. ئەم فەرمانڕەوا ژێرە هەموو هۆزەکانی ئەتەوەی ماد و پارسی خستۆتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، سوپایەکی ڕێکو پێك لە سوارەو پیادە پێك ئەهێنێ بۆ بەربەست کردنی هێرشی ئاشووریەکان کۆشکی دەربار و یاساولی تایبەتی کۆشك دائەمەزرێنی. پاش ماوەیەك بە تەواوی هێز و دەسەڵاتی خۆی ئەچەسپێنیی و کاروباری دەوڵەت ئەگرێتە دەست پایتەختەکەی ئەباتە شاری( ئاکباتان – هەمەدان ) گەلێ بیرو ڕای جیاواز هەیە. هەندێ لە مێژوو نووسەکان ئەڵێن. لە لایەن خاتوو( سەمیرامیس – شمارمێ ) وەو ئاوەدان کراوەتەوەو کەیقوباد تازەی کردۆتەوە. هەندێکی تر ئەڵێن نەخێر کەیقوباد خۆیەوە ئاوەدان کراوەتەوە.

لەسەرەتاوە پایتەختی کەیقوباد شاری( ئاسپاهان )[145] بووە لە پاشدا گواستوویەتیەوە شاری هەمەدان. وتەی یەکەم زۆر نزیکە لە ڕاستیەوە چونکە پێش ئەوەی کەیقوباد فەرمانڕەوایی بگرێتە دەست شاری هەمەدان بووە. لە زۆربەی باس و خواستەکانی ئاشووردا ناوی ئەم شارە هاتووە کە پێش سەدەی( ١٢ ) پ ز شوێنی دانیشتنی

---

[142] توور باب گەورەی ئەفراسیابە لەگەڵ( سەلم )ی برای کچەزای زوحاکن بەڵام ئیرەج لە ئیراندەختە ) کە لە ئەوەی تەهو مەرسن

[143] مێژووی سرجان ملکم ل ١٦

[144] مێژووی سرجان ملکم ل ١٦

[145] ئاسپاە کۆی سوپایە کە عەرەب کردوویە بە اصفهان.

مادەكان بووە. هەر بەم بۆنەوە( هەنگمادان ) یانی( شوێنی دانیشتنی مادەكان ) هەنگ بە مانای كۆمەڵ دێت كە مەبەست لە كۆمەڵی مادەكانە. بەرە بەرە بە گوێرەی رۆژگار( هەنگمادان بۆتە - هەمەدان ) بەلاَم وشەی ئاكباتان لە لەهجەی( هاخامە نشینیەكانەوە ) وەرگیراوە. كە ئەمانە لە بریتی پیتی( د ) پیتی( ت ) یان بەكار هێناوە.یانی بۆتە( هەنكماتان ) كە ئەمەش بە تێپەڕ بوونی رۆژگار گۆڕاوە بە( ئەكباتان ) ئەحمەد رەفیق ی مێژوو نووس لە كتێبی( تاریخی عمومی ) جلدی یەك لە بارەی ئێران و مادەوە وەك لەهجەی هاخامەنشینیەكان لە بریتی وشەی( مادای – ئامادای ) وشەی ماتای – ئاماتای بەكار هێناوە.لێرەدا ئەوەمان بۆ ڕوون ئەبێتەوە كە( هەنگمادان ) لە ئاشووری و ئاكباتان لە هاخامەنشینیەكانەوە هاتووە. بەهەر حاڵ ئەوەی گرنگە كەیقوباد بۆ بەربەست كردنی هێرشی ئاشووریەكان ئەم شارەی كردە پایتەختی فەرمانڕەوایانی كورد لە پاشدا بە دوا پایتەختی سەردەمی( ئازیدەیاك ) دەمێنێتەوە. تاكو لە سەردەمی سیروسی گەورەدا داگیر ئەكرێ. ناوی كەیقوباد كە لە دوو بەشی( كەی ) و( قوباد ) پێك هاتووە. كەی بە مانای گەورە دێت. قوباد ناوی خۆیەتی بە زۆربەی فەرمانڕەوایانی مادەوە وشەی كەی لكێنراوە كە بە مانای ڕێز گرتن و گەورەیی دێت وەك : كەیقوباد، كەیا پۆ كەی پشین، كەی ئارمین، كەی ئارش، كەی نیار، كەیكاوس، كەی تارجان، كەی لوهراسب، كەی هشتاسب( كشتاسب )، كەی واكسار، كواكسار... هتد. هەر بەم بۆنەیەوە بە فەرمانڕەوایانی( كیانی ) یانی گەورەو خاوەن شكۆكان ناودار بوون. بەلاَم فەرمانڕەوایانی پارس و پێشدادیەكان هەر بەناوی خۆیانەوە ناوداربوون. كەیقوباد جگە لەوەی كە مادەكانی لە هێرش و پەلاماری مادەكان پاراست وڵاتی( پارس ) یشی هەروا ئەپاراست و هەر دوو نەتەوەكەی لەژێر دەسەلاَت و فەرمانی خۆیدا پارێزگاری ئەكرد. هەموو مێژووەكانی( هێرۆدۆت و شانامە، مێژوی كورد، فارس. تورك. یەك ڕایان لەسەر كەیقوباد هەیە. جگە لەوە ئەبێت( هێرۆدۆت ) ئەڵێت( كەیقوباد بۆ پاراستنی خاكی مادوپارس لە هێرشی ئاشووریەكان پەیمانێكی لەگەڵ( بلەزیس ) فەرمانداری بابل دا بەست ). ساڵی( ٧٦٥ ) پ ز دەوڵەتی تازە پێگەیشتوی ماد بە لەشكرێكی گەورەو گرانەوە كەپێك هاتبوو لە نەتەوەكانی( ماد. پارس، عیلام، كلدە، عەرەب ) كە زیاتر لە( ٤٠٠،٠٠٠ ) كەس ئەبوو رووەو شاری نەینەوا كەوتە رێ. كاتێ( سەردانا پال ) كوڕی سەلمانازاری سێ یەم )

فەرمانڕەوای ئاشوور ئەم هەواڵە ئەبیستێ بۆ بەربەست کردنی ئەم هێرشە بە وسپایەکی گەورەوە دێتە دەرەوەی شاری( نەینەوا ) و ڕوو بە ڕووی ئەم سوپا بەهێزە ئەوەستێ. سێ جار بەیەکدا دێن. هەرسێ جارەکە توانی سوپای کەیقوباد بشکێنێ و زیانێکی باشی لێ بدات.( بلەزیس ) ی فەرماندای بابل کە دەستێکی باڵای هەبووە لە ئەستێرە ناسی دا و تبووی شێوەی ئەستێرەکان وا دەرئەکەوێ ئەگەر تا پێنج ڕۆژی تر سوپای کەیقوباد خۆی بگرێت ئەوا سەرکەوتن بەدەست دێنن و شاری نەینەوا داگیر ئەکەن. سوپاکەی کەیقوباد بڕوایان بەقسەکانی( بلەزیس ) بەتین بوو کە زانایەکی ئەستێرە ناسی بەرزە، بۆیە بەبیرو باوەڕێکی بەهێزەوە هێرش و پەلامارەکانی ئاشوریەکانی بەربەست کرد. ڕۆژی چوارەم هەواڵ هات کە سوپایەکی( ١٠٠ ) هەزار کەسی لە - بەڵخ – ەوە بۆ هاوکاری سوپاکەی کەیقوباد هاتووە[١٤٦]. دوا نیوەڕۆی هەمان ڕۆژ سوپای هاوکار پەیوەندی ئەکات بە سوپای کەیقوبادەوە. ڕۆژی پێنجەم بەیەکجار هێرش دەکەنە سەر شاری نەینەواو ئاشووریەکان تێك ئەشکێنن.( ساردانا پال ) ناچار ئەبێت کە لە قەڵای شاردا خۆی ڕابگرێ و سەنگەر بەندی لە سوپای داگیر کەر بکات. لەبەر ئەوەی شاری نەینەوا زەخیرە و کەل و پەلێکی زۆری تیابوە و زەوی و زاری باشیان بۆ کشت و کاڵ هەبووە توانیویانە ماوەی دوو ساڵ خۆیان ڕابگرن سەرەتای ساڵێکی تەڕو باراناوی دیجلەو هەموو لقەکانی بەشێوەیەك هێرشی لافاو ئەهێنن کە بە تەواوی لایەك لە شاری نەینەوا کاول ئەبێت.سوپای کەیقوباد بەتەواوی شار داگیر ئەکەن و ئەیخەنە ژێر دەسەڵاتیانەوە. کاتێ( ساردانا پال ) ئەزانێ هیچ ڕۆشناییەك نەماوەتەومو توانای بەرگری نی یە. دێنێت هەرچی کەلوپەلی جەنگی و ئاڵتون و پارەو خواردەمەنی هەیە بەخاوو خێزان و دەست و پێوەندەوە لەقەڵاکەدا هێنا بە دوا فەرمانڕەوایی زنجیرەی یەکەمی دەسەڵاتداریەتی

ئاشوورو گەڕایەوە وڵاتی خۆی. دەستی کرد بە پەرە پێدان و چەسپاندنی دەسەڵاتی لە وڵاتەدا. بەو شێوەیە دەوڵەتی مادی گەیاندە ئەوپەڕی سەربەرزی و سەرفەرازی. گەلێ لە زانا( ئالشاریەکان ) ئەڵێن ئەم چیرۆکەی کە یونانیەکان و کوردەکان ئەیگێڕنەوە دوورە

---

[١٤٦] لە جاماسنامەدا نووسراوە ئەم سوپایە بە سەر پەرشتی( ڕۆستەم ) ی زابلی و مهرابی کابلی هاتووە کە لەوەپێش لەلایەن کەیقوبادەوە ئاگادار کرابوون بۆ هاوکاری. بلەزیس بە هۆی زانستی ئەستێرەناسی یەوە گوورو توانای داوە بە سوپاکە.

لەڕاستی و شتی وەها لە مێژوودا ڕووی نەداوە، تا ئێستا هیچ شتێك لەم بارەیەوە ڕوون نی یە ( یونانیەکان بەهەڵە( کواکسار) ئەکەن بە( کەیقوباد). بەلاّم من ئەڵێم سەلمانازارێك کە مێژوو نوسەرکان ئەڵێن بێ جێگادار مردوە( سەلمازاری دوەم ) سەرداناپال کوڕی سەلمانازاری سێ یەمە. لە هەندێ سەرچاوەی دێرینی( ئەینەوا ) لەم دوابییەدا دەرکەوتوە کە سەلمانازاری دوەم بێ جێگادار نەبوە( شەمسی ڕامان ) ی سێ یەم کوڕی ئەو بووە. کەلە ساڵی( ٨٥٥ ) پ ز دا فەرمانڕەوایی ئاشوری کردوە و شاری هەمەدانیشی داگیر کردوە. گەلێ شەرو شۆڕی لە وڵاتی مادا ساز کردوە دوور نی یە وەك چۆن ئەیانوت سەلمانازاری دوەم کەسی لەپاش بەجێ نەماوە سەلمانازاری سێ یەمیش وا دەرئەکەوێ کە جێگاداری بووە. یاخود سارداناپال کوڕی سەلمانازاری سێ یەم نەبێت. کوڕی کابرایەکی تری ئاشووری بێت.دوور نی یە هەندێ ڕووداوی مێژوویی بە هەڵە دووبارە کرابێتەوە و خرابێتە پاڵ یەکێکی تریش. یاخود بۆچی نابێت ئەو نەخۆشیەی کە( ساراکۆس ) تووشی بوو( سارداناپال ) یش تووشی بووبێت. بەهەر حاڵ ئێمە ناچینە چەقی ڕق و بڵێین ئەم ڕووداوە ڕاستە چاوەڕوانی کەرەمی خواو ئاشکرا بوونی ئەم ڕووداوەین لە داهاتوودا. کەلە پاشماوە دێرینەکانی ئەینەواوە دەرکەوێ. ئەژادو بنەڕەتی باوو باپیری کەیقوباد مێژوو نووسەکان زۆربەیان بەم شێوەی خوارەوە باس ئەکەن : - کەیقوباد کوڕی زاگ – زاوگ کوڕی نۆرکان کوڕی سۆسان یا لە هەندێ جێگادا نووسراوە توسان کوڕی ئارمین[١٤٧] کوڕی ئارجان کوڕی ئارشین کوڕی ئاروین کوڕی ئارجان کوڕی مانیشار – هەندێ( مالیسۆ ) یان نووسیوە. کوڕی تورگان یان توسکان کوڕی نورگان کوڕی سوسار کوڕی کوردۆ کوڕی مادا کوڕی یابت کوڕی نوح[١٤٨] کەیقوباد پێنج کوڕی هەبووە ١- کەیکاوس ٢- کەیابۆ ٣- کەعەرەب( کیانۆ )ی پێ ئەڵێن ٢- کیاش( کیارشین ) ٤- کەیارمین ٥- کەی پشین. مێژووناسەکان ماوەی فەرمانڕەوای کەیقوباد هەریەکە بە جۆرێك نووسیوە. ئەوەی زیاتر نزیکە لە ڕاستیەوە گوایە( ٩٤ ) ساڵ فەرمانڕەوا بووە. مێژووی هەورامانی کۆن ساڵی لە دنیا دەرچوونی( ٧٥٩ ) پ ز نووسیوە. ئەکتزپاس مێژوو نووسی یونانی ئەڵێت – پێش ئەوەی

---

[١٤٧] ئارمین برای کەیقوباد کە گرشاسبی کوڕی ئاتراب کوڕی جەمشیدی پێشدادی لە شەڕێکدا لەگەڵ چینیەکان بە بیانووی سەرپێچی لە فەرمان کوشتی. جاماسنامە ل ١٢٨ و تاریخی منگقی ل ٥٦

[١٤٨] مێژووی کۆنی هەورامانیش هەمان شێوە باسی ڕەگەزی کەیقوبادی کردووە.

فەرمانڕەوا بوویێت ماوەی( ٢٦ ) ساڵ سەرۆکایەتی هۆزی( یوز ) ی کردوە. لە هەندێ شوێن دا( ١٢٠ ) ساڵ فەرمانڕەوایی باسکراوە. وا دەرنەکەوێ( ٩٤ ) ساڵ فەرمانڕەوایی مادو( ٢٦ ) ساڵ سەرۆکایەتی هۆزی( یوز) هەموویان بە( ١٢٠ ) ساڵ دانابێت. وا دەرنەکەوێ ئەبێت تەمەنی لە( ١٢٠ ) ساڵ زیاتر بووبێ کەیقوباد زۆر جار بە نموونە دەهێننەوە کە پیاوێکی بیرو هۆش دار بوەو لە کاتی پیریشدا هەمیشە ئاگای لە بیرو هۆشی خۆی بوە بۆیە بە پیاوێکی ژیرو کارامەو زیرەك ئەزانرێ.

## فەرمانڕەوایی کەیکاوس

وەك روون و ئاشکرایە هەر کەسێ قەڵەمی گرتە دەست بۆ نووسینی مێژوو یا رووداوێکی مێژوویی ئەگەر خاوەنی ویژدان نەبێت چۆن خواستی بێت وا ئەنووسێ.مێژوو نووسەکان دەربارەی جێ نشینی کەیقوباد گەلێ بیروڕاو بۆچوونی جیاوازیان هەیە کە بە هیچ شێوەیەك شیاوی باس نیە. تەنها شتێك کە باسی بکەین( کاوس ) پاش لەدنیا دەرچوونی کەیقوباد ساڵی( ٧٥٩ ) پ ز فەرمانڕەوایی گرتۆتە دەست. خاوەنی( مجمع التواریخ ) کە کەیکاوس بە کوڕەزای کەیقوباد داناوە یانی کەیکاوس کوڕی ئەفراد کوڕی کەیقوباد، هەندێ تر بە کوڕەزازای دائەنێن و ئەڵێن کوڕی( کەینو ) کوڕی( کیناوش ) کوڕی( کیاپو ) کوڕی کەیقوباد. وا دەرنەکەوێ وتەی دوەم نزیك بێت لە ڕاستیەوە چونکە کەیقوباد کوڕی نەبوە ناوی ئەفراد بێت لەوە ئەچێ( ئەفوا ) بوویێت و بە هەڵە کرابێتە( ئەفراد ) کە ڕاستیەکەی( ئەپوا ) بوەو عەرەب کردویانە بە( ئەفوا ) بەچوونە پاڵ ووی( کەی ) ئەبێتە( کیاپو ) کە ئەمەیان ڕاستیەکەیەتی. ئەم فەرمانڕەوایە زۆر ئازاو دەسەلأتدار بووە هەمیشە حەزی بە زەعامەت و داگیر کردنی( هاورامان ) یانی( یەمەن ) لە پاشدا لەگەڵ( ژوالاژعار )ی سوڵتانی یەمەندا پەیمانی دۆستایەتی ئەبەستێ و( سودابە )ی کچی مارە ئەکات. لە شەوی زاوایەتی دا لە بەزم و ڕەزمی شایی و هەڵپەڕکێ دا( کەیکاوس و ئەو زەبرو تووس و گومت و گەلێ لە سەردارانی تر بەدیلی ئەگرن و زۆربەی سوپاکەی هەڵدێت و ئەگەڕێتەوە. ئەم هەواڵە ئەگاتە( ڕۆستەمی زابل ) و بە خۆی و سوپایەکی گەورەوە دێتە سەر یەمەن و( ژوالاژعار ) ناچار ئەکات کە پەیمانی ئاشتی

لەگەڵ ببەستێ و کە یکاوس و دارودەستەکەی بەرەلا ئەکات و( سودابە ) بەهەموو کەلوپەلێکی بوکیەنیەوە ئەگەڕێتەوە ولات. ڕۆستەم لە ئەنجامی ئەم فیداکاریەدا ناز ناوی( پاڵەوانی جیهان )ی ئەدرێتێ و دەوڵەتێکی سەر گرتنی و تێك شکاندنی کەیکاوس و سوپاکەی ئەگاتە ولاتی توران زەمین( ئەفراسیاو ) بە خۆی و لەشکرێکی زۆرەوە ڕوەو ئێران یانی ولاتی مادو پارس دێت. کاتی کەیکاوس گەیشتەوە ولات( سیاوەش ) ی کوری لەگەڵ ڕۆستەم ئەنێرێتە بەر بەرەکانێ ی ئەفراسیاو. جارێکی تریش شەڕی ئێران و توران بە پەیمانی ئاشتی کۆتایی دێت کەیکاوس لەم پەیمانە دوو دڵ و دڵ سارد ئەبێت جارێکی تر( توس ئەوزەر ) ئەنێرێتە سەر ئەفراسیاو بە سوپایەکی بەهێزەوە. ئەم کارەی کەتکاوس ڕۆستەمی دڵسارد کردو بەدڵی شکاوەوە ڕوەو ولاتی سیستان گەڕایەوە. سیاوەش لەلایەن باوکیەوە تاوانبار ئەکرێت کە گوایە لەگەڵ سەدابەی باوەژنی دەستی تێکەڵ کردوە.سیاوەش بەهۆی( پیران وەیسە )ی یەکێ لە سەردارانی سوپای ئافراسیاو پەیوەندی بە سوپای تورانەوە ئەکات. ئەفراسیاو( فەرەنگیسی ) کچی لە سیاوەش مارە ئەکات، لە ئەنجامدا بەهۆی پیلانێکەوە لەلایان( گرسیوز ) ی برای ئەفراسیابەوە ئەکوژرێ. هەندێ لە مێژوو ئەوسەکان ئەڵێن کەیکاوس حەزی کردوە بچێتە ئاسمان بۆیە بە ئەمروود ناوی ئەبەن[49] کەیکاوس سانی( ٧١٥ ) پ ز بێ جێگادار لە دنیا دەرچووە هەندێك( فەریبەرزی باوکی توس ) بە کوری کەیکاوس ناو ئەبەن.

بە پێ ی مێژووی هەورامانی کۆن و هەندێ مێژووی تر( فەریبەرز باوکی توس، لە نەوەی قوبادی کوری ئارجانە کە پێنجەم باپیرەی کەیقوباد.

( گرشاسب ی پێشدادی ) کوری( ئاتراب کوری جەمشید ) لە شەڕی ئێران و چین دا قوباد کە فەرماندەی لەشکر بوو بە بیانوی سەر پێچی لە فەرمان کوشتی.

---

[49] تەورات سفری تکوین فەسڵی دەیەم ئەڵێت : ئرمرووود کوری کوش کوری حامە بەلام بنەڕەتی کەیکاوس ئەگەڕێتەوە سەر مادای کوڕ یابت کە لە ڕەگەزدا جیاوازن کەیکاوس هەزار ساڵ زیاتر لە پێش. ئەمروودا ژیاوە لەوە ئەچێ وەکو ئازناو بەویش و ترابێ( ئەمروود ) چونکە داوای خوایەتی و چوونە ئاسمانی کردووە.

## فەرمانڕەوایی توس

پاش ئەوەی کەیکاوس لەدنیا دەرئەچێ. کەسی لە پاش بەجێ ناهێڵێ تا جێگاداری بکات. وڵات بێ سە پەرشتی کار ئەمێنێتەوە، هۆز و تیرەکانی مادو پارس دەکەوەنەوە مقۆ مقۆ و هەر کەسە خۆی ئامادە ئەکات بۆ ئەوەی فەرمانڕەوایی وڵات بگرێتە دەست. بەم شێوەیە ئاشوب و بشێوی لەنێوانیاندا پەیدا ئەبێت، هەردوو دەستەی( ئەرمێنی و قویادی) بۆ وەرگرتنی فەرمانڕەوایی دەکەونە پێش برکێ و ڕقەبەری. سەرۆکی ئەرمێنیەکان( لوهراسبی کوڕی کیارجان کوڕی کیمانۆش کوڕی کیاپۆ کوڕی کەیقوباد )ی فەرمانڕەوای مادە. بنەڕەت و رەگەزی بۆ( ئارمینی کوڕی ئارجان ) ئەگەڕێتەوە کە پیاوێکی بێ تەجرەبە و کەم دەسەڵات بووە لەبەر ئەوە کەس ڕای فەرمانڕەوایی بۆ نەداوە. سەرۆکی قوبادیەکان( توسی کوڕی فەریبەرز ) بوە کابرایەکی گۆشە گیرو بێ سەرو سەوادو ژیرو خاوەن تەجرەبەو دێ نشین بوە لە لایەن زۆربەی خەڵکەوە بە فەرمانڕەوا هەڵئەبژێرێت و ساڵی( ٧٠٨ ) پ ز دەبێتە فەرمانڕەوا.( لوهراسب ) جگە لەوەی زاوای کەیکاوس بووە خۆشی لە پێشترو لەبارتر زانیوە بۆیە سەرپێچی فەرمانڕەوایی تووسی کردوە و گوێ ی پێ نەداوە هەندێ لە هۆزەکانی مادو پارس لایەنگری( لوهراسب ) بوون کاتێ تووس ئاگاداری ئەم پشێویە ئەبێت واز لە فەرمانڕەوایی ئەهێنێ و ئەگەڕێتەوە لادێ بەکشت و کاڵەوە خۆی خەریك ئەکات. بەڵام خەڵك وازیان لێ نەهێنان و کەوتنە نێوان لوهراسب و توسەوە ئاشتیان کردنەوە و ساڵی( ٧٠٧ ) پ ز گەڕاپەوە. ڕێك کەوتن نامەیەك لە نێوان لوهراسب و تووس مۆر کرێ بەم شێوەی لای خوارەوە ١- هەموو وڵاتی مادو پارس بە کاروباری دەوڵەتیەوە بە توس سپێررا. ٢- وڵاتی خۆراسان خرایە ژێر دەسەڵاتی تووسەوە.

٣- رۆژ ئاوا کابلستان و بەشەکانی تری بەبێ باج لەژێر دەسەڵاتی لوهراسب دا بمێنێتەوە.

٤- لەکاتی پێویستی سەربازیدا هەردوو لا هاوکاری یەکتر بکەن.

ئابەو شێوەیە میانەی هەردوکیان کراو لوهراسب پایتەختی بردە شاری( بەلخ ) و تووس شاری هەمەدانی کردە پایتەختی دەوڵەتی مەرکەزی ماد. وەك باسمانکرد شاری( ئاکباتان ) – هەمەدان – لەلایەن( شمارمێ )وە دروست کراو کەیقوباد جارێکی تر دەستی

پێدا هێناو تازەی کردەوە. تووس هات فراوانترو تازە تری کردەوە بە شێوەیەك کە بە شارێکی ناودار و جوان نەژمێررا، بەهۆی ئەوەوە کەهەر حەوت هۆزە گەورەکەی ماد یەنگری تووس بوون. هات حەوت دیواری بەدەوری شاردا کێشا هەر دیوارێك لەوی تر بەرز تر بووە. لەسەر گردۆلکەیەك لە ناوەڕاستی دوا دیواردا کۆشکی فەرمانڕەوایی دروستکرد کە بەسەر هەموو دیوارەکاندا ئەیڕوانی. لە نێوان هەر دیوارێکدا کۆشکێکی جوانی ڕازاندۆتەوە بۆ هەر حەوت سەرۆك هۆزەکەی مادو هەموو دیوارەکانی هەریەکە بەڕەنگێك بۆیە کرد بەم شێوەیەی خوارەوە.

دیواری یەکەم سپی، دوەم ڕەش، سێ یەم سوور، چوارەم شین ٥- نارنجی ٦- نوقرەیی – زیوری. حەوتەم کە بارەگای فەرمانڕەوایی بووە ئاڵتوونی"[150].

پاش ئەوەی تووس لە بارەگای فەرمانڕەوایی جێ گیر ئەبێت لە شاری " ئاکباتان " یاساو دەستوورێکی تایبەتی دانا. کەس بۆی نەبوو لە خۆیەوە خۆی بکات بە بارەگای فەرمانڕەوادا کاروباری دەوڵەتی دابەش کرد بەسەر هەر حەوت سەرۆك هۆزەکەدا. دەستوری دا هەر کەس بچێتە لای سەرەك هۆزی خۆی بۆ کاروباری دەوڵەتی و تایبەتی خۆی هەر سەرۆك هۆزەش یەکسەر پەیوەندی بەفەرمانڕەوا خۆیەوە بووە.

دەستوورێکی تایبەت لە هەر کۆشکێکدا بەم شێوەیەی خوارەوە هەڵواسرا : -

١- لە بەردەمی فەرمانڕوادا پێکەنین قەدەغەیە

٢- لە بەردەمی فەرمانڕوادا تف کردنەوە قەدەغەیە

٣- لە بەردەمی ئاوڕشتن قەدەغەیە

٤- تەماشا کردنی ڕواڵەتی فەرمانڕەوا قەدەغەیە

هەروەها ئەم فەرمانڕوایە( کەوشی ئاڵتوونی ) لە پێ کردوە و لەسەر کورسی عاج یانی تەختی عاج دانیشتوە.( نۆرمان )ی مێژوو نووس ئەڵێت یەکەم کەسێك( یاسای دادگا ) ی دانا لە وڵاتی خۆی( تووس ) بووە، کە دەستوورەکەی لە ئاینی زەردەشتەوە وەرگرتوە. ئەنجومەنێکی تایبەتی دانا بۆ سەرپەرشتی کردنی یاسای دادگایی.

---

[150] پیرینال٥ ملل قدیمه مشرق ل٢٧٨. ئاینە سکەندەری ل ١٥٠ مێژووی کۆنی هەورامان ل١٨٨

سەرچاوەی یاساکەی لە( کتێبی زرین ) یا( پازەند )ی وە وەرگرت کە کتێبی مەزهەبی زەردەشت بووە. هات لە سەرتاسەری ولاَتدا( ئەنجومەنی سەرپەرشتی دادگاکانی ) دانا بۆ هەر شارو ناوچەیەك داوەرێك یا قازیەکی تەنهای دانا کە بە پێ ی یاسای ( پازەند ) کاتان ئەکرد. ئەو یاساو دەستوورەی کە( تووس ) داینا تا سەردەمی( کورشی گەورە ) بەکار هات و پەیڕەوی کرا، لەوە بەدواوە بەتاییەت لە سەردەمی( داریوشی هاخامەنشینی )دا کاروباری یاسا درایە دەست دادوەرو فەرمانبەرانی دەولەت و ئەنجومەنێکی گشتی دادوەران پێك هات بۆ سەرپەرشتی کاروباری یاسایی. ئەم فەرمانڕەوایە ماوەی( ٥٣ ) سالْ بەو پەڕی دەسەلاَت و شکۆمەندیەوە کاروباری دەولەتی بەڕێوە بردوە، شاری تووس( خۆراسان ) لە شارەکانی ئەم پیاوەیە. ناوی ڕاستی تووس( نووسارمەن )ە کە بچووك کراوەتەوە بە تووس. یەکێ لە مێژوو نووسە یونانیەکان لە زمانی مێژووی کۆنی ئێرانەوە ئەلێت " ناوی ڕاستی تووس( نارتوس یا ناریتوس ) ە یونانیەکان دژزس یا دیوکس "ی پێ ئەلێن. هەندێ کەس وا ئەزانن کە تووس( دژزس ) کەیقوبادە کەچی – هێرۆدۆت – کە خۆیشی ڕای وایە - ئەلێت( فراهورت ) کوڕی تووسە بەلاَم کەیقوباد کوڕی نەبووە. هەندێ لە مێژوو نووسەکان وا ئەزانن ئەم نووسە تووسی نەوزەرە بەلاَم وەك لەمەوبەر باسمانکرد( تووسی نەوزەر ) لە زنجیرەی پێشدادیەکانە بەم شێوەیە( تووس کوڕی نەوزەر کوڕی مەنچەر کوڕی ئێرەج کوڕی فەرەیدون کوڕی ئابتین کوڕی جەمشید کوڕی سیامەك کوڕی میش کوڕی گومرت کوڕی یابت کوڕی نوح )ە. بەلاَم ئەم تووسی کیانی یە و لە زنجیرەی مادایە بەم شێوەیە( تووس کوڕی فەرییەرز کوڕی شاهروخ کوڕی زادئاز کوڕی ئاروەند کوڕی قوباد کوڕی یارجان ). باپیرەی پێنجەمی کەیقوباد کە( تووسی مادی یە ) بە( تووسی پێشدادی )یان زانیوە ئەم فەرمانڕەوایە سالی( ٦٥٥ ) پ ز لە دنیا دەرچووە.

## ( ئاوڕ دانەوەیەك لە نەوەكانی كەیقوباد ) : -

نەوەكانی( تووسی قوبادی ) یانی مادی یەك لە دوای یەك تاسەركەوتنی كورشی گەورە بەسەر( ئایزدهاك )دا لە ولاتی مادو پارس و دوورو بەری فەرمان ڕەواییان كردووە. هەروەها نەوەكانی( لوهراسبی كەیقوباد ) لە رۆژهەلات و لە دوایشدا لە ولاتی مادو پارس تا داگیر كردنی ئەسكەندەر دەسەلاتدار بوون. كاتێ كورشی گەورە ولاتی مادو پارسی داگیركرد ئەمرەانی لوهراسب بە دڵ و گیان لایەنگری كورش بوون، ئەویش ڕێزو خۆشەویستی هەبوو بۆیان و هەمیشە ڕێزی ئەگرتن لە پاشماوە دێرینەكان دەربارەی( لوهراسب ) شتێكی ئەوتۆ بەدەستەوە نی یە تەنها هەندێك ئەڵێن ولاتی هیندی داگیر كردوە. بەلام لە ڕاسیدا داگیر كردنی هیندوستان لەلایەن لوهراسب – ەوە بە بێ هاوكاری فەرمانڕەوایانی ماد و پارس عەقل گیر نی یە. لەوە ئەچێ كاتێ فەرییەرز لەشكری كردە سەر لوهراسب هاوكاری یا فەرماندەی لەشكر بووبێت بۆیە زۆربەی مێژوو نووسان ئەو داگیر كردنەیان بەهەڵە خستۆتە پاڵ لوهراسب. بەلام كشتاسبی كوڕی لوهراسب پاشماوی گەلێ زۆری لەپاش بەجێ ماوە( قەلای سەمەرقەند. دیواری خاوەر، شاری بەینای فارس ) لە یادگارەكانی ئەم فەرمانڕەوایەن. هەروها گۆڕەكەی لە شاری شیراز دایە. كشتاسب سالی( ٦٦٨ ) پ ز كاتێ باوكی مابوو بوە فەرمانڕەوا و لوهراسبی باوكی سالی( ٦٥٠ ) پ ز لە دنیا دەرچووە ناو و ناوبانگی كشتاسب زیاتر بەهۆی ئەو برەو دانەوە بووە كەبە ئاینی زەردەشتی ی داوە. لە سەرەتادا پایتەختی شاری( بەلَخ ) بوە لە پاشدا گواستویەوە بۆ شاری( ئەستەخەری پارس ) و لە سالی( ٦٠٢ )پ ز لە دنیا دەرچووە.

فەرماندەی( خاوەرستان ) لە سەردەمی كورشی گەورەدا( بەهمەنی كوڕی ئەسفەندیار كوڕی كشتاسب كوڕی لوهراسب )ە بوە لە سالی( ٦٠٢ تا ٥٢٢ ) پ ز.

لە زۆربەی كتێبە كۆنەكاندا بەهمەن بە ئاحشویسروشت ) ناوبراوە. یونانیەكان بە( ئارتاگزرس ) یا( كزرسز ) ناوی ئەبەن هەروەها ئەڵێن( ئەردەشێری دەست درێژ ) هەر ئەوە. بەهمەن ولاتەكەی لە هیندەوە تا حەبەشی فراوان كردوە و پایتەختی بردۆتە شاری شوش لە( ٤٦٤ تا ٤٢٤ ) پ ز. لە زۆربەی كتێبە كۆنەكان و مێژوی كوردو( كتێبی ئەستێر فەسلی یەك ) ئەڵێن بەهمەن فەرمانڕەواییی( ١٢٧ ) ولاتی كردوە پیاوێكی زیرەك

و به ویژدان و داد پەروەر بووە، کاروباری دەوڵەتی زۆر به رێکو پێکی بەرێوە بردوە. ئەڵێن بەهمەن له تۆڵەی خوێنی باوکی بۆ شەڕی بنەماڵەی ڕۆستەم تا فەرامەرزی کوڕی ڕۆستەم بکوژێ[151]. له سەردەمی بەهمەن جولەکەکان زۆر خۆش گوزەران بوون( یاشسر )کوڕی بەخت نەسر لەلایەن بەهمەنەوە کرابوە فەرمانداری( بابل ) ئەوەی زۆر ئازاری جولەکەکانی ئەداو سەربەستی زەوت کردبوون، بەهمەن هات( کورشی کوڕی جاماسب ی کوڕی لوهراسب )ی کردە فەرمانداری بابل لەبەر ئەوەی دایکی جولەکە بوو خوشکەزای دانیال ی بچووکە[152]. ئەڵێن( کورش )له مەلیکەکانی بابل بووە[153]، بەهەرحال گرنگ ئەوەیە بزانین ئەم کورشە جیاوازی کورشی گەورەی هاخامە نشینییە[154]. پاش لەدنیادەرچوونی بەهمەن( هوما )ی کچی که یونانیەکان( پەریزاد )ی پێ ئەڵێن ماوەی( ٤٠ )ساڵ فەرمانڕەوایی کردوە له ٥٢٣ تا ٤٩٤ )پ ز. پایتەختی کەی شاری( تەیسەفون )ی عیراق بووە،وەك له هەندێ هەڵس کەوتی باوکی ناڕازی بوە بۆیە چۆتە ئەوێ.له سەردەمی فەرمانڕەوایی هومادا داریوشی گەورەی هاخامەنشینی ئەبێتە فەرمانڕەوای وڵاتی مادو پارس له( ٥٢١ تا ٤٨٦ )پ ز کە( گوماتا )ی کوشتوەو خۆی فەرمانڕەوایی وەرگرتووە[155]. ئەم داریوشە کوڕی ویشتاسب کوڕی ئارسام کوڕی ئارابارام کوڕی سیاوەش کوڕی کورشی یەکەم کوڕی کاوس کوڕی سیاوەش کوڕی هاخامەنشین فەرمان ڕەوای عیلام و پارسە، له کتێبە کۆنەکاندا بە( داریوش ی فارس )یا داریوش فەرمانڕەوای فارس ناودارە[156] ئەم داریوشە

---

[151] له کتێبی( زینە التواریخ )دا ئەڵێت لەم کاتەدا ڕۆستەم زیندوو نەبوەو مردووە.

[152] دوو دانیال هەبووە یەکێکیان له پیاوە ناودارەکانی جوولەکە و ئەوی تریان پەیامبەری بەنی ئیسرائیلیەکان بووە. مروج الذهب بەرگی دوەم ل ٨٢، ٨٣ سرجان ملکم ب ١ ل٢ روچە الصفا ل ٢٢٨.

[153] مێژووی ابن خلدون ل ١٦٢. مەسعودی له مروج الذهب ل ٦٤

[154] تواریخ لایام ف ٣٦ ئایەتی ٢٢. ٢٣ و کتابی عەزرا فوسلی یەك و سێ و ئایەتی ٧ و فەسلی ٤ ئایەتی ٥ کتێبی دانیال فەسلی ٦ ئایەتی ٢٨ و فەسلی دەیەم ئایەتی یەك. کەوابوو جیاوازی ڕای هەندێ مێژوو نووس بێ بناغەیە چونکە ئەم کورشە جیاوازە له کورشی گەورەی مادو پارس.

[155] مێژووی کورد پەریزاد نازناوی داریوشی کوڕی هومایە نەك هوما خۆی.

[156] کتێبی( وحمیاونەمسلی ١٢ ئایەتی ٢٢ )و( کتێبی عەزرا فەسلی ٤ئایەتی( ٥و٢٤ )فەسلی ٥ ئایەتی ٦، ٧.

سەر لەنوێ بیت المقدسی تازە کردۆتەوە بەم شێوەیە لە ساڵی(٤٢٤)پ ز داریوشی کچەزای بەهمەن کە لە هوما بوە بۆتە فەرمانڕەواو بە سەرپەرشتی دایکی کاروباری دەوڵەتی گرتۆتە دەست ئەم داریوشە[١٥٧] لە مێژوودا بە(دارا)ناودار بووە.توانیویەتی سەرەڕای فەرمانڕەوایی وڵاتی مادوپارس خاکی فەلەستینیش ی داگیر کردو ماوەی(٢٠)ساڵ فەرمانڕەوایی کرد ئەم داریوشە لە مێژوودا بە داریوشی مادی ناوبراوە.بە پێ ی سەرچاوەکانی پەراوێزی ژمارە(١٣٥ X ١١)کەس زنجیرەی(کیانی)فەرمان ڕەواییان کردوە بەم شێوەیە:١-کەیقوباد٢-کەیکاوس ٣- توس ٤- فەریبەرز(فەریبورز) ٥- کواکسار٦- ئازیدەباك ٧- لوهراسب ٨- کشتاسب ٩- بەهمەن کوڕی ئەسفەندیار١٠- هوما ١٢- داریوش کوڕی هوما–دارا.لە سەردەمی داریوش مادی دا ساڵی(٣٣٠)[١٥٨]پ ز ئەسکەندەری مەقدۆنی هێرشی کردە سەر وڵاتی مادو پارس پاش شەڕێکی سەخت و خوێناوی لە دەوروبەری(هەولێر)داریوش بە دەستی دوو کەسی خەیانەت کار[١٥٩] و تاوانباری هەمەدانی( جانۆسیار و ماهیار) دەست گیر ئەکرێ و ئە کوژرێ بەم شێوەیە ئەسکەندەر کۆتایی بە دەوڵەتی ماد ئەهێنێ و تا ساڵی( ٣٢٣) پ ز فەرمانڕەوایی ئێران ئەکات[١٦٠].

---

[١٥٧] کتێبی دانیال فەسلی ٥ ئایەتی ٣١ و فەسلی ٨١ و ئایەتی یەکەم فەسلی ٩ ئایەتی یەك. ئەمانە هەموویان ئەڵێن داریوش کوڕی ئاحشویروش لە نەوەی مادەکان.

[١٥٨]بە پێ ی قاموس کتێبی مقدس ل ٢٦٤ کە مسترهاکس داینلوە ئاستیاکی( ئەژدەهاك ی دوا پادشای ئادە کە کورشی کچەزای بە سەریا زاڵ بوو بەڵام من لام وایە هەڵەیە.( ئازدیاك) هەرگیز نازناوی داریوش نەبووە. ئاسیاك کوڕی( کی ئاکسار) هوخشتەرییە نەك( ئەخشویروش) بەڵام داریوشی مادی ئەبێ( سەمەردیس) بێ

[١٥٩] داریوشی مادی لەگەڵ داریوشی هەخەمینی سێ یەم کە ئەسکەندەر وڵاتەکەی لەدەست دەرکرد جیاوازن. داریوشی مادی( گوماتای) بێ کە پادشاهێتی مادی لە ئەخەمینیەکان وەرگرتەوەی بەڵام داریوشی کوڕی ویشتاسب ی دوەم بە سەریا زاڵ بوو( ٤٨٦)پ ز. بەڵام داریوشی سێ یەم کە ئەسکەندەر بەسەریا زاڵ بوو نەوەی داریوشی دوەمی هەخامەنشی یە و هیچ پەیوەندی بە مادەوە نی یە.

[١٦٠] هەندێ لە مێژوونووسان ئەڵێن بە پیلانی ئەسکەندەر کوژراوە

## فەرمارنەوایی فەرییەرز( فەرییورز ) :

ساڵی( ٦٥٥ ) پ ز فەرییەرزی کوڕی توس ئەبێتە جێگاداری باوکی ئەم فەرمانڕەوایە لەلایەکەوە وڵاتەکەی تا ڕوباری جەیحون و لەلایەکی ترەوە تا هند و لە ڕۆژئاواوە تا میسوپوتامی پەرەی پێ لە دانیشتوانی( فینیقیە و گرسوس و سیلیسلیخ نیل ) باج دەری بوون. عیبری و میسری یەکان لەژێر سایەی ئەودا بە پەیمانێکی ئاشتی پێکەوە ژیاون. لەو سەردەمەدا شاری ئاکباتان بە پایتەختێکی گەورە و ئاودار دەناسرا مەرکەزی ئاینی زەردەشت کە شاری( بەلخ ) بوە بە فەرمانی فەرییەرز گواسراوەتەوە شاری( ئاکباتان ).

ساڵی( ٦٢٥ ) پ ز بە لەشکرێکی گەورەوە ئەچێتە سەر ئاشووریەکان و لەشەڕێکی سەختدا ئەکوژرێ[161] پارسەکان لەم سەردەمەدا لەژێر سایەی ئەم فەرمانڕەوامادەدا ژیاون ئەحمەد ڕەفیق لە کتێبی مێژووی گشتی خۆیدا( فرانۆرت )ی بە هەڵە بە( فەرهاد )نووسیوە. لە کاتێکدا فەرهاد ناو لە زنجیرەی فەرمانڕەوایانی کەیانی و پێشدادیەکاندا نەبووە.

## فەرمانڕەوایی کواکسار =( هواخشتر ).

پاش ئەوەی فەرییەرز ساڵی( ٦٢٥ ) پ ز بە دەستی ئاشوریەکان کوژرا لەشکری ماد بە جارێ پەرش و بڵاو بوەوە. ئەوەندی ئەمابورو وڵاتی مادو پارس لە لایەن ئاشووریەکانەوە داگیر بکرێت. ئەنجارەش پیاو ماقوڵان و سەۆک هۆزەکانی مادو پارس جارێکی تر کۆبونەوە و کواکساری کوڕی بە فەرمانڕەوادیاری ئەکەن -( لە ساڵی ٦٢٤ پ ز) هەمان کینە و ڕقی باوکی لە ئاشووریەکان لە دڵ و دەروونی کواکساریشدا ڕەنگی دابوەوە بۆیە دەستی کرد بە دامەزراندنی سوپایەکی ڕێکوپێکی سوارەو پیادە بە تیرو کەوان و شمشێرەوە بۆ تۆڵە سەندن لە ئاشووریەکان. سوارچاکانی ماد لە ڕووی چەك و ئەسپ و ڕەمبازیەوە گەلێ لە ئاشووریەکان چالاکتر و باشتر بوون. پاش ئەوەی ئەم سوپایە بەدڵی خۆی دەردێ و لەبار ئەبێت ڕوەو وڵاتی ئاشوور ئەکەوێتە ڕێ لە نزیك شاری ئەینەوا دا شەڕێکی توند و تیژ ئەکەن و ئابلوقەی شار ئەدەن. لەم کاتەدا هەواڵی ئەدەنێ کە(

---

[161] پیرینا ساڵی ٦٢٢ پ ز نووسیوە بۆ کوژرانی فەرییەهز.

سیتەکان- سکایەکان) کە یونانیەکان( سکۆلت) یان پێ وتوون لە ولاَتی قەفقاز تێپەڕیان کردوە و خەریکن ولاَتی ماد داگیر ئەکەن. ناچار دەست لە ئابلوقەی شار هەئئەگرێت و ڕوەو ولاَت ئەگەڕێتەوە لە ژووروی دەریاچەی ورمێ بەیەك ئەگەن و شەڕێکی سەخت و خوێناوی بەرپا ئەبێت. لەبەر ئەوەی سوپای ماد تازە لەشەڕ گەڕابوەوە بۆی ئەکرا بەرەنگاری سوپای( سیتەکان) بێت، تا لە ئەنجامدا پەیمانێکی دۆستایەتیان بەست و کواکسار ناچار بوو مل کەچی داوای سیتەکان بێت. ماوەی بیست ساڵ ولاَتی ماد و پارس هەتا دەریای ئاوڕاست لەژێر دەسەلاَتی سیتەکاندا مایەوە.

کواکسار شەوێك بە ناوی میواندارییەوە هەموو سەردار و فەرماندەکانیان سەرخۆش ئەکاو بەدیل ئەیانگرێ و ئەیانکوژێ. ئەوەی لەسوپادا ئەمێنێتەوە ڕاویان ئەنێ و سالَی( ٦١٥) پ ز ولاَتیان لێ پاك ئەکاتەوە. جارێکی تر کواکسار لەگەڵ فەرمانداری ئەینەوا ئابلوورەی شاری بابل ئەدەنەوە. پاش ئەوەی سارکۆسی کوڕیئاشوربانیپال ئەزانێ بەرەنگاری ئەم هێرشەی پێ ناکرێ ئاگر بەرئەداتە قەلاَکەو جی تیایە بەخاوو خێزانەوە ئەسووتێ و سالَی( ٦٠٦) پ زکۆتایی بە دەوڵەتی ئاشوور دێت.

هێرش کاران بەشێوەیەك شاری ئەینەوا کاول ئەکەن کە پاش دوو سەدە لە سەردەمی ئەردەشێری دوەمی هاخامەنشینی دا کە گەزنەفون ی یونانی لەوێوە تێپەڕ ئەکات ناتوانێ کەلاوەکانی ئەم شارە بدۆزێتەوە کە گەورە شاری جیهانی سەردەمی خۆی بووە. ئابەم شێوەیە ولاَتی ئاشوور دابەش ئەکەن بەسەر خۆیاندا، ئەوەی ئەکەوێتە دیجلە و ئاسیای بچووك بەر ولاَتی ماد ئەکەوێت و شام و فەلەستین ئەبێتە بەشی بابلیەکان دەوڵەتی ئاشوور کە لە سەردەمی ئاشوربانیپال یانی( ٤٠) ساڵ پێش فەرمانڕەوایی( سارکۆس) بەتوانا ترین و دەسەلاَتدار ترین دەوڵەتی سەر زەوی توانیویە دەوڵەتی بەدەسەلاَتی عیلاَم لەناوببات. ئابەو شێوەیەش دەستی تۆڵە بۆ دواجار خۆیانی کپ کردەوەو لەرووی زەویدا ئەی هێشتن.

پاش ڕووخاندنی دەوڵەتی ئاشوور دەوڵەتی ماد بۆ پتەو کردنی دوستایەتی لەگەڵ دەوڵەتی بابلیەکاندا، کواکسار هات( ئامێ تسی) کچی لە شازادەی بابل( بەخت ئەسر) مارە کرد، وەك ئەڵێن بەخت ئەسری بابلی باخچە هەڵواسراوەکانی لەبەر خاتری ئەم کچە کوردە دروست کردوە. پاش ئەم سەرکەوتنە گەورەیەی کواکسار زیاتر دەسەلاَت و هێزی

پەیدا کردو ڕەوو( ئەرمەنستان ) کابا دۆکیە )ی ڕۆژهەلاتی ئاسیا ئەچێت و داگیری ئەکات – تا کەناری ڕووباری( هالس ) ڕۆیشتووە. لە کاتێکدا کواکسار ڕاوی سیتەکانی ئەکرد چەند کەسیکیان پەنایان بردە بەر فەرمانداری( لیدی( بۆ ئەوەی لە چنگی کواکسار و کوشتن ڕزگاریان بێت. کواکسار نامەیەکی بۆ فەرمانداری( لیدی ) نووسی کە پێویستە بەزوویی ئەو پەنابەرانەی بۆ بگێڕێتەوە فەرمانداری لیدی لەم داوایە تووڕە ئەبێت و وەلامی کواکسار ناداتەوە. لێرەدا سوپای( لید )ی ڕوو بەڕوو ئەوەستنەوە و ماوەی شەش ساڵ بێ ئەوەی هیچیان هەنگاوێك بەرەو پێشەوە بچن بەرامبەر ئەوەستنەوە.

لەساڵی حەوتەم دا یانی( ٢٨ ی ئایاری ٥٨٥ پ ز ) ڕۆژ گیرانێکی تەواو ڕوو ئەدات کە بە تەواوی دڵی سەربازانی هەردوو سوپاکەی لەرزاندبوو وا هەست ئەکەن ئەوە نارەزایی ئاسمانە دژی ئەم بەرەنگاریە بۆیە( بەخت ئەسر ( ی بابلی ئەکەوێتە نێرانیان و پەیمانی ئاشتی مۆر ئەکەن ڕوباری( هالس ) قزل ئیرماق ئەکەنە سنووری نێوان هەردوو دەوڵەت. بۆ زیاتر پتەو کردنی ئەم دۆستایەتیە فەرمانداری لیدی( ئارتەنیسی ) کچی ئەداتە ئازیدە پاکی کوڕی کاوکسار[١٦٢]. ئەڵێن ئەم ڕۆژ گیرانە ساڵێك پێش ئەوە لەلایەن( تالیس )ی مەلگیەوە کە ئەستێرە ناسیکی زانا بووە زانراوە. ساڵێك پاش ئەم پەیمانە کواکسار لە( ٥٨٤ ) پ ز لە دنیا دەرچووە. دەوڵەتی ماد لەم سەردەمەدا بە یەکێك لە دەوڵەتە هەرە گەورەکانی دنیا زانراوە. بە پێ ی وتەی هێرۆدۆت سنووری وڵاتی ماد لەو سەردەمەدا بەم شێوەیە بووە لە ڕۆژهەلاتەوە ڕوباری جەیحون( ئامۆیە )، لەو سەردەمەدا ڕژاوەتە دەریای خەزەرەوە. لە ڕۆژئاواوە ڕوباری هالیس – قزل ئیرماق.

لای ژوورەوە دەریای خەزەر و ڕوباری( ئارس ) وڕیزە شاخەکانی ئارارات تا دەریای ڕەش.

لای خوارەوە کەناری دەریای عومان و کەنداوی عەرەب کە فارسەکانیش لەم سەردەمەدا لەژێر سایەی مادەکاندا ئەژیان.

---

[١٦٢] هێرۆدۆت ئەڵێ فەرمانڕەوای( ماد )یش( ئامێ تسی ) کچی داوە بە( گرزۆس )ی کوڕی ( ئلیا ) ی فەرمانداری لیدی.

## " فەرمانڕەوایی – ئازیدەیاك – "

پاش لە دنیا دەرچوونی کواکسار ئازیدەیاك ی کوڕی لە ساڵیٚ( ٥٨٤ ) پ ز ئەبێتە جێگاداری و فەرمان ڕەوای وڵاتی مادو پارس ئەگرێتە ئەستۆ. یونانیەکان( ئاستیاك یا ئاستیاژ) یان پێ وتوە ناوی ڕاستی خۆی ( ئیختوویگو )یە. ئەم کابرایە پیاوێکی بێ دەسەلاَت و هەرزە و دەست بلاَو بوە ئەو وڵاتە پان و بەرینەی کە لە باوکیەوە بۆی جێ مابوو ئەیتوانی سەرپەرشتی بکات و گوێ ی ئەداوەتێ. هەمیشە خەریکی ڕابواردن و بەزم و ڕەزمی دیوەخان بوە، ئازارداتی خەلکی و کاول کردنی ماڵیان هەوڵی خۆش ورابواردنی بووە، خەلك گەلێك لەم پیاوە بێزار بوون هەر کەکورش سەری هەلّدا مادەکان وازیان لێ هێناو پەنایان بردە بەر کورش و بەفەرمانڕەوا قبوڵیان کرد. لەئەنجامی خۆ هیلاك کردن و شەو نخونی و خوێن ڕشتنێکی زۆردا وڵاتی ماد لە سەردەمی کواکساردا گەیشتبوە ئەوپەڕی شادی و بەختەوەری، سوپایەکی بە هێزو توانا و دەسەلاَتداری هەبووە هەر شوێنێك مەیلیان لێ بوایە بە ئاسانی داگیریان ئەکرد. کواکسار هەرچەندە خۆی فەرمانڕەوایەکی بە دەسەلاَت و ژیر بووە لەگەلّ ئەوەشدا لە هەموو کاروبارێکدا پرس و ڕای بە ڕیش سپی و پیاو ماقوڵانی وڵات بووە. مادەکان لە ڕووی پێشکەوتنەوە بە ئەستێرەیەکی پرشنگداری سەردەمی خۆیان ئەناسران.( شێرە بەردینەکەی هەمەدان ) لە شاکاری پەیکەر تاشی مادەکانە. دوکانی داود و تاقەوسانی فەرهاد و وێرانەکانی لوڕستان و تەختی سلیمان لە خاکی ئەفشار و قەلاَی کەرەفتوو قەلاَی زەلم تەواوی بەردە تاشراوەکانی وڵاتی کوردو دەخمەیمیانداوە ودەخمەی سیرتار( پلکان ) ڕەوانسەر لە شاکارە هەرە جوانەکانی ئەو سەردەمەیە.

# گۆڕانی فەرمانڕەوایی لە مادەوە بۆ پارس

فارسەکان لە وڵاتی خۆیاندا لە کەناری عەرەب، بە ئاژەڵداری و کشتوکاڵەوە خەریک بوون هەندێ جار بە سەربەستی ژیاون و هەندێ جاری تریش لەژێر سایەی پێشدادیەکان و هەندێ جاری تریش بە باج دەری لەژێر سایەی مادەکاندا ژیاون. گەلێ جاریش باج دەری کلدانی و ئاشووریەکانیش بوون، ئەم فارسانە هەمیشە لە خاکی خۆیاندا نەترازاون و پەلاماری کەسیان نەداوە مەگەر لە سەردەمی زنجیرەی هاخەمەنشی دا کە تا خاکی فەلەستین ڕۆیشتوون و پەلاماری عیلامەکانشیان دا. هەر چەندە زۆربەی فەرمانڕەوایانی هەخامەنشین سەرپەرشتی وڵاتی عیلامیان کردوە بەلام زیاتر لەژێر سایەی ئاشووری و بابلی و مادەکاندا ژیاون. دوا فەرمانڕەوای هەخامەنشی کە سەر پەرشتی وڵاتی عیلامی کردوە( کامبوز ) باوکی کورشی گەورە بووە"[١٦٣]. دێینە سەر باسی ئەوەی کە دەوڵەتی ئازادی فارس لەسەر دەستی کورشی گەورە دەست پێ ئەکات"[١٦٤].

" فەرمانڕەوایی کورشی گەورە "

پاش ئەوەی( ئازیدەیاك ) فەرمانڕەوایی لە کواکساری باوکیەوە بۆ مایەوە لەبەر ئەوەی پیاوێك بوو پشتی بەئازو نیعمەت و گەورەیی دەوڵەتی( ماد ) ە وە ئەیەشابوو، بە شێوەیەك دەستی دایە ڕابواردن و بەزم و ڕەزمی شەوانەی دەربارو گوێ نەدانە کاروباری دەوڵەت بەجارێك بووە جێ ی سەرزەنشیتی خەڵکی و هەموو نەفرەتیان لێ کرد. فەرماندارێەتی وڵاتی پارس و عیلام کە دەست نیای دەوڵەتی ماد بوون وردە وردە تەرازووی هێزو باوەڕیان بەلادا ئەشکایەوە، ئاونیشان و شەوکەت و دەسەلاتی ماد ڕۆژ لە دوای ڕۆژگەم ئەبووەوە کە لە سەردەمی کواکساری باوکیدا یەکێك بووە لە دەوڵەتە هەرە گەورەکانی دنیا. گەورە پیاوان و سەرۆك هۆزەکانی ماد بەهۆی بێ دەسەڵەتی و گوێ نەدانی ئازیدەیاك بە کاروباری دەوڵەت هەموویان خەریکی پارە کۆ کردنەوە بوون،

---

[١٦٣] ئاینە سکەندەری ل ٣ و ١٧٤

[١٦٤] کتێبی تواریخ الایام.

سەرداران سەرکردەکانی سوپا بەجارێك دڵسارد بوون گوێ یان بە کاروباری سەربازی و مەشق کردن نەئەدا. ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دەوڵەت لەگەڵ دانەبڕاو خەڵکی زیاتر ئەچەوسایەوە و ئازار ئەدرا. کردەوە ناشیرینەکانی( ئازیدەهاك ) تەنانەت وەزیرەکانیشی دڵسارد کردبوو( ئارپاك ) ی وەزیر کە یونانیەکان( ئارپاکس ) ی پێ ئەڵێن لە هەموویان زیاتر دڵساردو بێزار بووە. ئارپاك کەوتە بیرکردنەوەو مشوور خواردن وردە وردە خۆی لە بێزارو دڵ ساردەکانی تر نزیك کردەوە لە کۆبونەوەیەکی فراوانی سەرداران و پیاو ماقوڵانی نیشتمان پەروەردا بڕیاریان دا کەتەخت و بەختی ئازیدەهاك تێك بدەن دەسەڵاتی لێ وەرگرنەوە.( ئارپاك ) پێشتر ئاگاداری کورشی گەورەی کردبوو، دەربارەی بشێوی وڵاتی ماد بە ئیمزای هەموو بەشداربوانی کۆبونەوەکە نامەیەکیان بۆ( کورشی کوڕی کامبوز)ی فەرمانداری عیلام نووسی ئاگاداریان کرد کە بە سوپا بچوکەکەی خۆیەوە لە شاری ئاکباتان نزیك بێتەوە بۆ ئەوەی هەموو سوپای ماد پەیوەندی پێوە بکەن. نامەکەیان دایە گیو وە گەیاندیە شاری( پاسارگاد ) ی پایتەختی عیلام و پارس. کورش کە یونانیەکان بە( سیروس ) ناوی ئەبەن هەر کە نامەکەی ئەگاتێ دەست بەجێ لەگەڵ پیاو ماقوڵان و سەردارانی پارس و عیلام کۆئەبێتەوەو مەسەلەکەیان تێ ئەگەیەنێ لە پاشدا هەموویان بڕیاریاندا کورش بە سوپاکەوە بەرەو شاری ئاکباتان کەوتە ڕێ. ئازیدەهاك ئاگادار ئەکەن کە کورش بە سوپایەکەوە پەلاماری وڵاتی مادی داوە. سوپاکەی کۆ ئەکاتەوە لە ژێر فەرماندەیی( ئارپاك ) دا ئەیکا بەگژی سوپای پارس و عیلام دا. ئارپاك لە دوەم هێرش دا بە خۆی و سوپای مادەوە پەیوەندی بە کورشی گەورەوە ئەکات. ئازیدەهاك لەم هەواڵە شێت گیر ئەبێ بۆیە بە پەلە سوپایەکی تر پێك ئەهێنێ و لەژێر چاودێری خۆیدا پەلاماری کورش ئەدا هەر لە سەرەتای پەلامارەکەیدا تێك ئەشکێ و هەڵدێ و ئەگەڕێتەوە شاری( ئەکباتان ) و لەوێ سەنگەر بەندی ئەکات. بە کورتی سوپای کورش ئەچێتە ناو شاری ئەکباتان و داگیری ئەکەن و ئازیدەهیان بەدیل ئەگرن و کۆتایی بە دەسەڵاتداریەتی ماد ئەهێنن. هەرچی پارەو کەل و پەلی تەختی هەیە لەگەڵ خۆیانا ئەیبەنەوە شاری( پاسارگاد ). کورش ساڵی( ٥٦٠ ) پ ز بۆتە فەرمانداری پارس و عیلام• ساڵی( ٥٥٠ ) پ ز شاری ئاکباتانی داگیر کرد. پاش ئەوەی کورش شاری ئەکباتان هەمەدانی ئێستا داگیر ئەکات کواکساری دوەم کوڕی ئازیدەهاك کە خاڵۆی کورش خۆیەتی

ئەیکاتە سەرداری سوپاکەی، هەروەها ئەسپەنۆی کچی یاتیمار ی زاوای ئازیدەیاك کە پورزای خۆیەتی ئەخوازێ و مارەی ئەکات. کورش زۆر ژیرانە بیری لە مەسەلەکان کردۆتەوە. کارو باری دەوڵەتی( ماد ) وە خۆی ئەهێڵێتەوە. هەمیشە ڕێزو خۆشەویستی بۆ سەرداران و پیاو ماقولانی ماد داناوە. پلەو پایەی زیاد کردوون ئەوەی شیاوی برایەتی و دۆستایەتی و هاوپەیمانی ماد وپارس بووبێت کورش کردویەتی و بە تەنگیەوە هاتوە. تا سەرکەوتنی ئەسکەندەری مەقدۆنی بەسەر( دارا ) ئەم برایەتی ویەکێتی یە بەردەوام بووە[165]. کورش دەوڵەتە تازەکەی بە ناوی دەوڵەتی مادو پارسەوە ناونا[166]. لە زۆربەی کتێبە کۆنەکاندا لەبریتی وشەی ئێران ی ئێستا ناوی مادو پارس بەکار هاتووە[167] ئەتوانین بڵێین هەتاومکو یەك سەدە یش تێپەڕ ئەکات بەسەر ڕوخاندنی دەوڵەتی مادا لە بریتی وشەی پارس وشەی ماد بەکار هاتووە. بە جۆرێك مادەکان بەوە قایل ئەبوون کە لەبریتی وشەی ماد ناوی مادو پارس بەکار بێت[168]. گرنگ ئەوەیە هەموو مێژوو خۆی و بێگانەکانیش دان بەوەدا ئەنێن کە گۆڕانی دەوڵەتی مادبەپارس گۆڕانێکی دەست کردی مادەکان خۆیا بووە لەبریتی کوڕی شا، کچە زاکەی بۆتە فەرمانڕەوا، کە ئەمە گرنگیەکی مێژوویی ئەوەندەی نییە، تەنانەت ئەم گۆڕانەش بە لابردنی تەواوی دەوڵەتی ماد نازانن. ئەگەر کەوتنی تەواو بوایە شێوەیە وشەی ماد لەدواییدا بەکار نەئەهات. وشەی ماد لەدوایشدا وا بەکار هاتووە لە سەردەمی داریوش دا بە دەوڵەتی کورش وتراوە دەوڵەتی ماد کتێبی عەزرا فەسڵی ٧ ئەڵێت( پایتەختی کورش – پایتەختی ماد بە دەوڵەتی پارس وتوە دەوڵەتی پارس و ماد. ئەحمەد ڕەفیق ئەنووسێ و ئەڵێ بە هاوکاری هەردوو ئەتەوەی مادو پارس دەوڵەتی ئێران پێك هات. بەم شێوەیە پاش تێپەڕ بوونی ماوەیەکی دوورو درێژ بەسەر ئەم بەسەرهاتە ئیتر ئەدییە فارسەکان لەوە زیاتر پێ یان خۆش ئەبوو ولاتێك لەلایەن فارسەوە فەرمانڕەوایی بکرێت و بە( ماد ) ناودارببێت، هەر

---

[165] کتێبی – نخبە الازهریە ل ٥٢٠

[166] ئاینە سکەندەری ل ١٨٢

[167] کتێبی ئەستێر فەسڵی یەك ئایەتی ١٩، ١٨، ١٤، ٣ فەسڵی دەیەم ئایەتی ٢ و کتێبی دانیال فەسڵی ٥ ئایەتی ٢٨ -- فەسڵی ٦ ئایەتی ٧ ق ١٢، ١٥ – فەسڵی ئایەتی ٢٠

[168] تاریخ عمومی ئەحمەد ڕەفیق ل ٦٢

چەندە زۆریەی دانیشتوانی ماد بووە بە پارس ناو نەبراو ئیتر وشەی ماد بەکار نەئەهات ئەمەش کارێکی گەورەی کردەسەر مادەکان و وای کرد کە دو دڵی و کینە پەیدا بکات. بۆ ئەوەی جیاوازی دوو بەرەکی پەیدا نەبێت هاتن لە بریتی ناوی( مادوپارس ) وشەی( ئاری یان ) ی بەکار هێنا کەهەردوو نەتەوەی ئاری ئەژادی مادو پارس ئەگرێتەوە.

ئیتر بەو شێوەیە وردە وردە وشەی ئاریان کەوتە سەرزاری خەڵکی و بەکاریان هێنا تاوای لێ هات بووە وشەی ئێران(٥). وشەی ئێران لە سەدەی چوارەمی پێش زاین بە شێوەیەکی گشتی بڵاو بووە، لە بریتی وشەی مادو پارس کە هەموو مێژوەکانی دنیا گەواهی ئەدەن. ئا بەو شێوەیە لە بریتی دوو ناوی سەرەکی مادو پارس وشەی ئێران کەوتە سەر لاپەڕەکانی مێژوو. کورشی هەخامەنشی لە هۆزی( پاسارگارد ) ی فارسی یە وەك هێرۆدۆت ئەڵێت شاری پارساگاد هەر بە ناوی ئەم هۆزەوە ناو نراوە کە لەو ناوچەیەدا جێ گیر بوو ن.کورش بە یەکێك لە پیاوە هەڵکەوتوەکانی جیهان ناو ئەبرێت کە لە تەوراتدا بە ئاز ناوی مەسیح ناو ئەبرێت[١٦٩]. جگە لەوەی کورش بەلای ڕۆژ هەلآتدا پەلی زۆر هاویشتوە دوو دەوڵەتی بەهێز و تواناى ( لیدی و بابل ) یشی لەناو بردوە. ناوی ڕاستی کورش( ئاگرداد ) ە وەك( خودآداد ). وشەی کورش لادەرو کورت کەرەوەی وشەی ( کەی خوشترو ) کە بە ماناى( گەورەی خۆش ڕەفتار ) دێت. وەك باسمان کرد کەی بەماناى گەورە دێت خۆشترو بەماناى خۆش ڕوو دێت کە ڕاستیەکەی ←( کەیخسرەو ) ە. وردە وردە ناز ناوەکە لە بریتی ناوەکە بەکار هاتوە و ناوەکە بیر چۆتەوە. یانی کەیخسرەو بۆتە کورش. کورش ماوەی( ٣٠ ) ساڵ شاهەنشاهی کردوە. گۆڕەکەی لە شاری( مەغارب ) دایە، نووسراوێکی بەخەتی بزماری لە پاش بەجێ ماوە.

---

[١٦٩] کتێبی ئەشعیا فەسڵی ٤٥.

## بەندی پێنجەم

## زاناو ئەدیبەکانی کوردستان

لەبەر ئەوەی کتێبخانەکانی شاری سنە زۆر دەوڵەمەند نی یە بە شێوەیەکی گشتی نەمتوانی هیچ ئاگاداریەك لە زاناو ئەدبیە کوردەکان بەدەست بهێنم لە پێش ئیسلامدا.

ئەوەی زیاتر خۆم پێوە ماندوو کرد و توانیم زانیاریەکی لەسەر بەدەست بێنم زاناو ئەدبیە کوردەکانی دوای سەدەی سێ یەمی کۆچی یە ئەوەی بۆم کراوە درێغیم نەکردوە لە ڕوون کردنەوەی ژیان و مردن و لەدایك بوونیان بە کوردتی. لەم بەشەدا باسی زاناو ئەدبیە کوردەکانی شاری سنەم نەکردوە چونکە لەمێژووی شاری سنەدا بە درێژی لەم باسە دواوم.

١) ئەبو محەمەد( عبدالله ) بن مسلم دینەوەری – مەشهوور بە( ابن قتیبه ) قازی شاری دینەوەر بووە. لە ساڵی( ٢٣٣ )ی کۆچی هاتۆتە دنیاوە و ساڵی( ٢٧٦ ) ی کۆچی دنیای بەجێ هێشتووە. زانایەکی بەرزو بەڕێز بووە خاوەنی گەلێ نووسراوی بەکەڵکە کە نزیکەی( ٢٠ ) کتێبە.

٢) ئەبو حەنیفەی دینەوەری – زانایەکی بەهۆش و ناوداری سەردەمی خۆی بوە لە ساڵی( ٢٨١ ) ك لە دنیا دەرچووە.

٣) ئەبو عبدالله محمد بن چار منجم حەرانی بن سنان رەقی – خاوەنی نووسراوی – زیج حایی مطالع البروج، رساله الاتصالات، شی کردنەوەی چوار نووسراوی – بە تلیموس – و هتد. زانایەکی ئەستێرە ناس ڕیازیات و علوم زان بووە لە سەر تا سەری ئەوروپادا ناوبانگی زانایی هەیە ساڵی( ٢٦٤ ) ی کۆچی هاتۆتە دنیاوە و( ٣١٧ ) ی کۆچی هێشتووە.

٤) ئەبو جەعفەر( ئەحمەد ) دینەوەری – کوڕی ابن قتیبه بوە پیاوێکی زانا بووە ساڵێ( ٣٢١ ) ی کۆچی بۆتە قازی میسرو ساڵی( ٣٢٢ ) ی کۆچی لە دنیا دەرچووە.

٥) ئەبو بەکر محەمەد نقاش موسڵی – کوڕی حەسەن کوڕی محەمەد کوڕی زاید کوڕی هارون جەعفەری کوڕی سەنەدی یە جگە لە نەخش و نیگار زانیاریەکی تەواویشی لەسەر ئاینی ئیسلام هەبووە. لەساڵی( ٢٦٥ )ی کۆچی لە دایك بوە و ساڵی( ٣٥١ ) ك

له سێ ی شەوالدا لەدنیا دەرئەچێ خاوەنی گەلێ نووسراوی بەسوود و گرنگە بەلأم لە گێرانەوەی هەندێ حەدیسی پێغەمبەر دخ هەڵەی کردوە و بە ڕاست نازانرێ..

٦) سرِی رفاو موسلی ئەبو حەسەن کوڕی سرِی کەندی یەکێك لە ئەدیبە ناودارەکانی موسڵ، هونەرێکی زیرەك و ئەدیبێکی بەتوانا بووە خاوەنی کتێبی( محب و محبوب )و( یره ) یە لە سالی( ٣٦٦ ) دا لەدنیا دەرچووە.

٧) شیخ عبدالله روباری – یەکێ بوە لە گەورە پیاوانی تەریقەت ناسراوی ناوچە و دەور و بەری خۆی بوە سالی( ٣٦٩ ) ك لە دنیا دەرچووە.

٨) ابن جونی ئەحوی موسلی – ناوی عوسمانە و ناز ناوی ابو الفتح – ە لە زانیاری عەرەبی و ئەدەبیاتی عەرەبدا دەستێکی بالأی هەبووە. پێش سالی( ٣٢٠ ) ك لە دایك بووە لە( ٢٨ ) ی سەفەری سالی( ٣٩٢ ) ی کۆچی لە دنیا دەرچووە. خاوەنی زیاتر لە( ٢٥ ) نووسراوی بەکەڵکە.

٩) ابن کەجی دینەوەری – قازی یوسفی کوڕی ئەحمەد کوڕی کەج بەیەکێك لە پێشەوایانی شافعی ئەژمێررێ خاوەنی فتوای تایبەتیە لە مەزهەبی شافعی دا جگە لە زانیاری ئاینی خاوەنی گەلێ کتێبی بەکەڵکە پیاوێکی دەوڵەمەندو پارەدار بووە. شەوی ٢٧ ی ڕەمەزانی سالی( ٤٠٥ )ك چەند دزێك شەو لەخەودا ئەیکوژن و پارەکەی ئەبەن.

١٠) شێخ ئەبو حەسەن هەکاری – شیخ الاسلام عەلی کوڕی ئەحمەد کوڕی یوسف کوڕی جەعفەر کوڕی غورفە سالی( ٤٠٩ ) ك لەدایك بوە، پیاوێکی زاناو ویندار بووە کوڕەکانیشی ئەدیب بوون سالی( ٤٨٦ ) ك کۆچی دوایی کردوە.

١١) ئەبو ئەحمەد شارەزووری – قاسم کوڕی عەلی کوڕی قاسم – ئەبو ئەحمەد شارەزووری بەبابا گەورەی هەموو قازیەکانی شارەزوور و موسڵ و شام و جزیرە ئەناسرێ. کوڕەکانی هەموویان پیاوی ئاینی و ئەدیب و مامۆستا بوون سالی( ٤٨٩ ) کۆچ لە شاری موسڵ نێژراوە.

١٢) قازی ئەبو حەسەن خەلعی موسلی – عەلی کوڕی حەسەن کوڕی کوڕی حوسەین کوڕ محمدی شافعی یە سالی( ٤٠٥ ) کۆچی لەدایك بووە لە مانگی ژو الحجەی سالی( ٤٩٢ )ك لەدنیا دەرچووە.

١٣) ابو محمد عبدالله مەشهور بە( قازی مرتچی ) کوڕی ئەبو ئەحمەدی شارەزووری پیاوێکی زیرەك و ناگق لە خوا نزیك بووە سالی( ٤٦٥ ) ك لە دایك بووە و لەمانگی ربیع الاولی سالی( ٥١١ ) ك لە دنیا دەرچووە.

١٤) جەریری شیخ ابو محمد( قاسم ) کوڕی عەلی کوڕ محمد کوڕی عوسمان خاوەنی گەلیٚ نووسراوی بەکەلکە شیٚخی زەمەخشەری لە مەدح و وەسفی دا ئەلێت :

| | |
|---|---|
| اقسم بالله و اياته | ومشعر الحج و ميقاته |
| ان الحريری حری بان | نكتب بالتبر مقاساته |

سالی( ٤٦٦ ) کۆچی لەشاری حەریری سەر برپارێزاگای هەولێر لە دایك بووە لە( ٥١٦ ) ی کۆچی دا لەهەمان شاردا نێژراوە.

١٥) ابن مازن دینەوەری – ابو الفضل ئەحمەد کوڕی محمد کوڕی فەزلٚ کوڕی عبدالخالق دینەوەری ناودار بە کاتب لە خەت و پەخشاندا دەستێکی بالای هەبووە سالی( ٤٧١ ) لە دایك بومو( ٥١٨ ) ی ك لە دنیا دەرچووە.

١٦) قازی الخافقین –ئەبو بەکر محمد کوڕی ئەحمەد کوڕی قاسم شارەزووری. سالی( ٤٥٣ ) کۆچی لەدایك بووە. هەرچەندە لەسەر هەلس و کەوت و زانایی ئەم پیاوە بنووسریٚ هەر کەمە سالی( ٥٣٨ ) لە شاری بەغدا لە دنیا دەرچووە.

١٧) مهذب الدین الموسلی – ابو الحسن عەلی کوڕی ئەبی الوفاو سالی( ٤٥٢ ) ك هاتۆتە دنیاوە و لە( ٥٤٣ ) ی ك دنیای بەجیٚ هێشت. بە یەکێك لە شاعیرە ناودارەکانی سەردەمی خۆی ئەژمێررێت دیوانی شیعری لە دوو بەرگدا نووسراوە.

١٨) ابن دری الموسلی – یوسف بن درە - شاعیرێکی لاو و ناودار بوە سالی( ٥٤٥ ) کۆچی لە رێگای حەج لەگەلٚ چەند کەسێکی تردا تیاچووە.

١٩) ابوالکرم شارەزووری – پیاوێکی زاناو زیرەك بوە لە سالی( ٥٥٠ ) ی ك لەدنیا دەرچووە.

٢٠) شێخ عدی هەکاری – کوڕی مسافر کوڕی اسماعیل پیاوێکی زۆر زیرەك و بەدین بوە زیاتر ناوبانگی لەدەرەوەی هەکاری دا بووە. خۆشەویستی خەلکی ناوچەکە بوە تا

ڕادەیەك ڕزق و خێر و خۆش خۆیان لە بەرەكەتی شێخ( عدی ) یەوە زانیوە. ساڵی( ٤٦٧ )ك لە هەكاری لەدایك بوومو ساڵی( ٥٥٧ ) لە دنیا دەرچووە.

٢١ ) ابن برزی جزیری ابو القاسم عمر لە جزیرەی ابن عومەر. ئیمام مدرس و مفتی بووە. ساڵی( ٤٧١ ) كە هاتۆتە دنیاوە لە مانگی ربیع الاول ی ساڵی( ٥٦٠ ) ك لە جزیرەی ابن عومەر نێژراوە.

٢٢ ) ابو نجیب چیاو الدین سەهرەوەردی – یەكێك بوە لە خاوەن تەریقەتەكانی سەردەمی خۆی لە شاری بەغدا لای ڕۆژ ئاوای دیجلە تەكیەیەكی گەورەی بووە. ئەم پیاوە هەرچەندە بەڕەگەز عەرەبە بەلام لەبەر ئەوەی باوك و دایك و زۆربەی كەس و كاری لە كوردستاندا ژیاوە هەڵس و كەوتو داب و نەریتی كوردەواری وەرگرتومو بە كورد ناسراوە. خەڵكی دێ ی( سوورەبەرد )ی ناوچەی گەڕوسی سنەیە لە ساڵی( ٤٩٠ ) ك هاتۆتە دنیاوە.ساڵی( ٥٦٣ ) ك لە شاری بەغدا بەخاك سپێرراوە.

٢٣ ) مەلا خدری ئەربیلی. ابو العباس خضر كوڕی نصر خاوەنی گەلێ بەرهەمی بەسوودە( ٢٦ ) خوتبەی پێغەمبەری كۆكرەۆتەوە. ساڵی( ٤٨٧ ) ك هاتۆتە دنیاوە ساڵی( ٥٦٧ ) ك لە قوتابخانەكەی خۆی شاری موسڵ نێژراوە.

٢٤ ) قازی كمال الدین شارەزووری –ابو الفچل محمد نوری ابی محمد عبدالله كوڕی ئەبی ئەحمەد قاسم شارەزووری. ساڵی( ٤٩٢ ) ك هاتۆتە دنیاوە پیاوێكی زیرەك و قسە ڕەوان بووە خاوەنی زانیاریەكی چاك بووە لە هەندسەدا. قوتابخانەی لە( موسڵ، مەدینە، ئەسیبین، دیمەشق ) كردۆتەوە لە مانگی محەرەمی ساڵی( ٥٧٢ )ی ك لەدنیا دەرچووە.

٢٥ ) رچی الدین اربیلی – ساڵی( ٥٠٨ ) ك لە دایك بوە. پیاوێكی زیرەك بوە و خزمەتی موسوڵمانی كردووە. لە قوتابخانەی ئەمیرزەینەدین و كەمالیە مودەریس بووە. ساڵی( ٥٧٦ ) ی ك لەدنیا دەرچووە.

٢٦ ) شێخ ئەحمەدی جزیری – مەشهور بە مەلای جزیری لە جزیرەی ابن عمر ) لە بۆتان هاتۆتە دنیاوە. پیاوێكی بە دین و شاعیرێكی بەرزی كوردە ساڵی( ٥٧٩ ) ك لەهەمان شوێن نێژراوە.

٢٧ ) ابو الفرج ابن دهان الموصلی - عبدالله ی کوڕی ئەسعەد کوڕی عەلی کوڕی عیسا لە شاری حمص لە شام بە دەرس وتنەوە خەریك بووە. شاعیرێکی ناوداری سەردەمی خۆیەتی ساڵی ( ٥٢٣ ) ك هاتۆتە دنیاوە لە ( ٥٨١ ) دا مردووە.

٢٨ ) موفق الدین شاعری اربیلی لە ساڵی ( ٥٣٦ ) ك چاوی بەدنیا هەڵ هێناوە لە ساڵی ( ٥٨٥ ) ك دا ماڵ ئاوایی کردوە. دەستی لە ( نحو - صرف - بلاغە ) ی شیعردا لە گەلێ قوتابخانەدا مودەریس بوە بە تایبەتی کتێبی ئەقلیدسی یونانی بە دەرس و تۆتەوە.

٢٩ ) شێخ محی الدین شارەزووری - ابو حامد محمد کوڕی قازی کمال الدین بوە لە قوتابخانەکانی ( کمالیە و نقامیە )ی موسڵدا دەرسی و تۆتەوە. قازی دیمەشق و موسڵ بووە لە ساڵی ( ٥٤٠ ) ی ك هاتۆتە دنیاوە. لە ( ٥٨٠ ) کۆچی دا لە دنیا دەرچووە.

٣٠ ) شهاب الدین سەهرەوەردی - حەکیم شەهید ابو الفتح - یحی کوڕی حەبەش کوڕی ئەمیر خوشکەزای شهاب الدین و ابو حفص عومەر. ساڵی ( ٥٤٩ ) ك هاتۆتە دنیاوە. خاوەنی گەلێ بەرهەمی بەسوودو نرخ دارە لە فەلسەفەو اصولی فقە و هەموو زانستێکدا بە هەڵکەوتووی سەردەمی خۆی ئەزانرێ. ئەمەش نموونەیەکە لە وتەکانی " لو کان فی الوجود شمسان، لانکمست الارکان، تابی النقام ان یکون غیر ماکان ". بەهۆی کینە کێشان و ڕق لێ بوونی هەندێ کەسەوە لەلایەن - صلاح الدین ی ئەییوبییەوە - بەند ئەکرێ لە ساڵی ( ٥٨٧ ) ك لەبەغدا ئەمرێت.

٣١ ) ابو الفرج شمس الدین - محدپ حرانی - ساڵی ( ٥٠٥ ) ك هاتۆتە دنیاوە پیاوێکی زیرەك و هۆشمەند بوە بۆ پرسیارو ڕوونکردنەوەی ئیسلام سەرچاوەبووە. ساڵی ( ٥٩٦ ) ی کۆچی لەدنیا دەرچووە.

٣٢ ) ابو عەلی شاتانی - ساڵی ( ٥١٠ ) ی کۆچی هاتۆتە دنیاوە جگە لەوەی لە اصولی فقە و بەلاغەدا دەستی هەبووە. شاعیرێکی ناوداریش بووە لە ٥٩٩ کۆچیدا لە شارۆچکەی ( شاتانی ) ناوچەی دیاربەکر کۆچی دوایی کردوە.

٣٣ ) جریر مقدی - کوڕی ڕیان کوڕی سبە، باوکی لە ئەداری و برسا مردوە جریر خەڵك بەخێوی کردوە و بە هەتیوی گەورە کراوە. شاعیر بوەو

گەلێ شیعری لە پاش جێ ماوە ساڵی( ٦٠٣ ) ك لە شاری موسڵ دەرمان خواردکراوە.

٣٤ ) ابن اثیر - مجد الدین جزیری ساڵی( ٥٤٣ ) ی کۆچی هاتۆتە دنیاوە پیاوێکی زۆر زاناو زیرەك و موسوڵمان بووە خاوەنی گەلێ بەرهەمی بەنرخ و سوود بەخشی ئیسلامیە لەدوا دوای ژیانی خۆی لە خەڵك دابڕاو بە تەنها خەریکی خوا پەرستی و نووسین و خزمەتی موسوڵمانان بووە - ساڵی( ٦٠٦ ) ك لەدنیا دەرچوو.

٣٥ ) ابو حامد بن یونس – عماد الدین محمد ساڵی( ٥٣٥ )ك هاتۆتە دنیاوە پیاوێکی خوا پەرست بووە. لە زۆربەی قوتابخانەکاندا دەرسی وتۆتەوە. کراوە بە قازی لە شاری موسڵ. گەلێ بەرهەمی ئیسلامی لە شوێن جێ ماوە. لە مانگی جماد الپانی ساڵی( ٦٠٨ ) ك لەدنیا دەرچووە.

٣٦ ) ابو الفضائل امدی – دیار بەکری – عەلی کوڕی مظفر الدین یوسف یەکێك بووە لە ئەدیبە ناودارەکانی سلێمانی. ماوەیك قازی شاری( واسط ) بووە. دیوانی شیعرو گەلێ نووسراوی( نحو صرف ) ی لە پاش جێ ماوە لە ساڵی( ٥٥٩ ) ی ك هاتۆتە دنیاوە لە ساڵی( ٦٠٨ ) دا کۆچی دوایی کردوە.

٣٧ ) یاقووتی موسڵی – ابو الدرین عبدالله الموصلی – ساڵی( ٥٢٦ ) ی کۆچی هاتۆتە دنیاوە لە( ٦١٨ ) دا لە دنیا دەرچووە. زانایەکی( بەرزو نووسەرێکی ناودار بووە.. بەرەگەز دەگەڕێتەوە سەر - تورك – بەڵام لەبەر ئەوەی لە کوردەواری دا ژیاوە بە کورد ئەناسرێ.

٣٨ ) عزالدین ابو القاسم( نصر ). برازای مەلا خدری ئەربیللی یە کە باسمانکرد. لە لایەن سوڵتانەوە دوور ئەخرێتەوە بۆ شاری موسڵ لە ساڵی( ٥٢٤ ) لە دایك بومو لە جماد الپانی( ٦١٩ ) ی کۆچیدا مردوە.

٣٩ ) بهاو سنجاری – ابو السعادات( اسعد ) بن یحیی ساڵی( ٥٣٣ ) هاتۆتە دنیاوە پیاوێکی ئەدیب و شاعیرێکی ناودارە. گەلێ شیعری جوانی لە پاش بەجێ ماوە لە ساڵی( ٦٢٢ ) ی کۆچی لە شاری سنجار لە دنیا دەرچووە. لە مەزهەبی شافعی دا ڕای تایبەتی هەبووە.

٤٠) شرف الدين ئەحمەد ابو الفچل بن علامە كمال الدين ابی الفتح سالی( ٥٧٥ ) ك هاتۆتە دنیاوە زانایەکی زیرەکی ئیسلامی بووە. دەستی لە شیعردا هەبووە لە سالی( ٦٢٢ ) ی ك کۆچی دوایی کردوە.

٤١) شەرەف کوری چیاو الدین محمد سالی( ٥٨٠ ) هاتۆتە دنیاوە لە سالی( ٦٢٢ )ك لە دنیا دەرچووە. پیاوێکی زانا بووە. دەستی هۆنراوەیشی هوبوە.

٤٢) نجم الدين شاعر مەشهور بە ابن صابری مەنجەنیقی – یەکێکە لە ئەدیبە ناودارەکان جگە لە زانیاری و ئەدەبیات دەستی لە دروست کردنی مەنجەنیق دا هەبووە. کتێبی( عمدەالسالك فی سیاسە الممالك ) لە دانراوی ئەم ئەدیبەیە. کە باسی هونەری شەرو شۆرو سوار چاکی و چۆنیەتی گرتنی قەلاو کردنە دیوار ئەکات. دیوانێکی شیعری هەیە بە ناوی( مغانی المعانی ) لە سالی( ٥٤٤ ) هاتۆتە دنیاوە لە( ٦٢٦ ) ك مردوە.

٤٣) ابن اپیر عزالدین جزیری – ابو الحسن علی بن الكرم محمد سالی( ٥٥٥ ) ك هاتۆتە دنیاوە پیاوێکی زاناو مێژوو نووس بووە. مێژووی سەرەتای مێژوو تا سالی( ٦٢٨ ) ی ك نووسیوە خاوەنی گەلیٚ بەرهەمی ئەدەبی ترە لە سالی( ٦٣٠ ) ك لە شاری موسلٚ مردوە.

٤٤) ابو الحسن ئامدی – مەشهوور بە سیف الدین علی کوری ابی علی حمد – سالی( ٥٥١ ) ك هاتۆتە دنیاوە لە سەرەتاوە لە سەر مەزهەبی حەنبەلی بووە. لە پاشدا بۆتە شافعی هاورێ یانی بە پیاوێکی فاسد ناویان بردوە. خاوەنی گەلیٚ بەرهەمی بە سوودە سالی( ٦٣١ ) ی ك لە دنیا دەرچووە. پایەیەکی بەرزی هەبووە لە( علومی عقلیە ) دا.

٤٥) صلاح الدين اربيلی – ابو العباس ئەحمەد کوری عبد السيد سالی( ٥٧١ ) ك هاتۆتە دنیاوە شاعیرێکی ناودار بووە خاوەنی گەلیٚ غەزەل و روباعیات و قەسیدەیە لە سالی( ٦٣١ )ك لە دنیا دەرچووە.

٤٦) شێخ شهاب الدين سەهرەوەردی – ابو حفص عومەر کوری محمد کوری عبدالله سالی( ٥٣٩ ) لەدایك بووە، پیاوێکی ئاینی خاوەن تەریقەت بووە هەمیشە بە خواپەرستی و ئامۆژگاری خەلکەوە خەریك بووە. خاوەنی چوار کتێبی ئاینی یە.(

شیخ سەعدی شیرازی) موریدی ئەو بوە لە سالی( ٦٣٢ ) ی کۆچی لە شاری بەغدا نێژراوە.

٤٧ ) شێخ شهاب الدین( عومەر) شارەزووری شێخی ئیرشاد بوە بە پیاوێکی خوا پەرست و ئەولیا ناوبراوە لە سالی( ٦٣٣ ) لە شارەزوور کۆچی دوایی کردوە.

٤٨ ) ابن اپیر چیاو الدین جزیری - ابو الفتح نصر الله کوری ابی کەرەم - جگە لەوەی هەموو قورئانی لەبەر بووە سێ دیوانی شیعری ابی تمام بحتری و متنبی و( ٥ ) هەزار حەدیسی پێغەمبەری لەبەر بووە. سەردەمی ملك افچل بە پلەی وەزیری گەیشتووە گەلێ بەرهەمی لە پاش بەجێ ماوە. سالی( ٥٥٨ ) هاتۆتە دنیاوە. سالی( ٦٣٧ ) لە دنیا دەرچووە.

٤٩ ) ابن مستوفی - شرف الدین اربیللی ابو البرکات( مبارك) کوری ابی فتح احمد مستوفی لە سالی( ٥٦٤ ) ك هاتۆتە دنیاوە پیاوێکی زۆر زیرەك و ڕوو خۆش و سنگ فراوان بووە. دەستێکی بالای هەبووە لە زانیاری مێژوودا. شارەزایی لە زمانی عەرەبیدا زۆر بووە. وەك - صرف ، نحو، مێژووی شاری هەولێری نووسیوە. پاش خۆی گەلێ نووسراوی بەکەلکی بەجێ هێشتوە. سالی( ٦٢٩ ) کە تا پلەی وەزیری ئەگات. سالی( ٦٣٧ ) ی ك مالێ ئاوایی لە دنیا کردوە.

٥٠ ) کمال الدین علامە - ابو الفتح موسی کوری ابو الفضل بە( ابن یونس) موشهوور بووە لە( ٥ ) ی سەفەری سالی( ٥٥١ )ی ك هاتۆتە دنیاوە لە شاری موسل. بۆ خوێندن چۆتە شاری بەغدا و لە پاشدا گەراوەتەوە شاری موسل ئەم پیاوە مەزنە لە( فیزیا، و کیمیا و جەبرو هەندەسە و گب و ریاچیات و نحو و صرف) دا زۆر شارەزا بووە دەرسی وتۆتەوە. جولەکەکانی موسل لای ئەم دەرسی تەوراتیان خوێندوە پیاوێکی زۆر زیرەك و شارەزا بووە سالی( ٦٣٩ ) لە ١٤ ی شەعباندا کۆچی دوایی کردووە.

٥١ ) ابو البقاو نحوی - مەشهوور بە ابن صایغ موصلی سالی( ٥٥٦ ) ی ك هاتۆتە دنیاوە. ئەم پیاوە خزمەتێکی زۆری کردوە بە ئەدەبی عەرەبی و ئیسلامی لە سالی( ٦٤٣ ) ك لە شاری حەلەب و مەزارگای ابراهیم خلیل نێژراوە.

٥٢ ) علم الدین سنجاری - لە زانیاری( عقلیه و نقلیه ) هاوچەرخی نەبووە. گەلێ نووسراوی بەکەلکی لە پاش بەجێ ماوە سالی( ٦٤٣ )ی کۆچی لە دنیا دەرچووە.

٥٣) ابن صلاح نصری شارەزووری – لە سالی( ٥٧٧ ) ك هاتۆتە دنیاوە بە( فاچل دیمەشقی ) ناودارە، ئەم زانایە لە قدس و دیمەشق و حەلەب دەرسی وتۆتەوە. خاوەنی ڕای تایبەتی یە لە مەزهەبی شافعی دا سالی( ٦٤٣ )ی ك لە شاری دیمەشق لە دنیا دەرچووە.

٥٤) ابن الحاج سالی( ٦٥١ ) لە دنیا دەرچووە چەند نوسراوێکی لە پاش جێ ماوە.

٥٥) ابن الحاجب ابو عمر( عوسمان ) کوڕی عومەر. لەسالی( ٥٧٠ ) لە دایك بووە لە خزمەت کردنی ئاینی ئیسلام درێغی نەکردوە لە سالی( ٦٤٦ ) ك لە دنیا دەرچووە.

٥٦) قازی ابن خەلەکان اربیللی – شمس الدین ابو العباس ئەحمەد کوڕی ابراهیم لە سالی( ٦٠٨ ) ك هاتۆتە دنیاوە لە سالی( ٦٨١ ) ك کۆچی دوایی کردوە. گەلێ نووسراوی بەکەڵك و سوود بەخشی لە پاش خۆی جێ هێشتووە.

٥٧) فخر الدین ئەحمەد کوڕی حسین چارپەردی لە سالی( ٧٤٧ ) ی ك لە دنیا دەرچووە.

٥٨) فەقێ تەیران – مەلا مەحموود خەڵکی( مەکس ) لە سالی( ٧٣١ ) ی ك هاتۆتە دنیاوە شاعیرێکی ناودارو لێ هاتوو بووە، خاوەنی گەلێ قەسیدەی شیعری جوانە لە سالی( ٧٩٥ ) ی ك لەدنیا دەرچووە.

٥٩) قازی ئەحمەد ئەرزنجانی بورهان الدین – لە سەرەتای سەدەی هەشتی کۆچی سالی( ٨٠٠ ) لە شەڕی ئەرزنجاندا کوژراوە.

٦٠) ئیمام محمدی کوردی حافظ الدین کوڕی محمد کوردی لە سالی( ٨٣٠ ) ی ك لە دنیا دەرچووە.

٦١) مەلای باگی – مەلا ئەحمەدی باگی خەڵکی باگیەی هەکاری لە سالی( ٨٣٦ ) ی ك هاتۆتە دنیاوە شاعیرێکی ئیسلامی چاك بووە دەربارەی لە دایك بوونی پێغەمبەر هۆنراوەی نووسیوە. سالی( ٩١١ ) ی ك لەدنیا دەرچووە.

٦٢) مەلا عەلی تەرمووکی لە سالی( ١٠٠٠ ) ك هاتۆتە دنیاوە یەکێکە لە زانا ناودارەکانی لەزانیاری ڕسم وریاضیات دادەستێکی بالای هەبووە. زۆربەی ژیانی بە دەرس وتنەوە بەسەر بردوە لە دێ کەی خۆیدا( تەرموك ) لە نێوان هەکاری و( مەکس ) دا سالی( ١٠٦٥ ) بە خاك سپێرراوە.

٦٣ ) ئەحمەدی خانی – یەکێك لە ئەدیبەبەرزو بەرێزەکانی کورد پیاوێکی شەیداو هۆنەرێکی خۆشەویست بووە. گەلێ نووسراوی بە عەرەبی و تورکی جێ هێشتووە لە هۆزی – خانێ – کانە، چیرۆکی ( مم وزین لە شاکارە هەر جوانەکانی خانییە . سالی ( ١٠٧١ )لە شاری بایەزید لە مزگەوتەکەی خۆیدا نێژراوە.

٦٤ ) ئیسماعیل معروف لە سالی( ١٠٧٣ ) ك هاتۆتە دنیاوە. خەلکی شاری بایەزید بوە بە فیردوسی کورد مەشهوورە گەلێ غەزەل و پەخشانی نووسیوە، نووسینەکانی بە زمانی کرمانجی دارشتوە. سالی( ١١٢٨ ) ی ك لە شاری بایەزید کۆچی دوایی کردووە.

٦٥ ) ئەمیر شەریف خان – لە ئەمیرەکانی ناوچەی هەکاری یە خاوەنی گەلێ بەرهەمی بەنرخی وەك و شیعرو صرف و نحو – ە خاوەنی چەندین دیوانە لە سالی( ١١٠٨ ) ی ك لە شاری چۆلەمێرگ هاتۆتە دنیاوە لە سالی( ١١٦٧ ) ی ك مالێ ئاوایی لە دنیا کردوە.

٦٦ ) مەولانا خالدی شارەزووری – جگە لەوەی زانایەکی ئاینی بووە. پیاوێکی خاوەن تەریقەت و ئیرشادیش بووە. لە سالی( ١١٩٣ ) ك لە ولاتی شام بە گۆرستانی ئەیوب کودر سپێرراوە.

٦٧ ) ابن الحاج – خاوەنی( رفع الخفاو ) کە لە کتێبی سیوگی حاشیەی نووسیوە مامۆستای شێخ معروف باوکی کاك ئەحمەدی شێخەو لە سەرەتای سەدەی( ١٢ ) ی کۆچی لەدنیا دەرچووە.

٦٨ ) مەلا یونسی هەلکاتینی : - لە ئاوایی هەلکاتین لە دایك بووە. و لە سەدەی دوانزەهەمدا هەر لەوێ بەخاك سێرراوە خاوەنی سێ نووسراوی مەشهوورە لە( نحو، صرف، ترکیب )دا.

٦٩ ) مراد خانی بایەزیدی – لە سالی( ١١٥٦ ) ی کۆچی لە شاری بایەزید لە دایك بووە. خاوەنی گەلێ هۆنراوەی جوان و بەرزە لە عەشق و سۆفیگەری. لە سالی( ١٢٠٣ ) ی کۆچی لە دنیا دەرچووە.

٧٠ ) مەستووری کورد –( ماهر شەرەف خانم ) – کچی ابو الحسن بەگ لە بابا گەورەی دایکەوە ئەچێتەوە سەر خانەدانی قادری خێزانی خەسرەو خانی ئاکام والی کوردستانی( سنه ) بووە.

مێژووی زنجیرەی ئەردەڵانیەکانی بە ڕێکوپێکی نووسیوە خاوەنی گەلێ هۆنراوەی جوانە گەلێ لە هۆنراوەکانی چاپکراوە.

ئەم زاناو پیاوە هەڵکەوتوانەی خوارەوەش لە نەتەوەی کوردن. بەڵام لەبەر ئەوەی نەمانتوانی زانیاری تەواو لەسەر ژیانیان بەدەست بهێنین هەر بەدیاری کردنی ناوەکانیان واز ئەهێنین : ابو القاسم حماد الرادە. ابو اسحق طهیر الدین، قاچی ابراهیم موسلی، شێخ عبدالقادری شارەزووری، محی الدین شارەزووری. شێخ تاج الدین کوردی یەکێك بووە لە وەزیرەکانی کابینەی سوڵتان ئۆرخانی دووەم. سوڵتانی تورکیا.

ئەم زانایانەی تریش لە هەڵکەوتوەکانی سەدەی سیانزەهەمی کۆچین : -

١- مەلا محمدی مۆدن – مامۆستا سەید حەسەنی چۆڕی لە زانایانی سابلاغە.

٢- مەلا محمدی ئادەم – خەڵکی باڵەکیانی ناوچەی ڕەواندوزە.

٣- مەلا یەحیا میرەوەری – خەڵکی ناوچەی ڕەواندوزە.

٤- مەلای خەتێ – خەڵکی ناوچەی خۆشناوەتی و ڕەواندوزە پیاوێکی زۆر زانا بوە.

٥- محمد جسیم( حجە الاسلام)ی سنەو مەلا ئەحمەدی نۆدشەیی فەقێ ی مەلای خەتێ بوون.

٦- مەلا محمدی کەوانە دۆل – خەڵکی ڕێژاو بووە، دانایەکی ناودارە.

٧- موفتی زەهاو – مەلا محەمەد خەڵکی زەهاو بووە.

٨- مەلا خدری نالی – بەیەکێك لە شاعیرە ناودارە مەزنەکانی کورد ئەناسرێ. خاوەنی دیوانی شیعریە بە کوردی – عەرەبی – فارسی.

٩- مەلا ڕەحیمی تاو گۆزی( مەولەوی ) یا( مەعدووم ) جگە لەوەی زانایەکی بەرزی ئیسلامی بووە. خاوەنی گەلێ هۆنراوەی بەرزە لە عەشق و سۆفیگەری.

١٠- شێخ ڕەزای کەرکوکی – کوڕی شێخ عبدالرحمن لە شێخەکانی ئیرشادن لە ناوچەی تاڵەبان بە زمانەکانی کوردی، عەرەبی فارسی. تورکی شیعری وتووە.

١١- ابن الخیاگ – مەلا عبدالرحمن خەڵکی قەرداغ. زانایەکی ناسراوە.

١٢- عومەر ئەفەندی ئەربیللی.

١٣- عومەر ئەفەندی ڕەواندوزی.

١٤- عەلی ئەفەندی برای عومەر ئەفەندی ڕەواندوزی لە زانیاری ڕەسم ریاچییات دا دەستی هەبووە.

١٥- ئەسعەد ئەفەندی کوڕی عومەر ئەفەندی ڕەواندوزی.

١٦- مەلا گچکە مەلا ئەبو بەکری کوڕی عومەر ئەفەندی ئەربیللی پیاوێکی زانای خواناس بووە.

١٧- حاجی مەلا عبدالله کۆیی - خەڵکی شاری کۆیە بووە پیاوێکی زیرەك شارەزایەکی سەردەمی خۆی بووە. ئەم چوارینە لەسەر یەو وتراوە

حاجی عبدالله لەئادەم فیل ترە

باوجودی رووتبەی پێغەمبەری

ئەم بەسەد شەیتان لە کۆیە دەر نەچوو

ئەو بەیەك شەیتان لە جەننەت دەرپەڕی

١٨- مەلا نەبی ڕەواندوزی - لەزانایانی ناوچەی ڕەواندوز بووە دەستی لە ڕەسم و زانیاری ریاچیاتدا هەبووە.

١٩- حاجی شێخ عەلی کەرکووکی - برای شێخ ڕەزای تاڵەبانی یە، پیاوێکی ئاینی ی خاوەن تەریقەت بووە.

٢٠- مەلا عبدالله ی بیتوشی -خاوەنی کتێبی( کفایە ).

٢١- مەلا محمدی بێتوشی - ماموستایەکی ناسراو بووە.

٢٢- مەلا یوسفی( صم، لە ئاوایی( بەرسێوە )ی ناوچەی سەردەشتدا نێژراوە.

٢٣- مەلا ڕەسووڵی زەکی - زانایەکی ناسراوی ناوچەی موکریان بووە.

٢٤- ابن رسولؒ - ناوی محمد کوڕی ابن رسولی زەکیە. مامۆستای موفتی زەهاوی بووە.

٢٥- مەلا محمدی کوڕی مەلا مستەفا مامۆستاو مدەرسی مزگەوتی( سوور ) لە سابلاغ

٢٦- مەلا محمدی یای - خەڵکی ناوچەی سابلاغە

٢٧- مەلا سلێمانی گردی. خەڵکی ناوچەی گردیان بوە و زانایەکی ناسراوە.

٢٨- مەلا سلێمانی گردی - خەڵکی ناوچەی گردیان بومو زانایەکی ناسراوە.

٢٩- مەلا عبدالله پیرەباب - خەڵکی( دەبەکر ) ی یە لە ناوچەی ئایتمش و سابلاغ دا دەرسی وتۆتەوە.

٢٠- مەلا عەلی تورجان زانیاریەکی تەواوی هەبووە لە رِیاچیاتدا.

٢١- مەلا عبدالقادری بیارە - مدرسی خانەقای بیارە بووە. پیاوێکی خوا پەرست و زیرەك بووە.

٢٢-مەلا عبدالرحمن پێنجوێنی – لە زانا هەڵکەوتوەکانی سەدەمی خۆی بووە لە شیعرو فقە و ریاضیات دەستێکی بالآی هەبووە.

٢٣-شێخ عومەری وەردۆخی قەراداغی – لە بنەماڵەی نووسەری ئەم کتێبەیە لە شاری سلێمانی بەدەرس و تنەوە خەریك بووە . زانیاری لە رِەسم و ریاضیات دا هەبووە

ئەوانەی باسمانکردن ئەوزانا ناودارانانەن کە لە سەدەی( ١٣ )ی کۆچیەوە هەتا سەدەی( ١٢ ) ی کۆچی یەك لە دوای یەك هاتووە. جگە لەو زانایانە لە کوردستاندا گەلێ پیاو چاك و خاوەن تەریقەت و تەکیە هەبووە. وەك : شێخ سراج الدین ی شێخ عوسمانی تەوێڵە کە لە ناوچەی هەورامان و شارەزووردا بە سۆفی گەریەوە خەریك بووە خاوەنی خانەقای تەوێڵە و بیارەن – لە ساڵی( ١٢٨٢ ) ی کۆچی لە خانەقاکەی خۆیدا نێژراوە.

پاش ئەو شێخ بهاو الدین( محەمەد )ی کوری هاتووە لە ٤ی ربیع الاول شەوی هەینی ساڵی( ١٢٩٨ ) ی کۆچی لە تەوێڵە بەخاك سپێرراوە. لە پاشدا شێخ چیاو الدین( عومەر ) برای شێخ بهاو الدین لە خانەقای بیارە بە ئیرشادی و سۆفی گەری خەریك بووە. لە مانگی شەوالی( ١٢١٨ ) لە دنیا دەرچووە. حاجی شێخ ئەحمەدو شێخ عبدالرحمن برای شێخ بهاو الدین بوون پاش ئەوانیش شێخ حسام الدین( عەلی ) کوری شێخ بهاو الدین لە تەوێڵەو بیارە و خورماڵ شارەزوور خاوەنی تەکیە بووە و بە ئیرشادی سۆفیەتیەوە خەریك بووە.

م هەر ئەوەندەم لە توانادا بوو دەربارەی ئەم زاناو ئەدیب و پیاو چاکانە بنووسم هیوام وایە دڵسۆزانی کورد زیاتری بکەن.

باو و باپیرانمان لە سەردەمی سەرەتای دەست پێ کردنی مێژووەوە هەتاکو بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام. پادشاین بەخوا یا رواڵەتی خوا ئەزانی بۆیە هەر خێرو خۆشی رابواردن و پارەو برسیەتی و نەخۆشی و هەژاری و دەردی هەبوایە بە بەخشندەیی ئەویان ئەزانی. هەر شتێك شا بیویستایە و هەر شتێك ئەو ئەفرمتی لێ بکردایە لای

خەڵکیش بەو جۆرە بوو. وەك باو بووە( چ فەرمانی یەزدان چ فەرمانی شا ) بۆیە گەلیٰ جار هەندیٰ لە دەسەڵاتداران لە خۆیان بایی ئەبوون و داوای خوایەتیان ئەکرد وەك( جەمشید، کەیکاوس ) و.... هتد. لەو سەردەمەدا هەر چەندە فەرمانڕەوایی بە ویراسەت بووە بەڵام مەرجی لیٰ هاتوویی و بە توانایییش هەبووە بۆ کەسێك بە فەرمانڕەوا هەڵبژێررایە هەر کەسیٰ لە نەوەکانی فەرمانڕەوا ئەو مەرجانەی تیا بوایە ئەوەیان دیاری ئەکرد. یاخود ئەگەر چەند کەسێکیان ئەو مەرجانەیان تیا بوایە ئەوا وڵاتەکەیان لیٰ بەش ئەکرا. بەڵام سەڵتەنەت هەر بەناوی شای لەدنیا دەرچوو ئەبوو. تاج تەخت و چەك و پاڵەوانانی وڵات لە کۆشکی سەرەکی( شا )دا ئەمایەوە تاوەکو یەکیٰ لە کوڕانی یاخود ئەگەر کچەزایشی بوایە بە مەرجێك لیٰ هاتوو بوایە دەسەڵاتی وەرئەگرت. فەرمانڕەوای تازە ئەگەر کوڕی فەرمانڕەوای مردووش ئەبوایە و چەند پشتێك نێوانیان ببوایە یەکسەر بە کوڕی فەرمانڕەوای مردوو ناو ئەبراو بە کوڕی دائەنرا. لەبەر ئەوە جێگای ئەوەی گرتۆتەوە.

پسر کواندارد نشان از پدر　　　　تو بیگانه خوانش مخوانش پسر

پێشدادیەکان ڕایان وابووە ئەگەر فەرمانڕەوا بەبیٰ کوڕێکی لیٰ هاتوو لە دنیا دەرچوایە ئەوا وەك لاشە دنیای جیٰ ئەهێشت. بەڵام -- ڕۆحەکەی لە دنیای ڕۆحانیدا -- لە چوار چێوەی وڵات و بە تایبەتی لە دەورو بەری کۆشکدا وێڵ و سەرگەردان ئەسوڕێتەوە تاوەکو لە نەوەی ئەو کوڕێکی لیٰ هاتوو بەتوناو دەسەڵات پەیدا ئەبێت. ئەوسا ڕۆحی فەرمانڕەوا تێکەڵ بە ڕۆحی ئەوکوڕە ئەبێت ئیتربۆ خۆی کپ ئەبوەوەو پاشایی ئەسپارد بەو کوڕە. وەك چۆن پەیامبەرێك هاتوە تا پەیدا بوونی پەیامبەرێکی تر هەموو کاروباری ئاینی و مەزهەبی بە ناوی پەیامبەری پێشو بووە. ئا بەو جۆرەش هەموو کاروباری دەوڵەت( شەر، شادی، خێر، خۆشی، سەرگەردانی ) هەر بەناوی فەرمانڕەوای کۆنەوە بووە. تا فەرمانڕەوای تازە هاتووە، وایان زانیوە کە گیانی شا زیندوەو بە دەوریاندایەو ئاگای لیٰ یانە. گومان لەوەدا نی یە کە زۆربەی مێژوو ناسەکان سەرنجی ئەو ڕاستیەیان ئەداوەو بە هەڵە زۆربەی تەمەنی فەرمانڕەوایانیان تۆمار کردوە: گەلیٰ

جار ماوەی فەرمانڕەوایی فەرمانڕەوایەك زیاتر دیاری کراوە لە تەمەنی خۆی بۆ وێنە ئەڵێن : تەمەنی کیومەرس کە لە ساڵی( ٣٢٤١ ) پ ز پەیدا بووە بە سێ سەدەو نیو ناو براوە. هەندێ لە مێژوو نووسان بە سی ساڵ و هەندی تر بە چل ساڵ ناویان بردوە. بەلام ئەتوانین بلێین درێژەی فەرمانڕەوایی کیومەرس تا هوشەنگ لە ڕەگەزی ئەو کە لە( ٣٢٤١ ) پ ز وەتا( ٢٩٩٢ ) پ ز بوە( ٢٤٨ ) ساڵ میانەی هەیە. کەوابوو ڕاستە سێ سەدەو نیوە بەو ڕەسم و یاسایەی کە باسمان کرد. مێژوو نووسەکان ئەڵێن هوشەنگ چل ساڵ فەرمانڕەوا بوە کاتێ لێکی ئەدەینەوە هوشەنگ ساڵی( ٢٩٩٢ ) پ ز بۆتە فەرمانڕەوای – طهمورس –( ٢٩٥٢ ) جێ نشینی بووە. ڕاستە چل ساڵ ئەکات هەروەها پاشایەتی( تەهمووس )( ٣٠ ) ساڵ باس کراوە کەچی تەمەنی بە( ٣٠٠ ) ساڵ دانراوە. ئەگەر بلێین( ٢٩٥٣ ) بۆتە شاو ساڵی( ٢٧٩٥ ) جەمشید کە لە ئەوەی ئەوە فەرمانڕەوایی وەرگرتووە ئەبینین ڕاستە( ١٥٨ ) ساڵ میانەیان هەیە. کەچی وەك ڕەسم و یاسای کۆن ڕاستە هەرچەندە دوو ساڵ جیاوازی هەیە بەلام دوو ساڵ زۆر گرنگ نی یە لە دیاری کردنی مێژوویەکی وا کۆندا. هەندێ فەرمانڕەوایی جەمشید بە( ٧٠٠ ) ساڵی و هەندێ تر بە( ٦٠٠ ) ساڵی ئەنووسن وتمان جەمشید ساڵی( ٢٧٩٥ ) پ ز بۆتە فەرمانڕوا ئەگەر لەگەڵ وەرگرتنی دەسەلاتی فەرمیدون ساڵی( ٢٢١٧ ) پ ز بەراوردی بکەین ئەبینین ڕاستە( ٥٧٨ ) ساڵی ئەکات کە لە وتەی دەمەوە نزیکە. شا هەنشاهی فەرمیدون - یش( ٥٠٠ ) ساڵی دیاری کراوە کە لە( ٢٢١٧ ) پ ز دەست پێ ئەکات تا هاتنی( مەنوچەر ) کە ساڵی( ١٧١٧ ) پ ز ئەکات ئەبینین ڕاستە( ٥٠٠ ) ساڵی فەرمانڕەوا بووە. هەروەها مەنوچەر بە( ١٢٠ ) ساڵی باس کراوە لە( ١٧١٧ ) تا هاتنی( ئەوزەر ) لە( ١٦٣٧ ) هەمل( ١٢٠ ) ساڵی ئەکات کە مێژوو نووسەکان باسیان کردووە. شاهەنشاهی ئەوزەر بە( ٧ ) ساڵی نووسراوە پاش حەوەت ساڵ بەدەستی تورانیەکان شکاو ماوەی سێ سەدەو نیو ئاریەکانی( ئێران ) و ئاریەکانی( توران ) لەلایەك و( ئاشووری ) و ئێران و ئاشوری و کلدانەکان لەلایەکی تر تا ساڵی( ١٠٠٠ ) پ ز دەستەویەخە بوون. لە پاشدا( ئافراسیاب ) لە ئەوەی( نوور ) بوە فەرمانڕەوای ئێران پاش ئەویش( زاب ) کوڕی( تەهماسب ) کە لە ئەوەی( مەنوچەر ) ە ساڵی( ١٢٠٠ ) پ ز پەیدا بوە و فەرمانڕەوایی لە دەست تورانیەکان وەرگرتۆتەوەو ماوەی( ٢٥ ) ساڵی فەرمانڕەوایی

کردوه سالی( ۱۱۹٦ ) پ ز گرشاسب برازای زاب بوه فەرمانڕەواو( ۹ ) سالْ مایەوە. ئا بەم شێوەیە تا سالی( ۸٥۳ ) پ ز زنجیرەی کەیانی سەری هەلْدا.

ماوەی فەرمانڕەوایی پێشدادیەکان لە کیومەرس تا کەیقوبادی کورد نزیکەی( ۲٤ ) سەدەو نیو بوە.

ئا بەم شێوەیە پشتاو پشت فەرمانڕەوایی هاتۆتە خوارەوە، بەو شێوەیەی کە باسمان کرد ماوەی فەرمانڕەوایی و درێژەی تەمەن بەو یاسایە بووە بە هیوای ئەوەی هەندێ کەس لە چەواشەیی ڕزگار بکات.

## " ئەو سەرچاوانەی " بۆ ئەم کتێبە سوودیان لێ وەرگیراوە "

- ئـ -


١- آثار عجم
٢- آینه سکەندري
٣- ابن خلکان
٤- اجر دمیة کردیة( الاب ئول بندر)
٥- اقوام میسو ئوتامي( سثایزر)
٦- التنبة( مسعودي)
٧- القضیة الکردیة( د. بلەچ شیرکو)
٨- المسالك الممالك( ابن حوقل)
٩- انسکلوبیدیاي انطلیس
١٠- ئاویستا
١١- التثقیف

- ب -

١- برهان قاطع
٢- بهجة مصطفویة( مەلا شەریفی دووەم)

- ث -

١- ثسین میرات خلیفة( سید مارك سایکس)

- ت -

١- تاریخ ئاشوور( سیر سدني سمیث)
٢- تاریخ امراء کرد( سلطان ممدوح)
٣- تاریخ امت مجهولة( جیامل)
٤- تاریخ الاکراد( صادق الملك)

٥- تاريخ الأمم الاسلامية( خضري)

٦- تاريخ الأمم و الملوك( ابن جرير تەبەري)

٧- تاريخ الكامل ابن اثير

٨- تاريخ امين زكي بط

٩- تاريخ ايران سرجان ملكم

١٠- تاريخ ايران قديم( استرابون)

١١- تاريخ ايران قديم ثيرنيا

١٢- تاريخ جديد اورمان( مەلا عبدالله)

١٣- تاريخ جودت ثاشا

١٤- تاريخ جيهان نما - حاجي خليفة -

١٥- تاريخ درنە كتاب مێژووی هێرۆدۆتا

١٦- تاريخ سيستان

١٧- تاريخ عالم اراي عباسي

١٨- تاريخ عمومي( ئەحمەد رەفيق)

١٩- تاريخ عمومي اوروپا( بوستون)

٢٠- تاريخ عمومي مؤرخين

٢١- تاريخ عصور قديمة( جيمس هانري برستيد)

٢٢- تاريخ قديم اورمان( مەلا شمريفى قازى)

٢٣- تاريخ قديم شرق ترويل( مستر هول)

٢٤- تاريخ كردستان( فيض اللة بط)

٢٥- تاريخ طزيدة( حمداللة مستوفي)

٢٦- تاريخ ملل قديمة مشرق( ترجمةي فروض)

٢٧- تاريخ مختصر ايران( سر ثرس سايكس)

٢٨- تاريخ منطقي

٢٩- تتبعات ايران( دار مستتر)

٣٠- تجارب الأمم( ابن مسكوية)

٣١- تحفة الاداب في التواريخ و الانساب

٣٢- تقويم البلدان( ابو الفداء)

٣٣- تقويم التواريخ( مهلا شمريفى دووهم)

٣٤- توراة( الكتاب المقدس) كتب محمد عتيق

- ج -

١- جاماسنامة( پير جاماسبى كيهان)

٢- جامع الانساب

٣- جغرافياي مفصل ايران( مسعود كيهان)

- ح -

١- حديقةي الانصاري( صادق الملك)

- د -

١- دائرة المعارف الماني

٢- دائرة المعارف الفرنسي

٣- دائرة المعارف( فريد وجدي)

٤- دبستان المذاهب

٥- دولت عثمانية تاريخي

٦- ديوان الصداقة( ابن حوقل)

- ر -

١- روح المعاني( الوسى زاده)

٢- روضة الصفا

- ز –

١- زبدة الصحائف

- س –

١- سبائك المناهب( سويدي بغدادي)

٢- سياحت در بلاد كرد( هانري بندر)

٣- سياحت نامه( اوليا چەلەبى)

٤- سيرة صلاح الدين( ابن شداد)

- ش –

١- شاهنامه( فردوسي)

٢- شرفنامة( شرف الدين بدليس)

٣- شرق قديم( نورمان)

٤- شوق الستهام( ابن الوحشية)

- ص –

١- صبح الاعشي( قلقشدي

- ع –

- ١- عشق سلطنت( نصري)

- ف –

١- فارسنامة

٢- الفتح القسي اي فتح القدسي

٣- فتوحات اسلامية( سيد احمد دحلان)

- ق –

١ – قاموس فيروز ابادي

٢- قصد الامم( ابن عبدالبر )

- ك –

١- كتاب زرد فرانسة

٢- كرد لر( دكتور فريج)

٣- كفاية الجغرافي( نجم الدولة)

٤- كرد در مقابل ترك

٥- كانها ترجمة( پورداود )

- م –

١- مجمع التواريخ

٢- مجموعة اخبار كرد

٣- مروج الذهب( مسعودي)

٤- مسالك الابصار

٥- معالم العصور الوسطي( ترجمة)

٦- معجم البلدان( ياقوت حموي)

٧- معرفت پير شهريار هەورامى

٨- ملاحظات از كرد( نيكتين )

٩- ميسوپوتامى – ميجر سەن

- ن –

١- نخبة الازهرية( چاپى ميسر )

٢- نزهة القلوب( حمدالله المستوفي)

٣- نور الانوار( سيد عبد الصمد تودارى )

ئەو سەرچاوانەی وەرگێڕ سوودی لێ وەر گرتووە بۆ ڕاست کردنەوەو زانیاری فرە لەبارەی ئەم کتێبەوە بریتین لە : -

١ – شەرەفنامەی شەرەفخانی بدلیسی( وەرگێڕانی هەژار موکریانی )

٢- کوردستان کورد( دکتور عبدالرحمن قاسملو )

٣- مێژوو( دکتور کەمال مەزهەر )

٤- خەبات لە ڕێی کوردستانا( ن. ا. خەلفین وەرگێرانی جەلال تەقی )

٥- فەرهەنگی عەمید( حەسەن عەمید )

٦- مێژووی کوردو کوردستان( شێخ محمد مەردۆخ ) وەرگێڕانی محمد فیدا.

٧- مێژووی کورد و کوردستان( ئەمین زەکی بەگ )

٨- الاکراد( باستیل نیکتین )

سوپاس و پێزانینبۆ..

١- کاك حەسەن هەڵە بجەیی خاوەنی کتێبخانەی" شێخ رەزای تاڵەبانی"

٢- کاك کامیل محەمەد

٣- کاك رەزا ئەحمەد

٤- کاك ئاسۆ عومەر.. نوسەر



**کورشی گەورە**

**لەئەنجامی ئەم یەکگرتنە، فەرمانڕوایی ئێرانی کەوتە دەست**

| کوردی | فارسی | عەرەبی | تورکی |
|---|---|---|---|
| ساڵ | سال | عام | ییل |
| تیر | تیر | سهم | اوق |
| کەوان | کمان | قوس | یای |
| شمشێر | شمشیر | سیف | قلیج |
| [illegible] | تبر | [illegible] | [illegible] |
| سپەر | سپر | ترس | قلقان |
| گەنم | گندم | قمح | بغدای |
| جۆ | جو | شعیر | آرپە |
| شیر | شیر | حلیب | سوت |
| ماست | ماست | لبن | یوغورت |
| ڕۆن | روغن | دهن | یاغ |
| دۆ | دوغ | مخیض | آیران |
| سەر | سر | رأس | باش |
| دەس | دست | ید | ال |
| پێ | پا | رجل | آیاق |

| کوردی | فارسی | عەرەبی | تورکی |
|---|---|---|---|
| ئاو | آب | ماء | صو |
| نان | نان | خبز | [illegible] |
| گۆشت | گوشت | لحم | ئەت |
| ژەن | زن | أنثى | قز |
| ئاسمان | آسمان | سماء | گۆك |
| ئاسیاو | آسیاب | طاحون | دگرمان |
| باران | باران | مطر | یغمور |
| با | باد | ریح | یل |
| سەرما | سرما | برد | صاووق |
| گەرما | گرما | حر | [illegible] |
| تاوستان هاوین | تابستان | صیف | یاز |
| زستان | زمستان | شتاء | قیش |
| شەو | شب | لیل | گیجە |
| ڕۆژ | روز | یوم | گون |
| مانگ | ماه | شهر | آی |

ئەمە خشتەی قوڵەتێکی - کوردی ، فارسی ، عەرەبی ، تورکی

رقم الايداع في دار الكتب والوثائق
ببغداد ٦٤٢ لسنة ١٩٩١



**وێنەی وەرگێڕی ئەم کتێبە**

**عەبدول کەریمی حەمەی سەعید**

**١٩٥٣لەشاری پێنجوین لەدایك بووە .**

**١٩٩٢لە سلێمانی شەهید کراوە**

من ئەمەوێ ڕاستی دەربارەی نەتەوەی کورد بنوسم ، ئەگەر خوێنەری بەڕێزی کورد یا هەر کەسێ تر شتێکی بەدڵ نەبوو نابێ گلەیی بکات چونکە من لێرەدا ئەمەوێ ( مێژوو ) بنووسم.
نامەوێت لە کەسێك یا هۆز و تیرەیەك بدوێم و بەشان و باهوییدا بێمە خوارەوە .
مێژوو مانای نووسینی بەسەرهاتەکەیە وەك خۆی -بێ لایەنگیری - مێژوو بۆیە ئەنوسرێت کە رۆڵەی ئەو گەلە سود لە چاکە و خراپەی رابوردوو وەرگرن تا جارێکی تر نەکەونە گۆمی هەڵەوە بخنکێن.
هیوادارم مێژوو ناوی چاکە و خراپەی کەس ون نەکات و مافی خۆی بداتێ.

مەردۆخ





لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و بڵاو کردنەوەی چوارچرا